# میدیای کوردی لە سەردەمی ئاسمانە کراوەکاندا

**عەبدولخالق ئیبراهیم**

**مامۆستای راگەیاندن ـ زانکۆی پۆلیتەکنیکی هەولێر**

# میدیای کوردی لە سەردەمی ئاسمانە کراوەکاندا

## دەروازەیەك بۆ ناساندنی ڕۆڵ و ئامرازەکانی تەکنەلۆژیای ژمارەیی و میدیای نوێ



**هەولێر - ٢٠١٤**

خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

## ● میدیای کوردی لە سەردەمی ئاسمانە کراوەکاندا:

### دەروازەیەك بۆ ناساندنی ڕۆڵ و ئامرازەکانی تەکنەلۆژیای ژمارەیی و میدیای نوێ

● نووسینی: عەبدولخالق ئیبراهیم

● پێداچوونەوە: د. دلێر ئەحمەد ـ ئەرسەلان ڕەحمان

● **نەخشەسازی ناوەوە: دیاکۆ ڕێدار جەعفەر**

● بەرگ: ڕێمان

● نرخ: (٣٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١٤

● تیراژ:٧٥٠ دانە

● چاپخانە: موکریانی (هەولێر)

● **لە بەڕێوەبەراتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (١٢٧) ساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨١٥)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

## پێشەکی:

پێشکەوتنی خێرا و هەمەلایەنەی ئامرازەکانی میدیا و پەیوەندیکردن زەمینەی ئەوەی لەبارکرد ئەو ئامرازانە توانای گوزارشتکردنیان هەبێت لە رۆح و سیمای دونیای نوێ.

تەکنەلۆژیای ژمارەیی بە پێکهاتە فرەوانەکەیەوە بووە یەکێك لە کەرەستەکانی جیهانگەرایی، جیهانی کرد بە گوندێکی بچووك و بگرە کردی بە ماڵێکی شوشەیی، هیچ سوچ و گۆشەیەکی شاراوە نیە لەوانی دیکە، بەربەستەکانی سنور و رێگرە شوێن کاتیەکانی بە رادەیەکی زۆر کاڵکردەوە.

میدیای نوێ هەر شۆڕشێك نەبوو لە بواری تەکنەلۆژیادا، بەڵکو گۆڕانێکی بنەڕەتی هێنا بەسەر پێکهاتە و فەزای گشتی پرۆسەی پەیوەندیکردن لە نێرەر و وەرگرەوە تا دەگاتە پەیام و فیدباکیشەوە، بە رادەیەك وەرگر لە پرۆسەی پەیوەندیکردندا وەرگرێکی نەرێنی نیە، بە تەنها ئەرکی وەرگرتن و پێشوازیکردن بێت لە ناوەڕۆکی پەیامی نێرەر، بەڵکو لەو پرۆسەیەدا کارلێکردن لە ئاستێکی بەرزدایە، وەرگر دەرفەتی ئەوەی لە بەردەمدایە بە شێوەی جیاجیا بۆچوونی هەبێت لەبارەیانەوە.

میدیای نوێ دەرفەتی ئەوەی رەخساندوە وەرگرێکی ئاسایی بەشداری لە بەرهەمهێنانی زانیاری بکات، بەگوێرەی ئەو توانا و لێهاتووییانەی هەیەتی هەواڵ و زانیاری لەبارەی رووداوە گرنگەکانی دەوروبەری بگەیەنێت، بەمەش خەریکە لەمجۆرە میدیاییە چەمکی هاووڵاتی رۆژنامەوان سەرهەڵدەدات، ئیدی بەرهەمهێنانی زانیاری و بابەتە رۆژنامەوانییەکان تەنها کاری رۆژنامەوان نیە وەك لە میدیای کلاسیکیدا دەبینرێت، ئەگەرچی لە رووی رێکخراوەیی و بەردەوامی و ئاستی پیشەیی بوون جیاوازییەکی بەرچاو هەیە لە نێوان ئەو دوو ئاراستەیەدا.

میدیای نویٚ بووە کەرەستەیەکی کاریگەر بە دەست ئەوانەی بە دوای ئازادیی ڕادەربرین و ئازادیی ڕۆژنامەوانیدا دەگەڕێن و دەیانویست دوور لە چاوی سانسۆر و فشارە تەناهییەکانەوە ڕاستییەکان بگەیەنن و ڕەخنە لەو واقیعە سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئابووریە نەخوازراوانە بگرن گیرۆدەن بە دەستییەوە و هیچ دەلاقەیەکیش لە بەردەمیاندا نەماوە گوزارشتی پێبکەن و دەنگی ناڕەزایی و خواستی گۆڕانکارییان بە دەسەڵاتی سیاسی بگەیەنێت.

میدیای نویٚ بووە هەوێنی گۆڕانکارییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گەورە، بووە ناوەندێکی کارای دروستکردن و بزواندن و ئاڕاستەکردنی ڕای گشتی و لە زۆر وڵاتی وەك تونس و میسر و یەمەن و سوریا خاڵی یەکەمی دەست پێکردنی شۆڕشێکی جەماوەری بەرفرەوانی بیٚ وێنە بوو، ئەمە لە کاتێکدا بوو ڕژێمە تۆتالیتارییەکان بەهۆی ڕاوەدوونانە تەناهی و هەواڵگری و چەواشەکارییەکانی میدیای ڕەسمی، تەواوی جومگە سیاسی و ڕووناکبیرییەکانی وەك زانکۆ، حیزب، میدیا، مزگەوت، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی خاڵی کردبوو لە ماناکانیان یان لانیکەم پەڕوباڵی کردبوون تا نەبن بە مایەی هەڕەشە بۆی.

لێرەدا گرنگیدان بە تەکنەلۆژیای ژمارەیی و میدیای نویٚ و قسەکردن لەسەری لە چوارچێوەی کتێبێك دا بە زمانی کوردی و نوێترین تیڕوانینە تیۆرییەکان لەوبارەیەوە بخاتە ڕوو، هەم پێویستییەکی ئەکادیمی و هەم پیشەیشە بۆ قوتابیانی بەشەکانی ڕاگەیاندن لە پەیمانگە و زانکۆکان لە لایەك و ئەو ڕۆژنامەوانانەش کە دەیانەویٚ لەوبارەیەوە زانیاری زیاتریان دەستبکەویٚ.

میدیای ئەلیکترۆنی بە شێوەیەکی گشتی و میدیای نویٚ بە تایبەتی بۆتە ئەو ئامرازە گرنگ و پڕ بایەخەی جومگە و کایەکانی کۆمەڵگە ناتوانن لە خزمەتگوزارییەکان و سوودە زۆرەکانی بێنیاز بن نە حکومەتەکان، نە حیزبە سیاسییەکان، نە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، کۆمپانیا و ناوەندە بازرگانی و ئابووریەکان، میدیاکان بوونەتە ئاوێنەیەك هەموو ئەمانە بەشێك لە سوود و بەرژەوەندییەکانی خۆیانی تێدا دەبینێتەوە، لەمە گرنگتر ئەوەیە میدیاکان بوونەتە پردێك بۆ بەیەکگەیاندنی ڕوانین و داوای هەریەك لەو جومگانە بەوانی دیکە و لەبارکردنی زەمینەیەکی گونجاو بۆ گفتوگۆ و کارلێکردنی چەند لایەنە، هەر بۆیە

شارەزایانی بواری کومیونیکەیشن بەوە وەسفی میدیا دەکەن هاوشێوەی خوێنی جەستە، خۆراك و ئۆکسجین لە دڵەوە دەگەیەنێتە تەواوی ئەندامەکانی جەستە.

بە هاتنی میدیای نوێ تاك بوو بە چەقی ڕووداو و گۆڕانکارییەکان، جاران بەهۆی ئەو شورە کۆنکریتیانەی رژێمە سیاسییە ستەمکارەکان دروستییان کردبوو بەدەوری ئازادیی ڕۆژنامەوانی و ئازادیی ڕادەربریندا، هیچ مەودا و دەلاقەیەك نەما بوو لە بەردەم تاك تا وەکو دەنگی خۆی بگەیەنێتە ئەوانی دیکە، بەڵام لە ئێستادا ئەو مۆتەکە و سانسۆرە سیاسی و ئیداری و تەناهییانە تێکشکان لە بەرامبەر تایبەتمەندیی و خزمەتگوزارییەکانی میدیای نوێ، لە میدیای نوێ تاك بوو بە کارەکتەری سەرەکی و هەر خۆی ڕووداوەکان دروست دەکا و هەر خۆشی دەبێتە ناوەندی گواستنەوە و گەیاندنی ڕووداوەکان، میدیای نوێ بوو بەو ناوەندەی لێوەیەوە بزاڤە جەماوەری و مەدەنی و سیاسییەکان ڕێك دەخران و زەنگی هەنگاوە بەراییەکانی گۆڕانکاری لێدەدا، ئەو هەواڵ و ڕووداوانەی دەکەوتنەبەر مقەستی سانسۆرە جۆربەجۆرەکان و لەسەر ڕووپەڕی ڕۆژنامە و شاشەی تەلەفزیۆنەکان ڕووناکیان نەدەبینی، هەر ئەو ڕۆژە لە میدیای نوێ و تۆڕە کۆمەڵاتییەکان بە تەواوی وردەکاری و زانیارییەکانییەوە بڵاودەکرانەوە، لەبەر هەموو ئەمانە میدیای نوێ بوو بەپێویستییەکی حاشاهەڵنەگر و تەنانەت میدیا کلاسیکییەکانیشی ناچار کرد دان بەو تایبەتمەندی و خزمەتگوزاریانەی بنێت و سوودیان لێوەربگرێت.

بۆ هەر سەرنج و تیبینیەکیش سەبارەت بەناوەرۆکی ئەم کتێبە لاتان دروستدەبێت، بوسوپاسەوە لەرێگەی ئەم ئیمێلانەوە پێشوازی لە رەخنە و پێشنیارەکانتان دەکەم و دەیخەینە سەرچاوان و سوپاسی هاوکاریتان دەکەم :

- bakhtawar78@yahoo.com
- abdulkhaqebrahim@gmail.com

**عەبدولخالق ئیبراهیم**

**هەولێر ٢٠١٤/٢/٦**

# بەشی یەکەم

## تەکنەلۆژیای ژمارەیی

به درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی چەندەها شۆڕش هاتوونەتەئارا، شۆڕشی پیشەسازی، تەکنەلۆژی و مەعریفی، لە ئێستاشدا لە بەردەم شۆڕشێکی دیکەداین ئەویش شۆڕشی تەکنەلۆژیای ژمارەییە ك لە تۆڕەکانی پەیوەندیکردن و ئینتەرنێت و ئەنترانێتدا.

شۆڕشی ژمارەیی خەریکە هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە، زانیاری ژمارەیی گشت سوچ و گۆشەیەکی ژیانی مرۆڤ داگیردەکات، وەك دەرەنجامی ئەو شۆڕشە ژمارەییەش پرۆسەی خوێندن و پەروەردە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، شێوە و ئامانجی دامەزراوە فێرکارییەکان شێواز و ئامرازی تازە بەکاردەهێنن لە پێگەیاندنی تاکەکاندا تاوەکو توانای خۆگونجاندن و **وەلامدانەوەی** پێداویستی و پێشکەوتنەکانی ئەم سەردەمەیان هەبێت، ئەمەش بۆتە ئامانجێکی سەرەکی و هەولدان بۆ گەشەدان بە کارامەییەکانی بیرکردنەوە لە نێو توێژی خوێندەوار و فێرخوازان لە پێناو بەشداربوون لەو پێشکەوتنە خێرا و سەرسوڕهێنەرانە.

پێکهاتە سەرەکییەکانی شۆڕشی ژمارەیی:

١. ژێرخان (Infrastructure) و بریتییە لە:

- تۆڕی پەیوەندییە بە تەل و بێتەلەکان.
- Hardware

- مانگە دەستکردەکان.
- رەگەزی مرۆیی.
- خزمەتگوزارییەکانی ئینتەرنێت و ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکان.

**٢.** پرۆسەی بازرگانییە ئەلیکترۆنییەکان (Electronic BusinessProcessing).

## تایبەتمەندییەکانی تەکنەلۆژیای ژمارەیی

تەکنەلۆژیای ژمارەیی چەند تایبەتمەندییەکی هەیە جیایدەکاتەوە لە ئامرازە تەکنەلۆژییەکانی دیکە لەوانە:

- ژمارەیەکی زۆری سەرچاوەی زانیاری خستۆتە بەردەست بۆ نموونە کتێبی ئەلیکترۆنی نووسراو و دەنگی، کتێبخانە ژمارەییەکان و کارگە ئەلیکترۆنییەکان.
- گەشە بە بیرکردنەوەی رەخنەگرانە دەدات لای ئەو خوێندەوارانەی بیرورا و سەرچاوە زانستی و زانیارییەکان لە رێگەی ئینتەرنێت وەردەگرن، هەروەك بەرپرسیارییەتییەکی خودی بۆ فێربوون لای ئەو کەسانە گەشەپێدەدات.
- کاردەکات بۆ برەودان بە کارامەییەکانی فێربوونی خودی و هانمان دەدات بۆ سەربەخۆیی و پشتبەستن بە خۆمان لە گەڕان بە دوای مەعریفە و دەستخستنی سەرچاوە جیاوازەکانی فێربوون.
- پاشەکەوتکردنی کات و کۆششێکی زۆر لە پرۆسەی فێربوون و چالاکییەکانی.
- ئاسانکردنی گواستنەوە لە شوێنێك بۆ شوێنێکی دیکە لە خێراترین کاتدا، بەمەش توانای پەیوەندی لە نێوان تاکەکان لە کات و شوێنە جیاوازەکان فرەوانتر دەکات.
- ئاسانکردنی هەڵگرتن و خەزنکردن و دووبارە بەکارهێنانەوەی بەبێ بوونی هیچ بەربەستێك.
- گونجانی لەگەڵ بوارە زانستییە جیاوازەکانی وەك پزیشکی و پیشەسازی و ئابووری و بازرگانی.
- ئاسانی ئاڵوگۆڕکردن و بڵاوبوونەوە و خێرا چارەسەرکردنی زانیارییەکان، لەگەڵ توانای گۆڕینی لە شێوەیەك بۆ شێوەیەکی دیکە.

- یاریدەدەربووە بۆ ئەوەی ژینگەی فێرکردنی زیاتر فەراهەمبێت وەك زانكۆ و كۆلیژە گریمانەییەكان یاخود ئەلیكترۆنییەكان.
- فەراهەمكردنی ئامرازەكانی پەیوەندیكردنی هاوكات و ناهاوكات لە نێوان فێرخواز و فێركار، لە نێوان فێرخوازەكان خۆشیاندا.
- فەراهەمكردنی دەرفەتی ئاڵوگۆڕكردنی ڕاوبۆچوون و ئەزموونەكان لە نێوان شارەزا و پسپۆڕان لە وڵاتە جیاوازەكان، وادەكات مەعریفە لە نوێبوونەوە و پێشووەچوونی بەردەوامدا بێت.
- یاریدەدەربووە بۆ چارەسەركردنی هەندێ گرفتی دامەزراوە فێركارییەكان لەوانە:
- كەمی باڵەخانەی خوێندن، بەهۆی فەراهەمكردنی دامەزراوەی فێركاری گریمانەیی (ئەلیكترۆنی) بەبێ بوونی دیوار و باڵەخانە.
- چارەسەری ئەو كەموكوڕیانەی كردوە لە تاقیگە و كارگەكان هەیە بە فەراهەمكردنی كارگەی ئەلیكترۆنی گریمانەیی فێرخوازان دەتوانن سوودی لێوەرگرن.
- چارەسەری كەمی فێر كاردەكات بە ئامادەكردنی بەرنامەی فێركردنی جەماوەری.
- چارەسەری كێشەی قەرەباڵغی ناو هۆڵەكانی خوێندن دەكات و ڕێگەی خوێندن لە دوورەوەی فەراهەمكردوە.

### مانگە دەستكردەكان

زاراوەی مانگ لە ڕووی جوگرافییەوە مەبەست لێی ئەو تەنە ئاسمانییە بەدەوری تەنێكی ئاسمانی گەورەتر لە خۆی دەسوڕێتەوە، سەرباری مانگە سروشتییەكان یەكێك لە بەرهەمەكانی تەكنەلۆژیای نوێ بریتییە لە مانگە دەستكردەكان (Satellite) بۆ مەبەستی هەواڵگری، زانستی و پەیوەندیكردن بەكاردێت.

مانگی دەستكرد ئەو كەشتیە ئاسمانیەیە بۆ مەبەستێكی دیاریكراو لە ئاسماندا مەلەدەكات، هەندێكیان بۆ خزمەتگوزارییەكانی پەیوەندیكردن وەك مانگی ( Nile sat)، هەندێكیشیان لە توێژینەوەی زانستی سوودی لێوەردەگیرێ وەك (Goes)، بەشێكیان بۆ دۆزینەوە و دەستنیشانكردن لە دوورەوە بەكاردێت وەك (Kit sat)، ئەركە

ئاسمانییەکان بە شێوەیەکی گشتی بۆ سێ پێکهاتەی سەرەکی دابەشدەبێت ئەوانیش: (مانگی دەستکرد، موشەکی هاویشتن (**صاروخ الأطلاق**)، وێستگەی زەمەنی بۆ وەرگرتنی زانیاری یان پەیوەندییەکان لە مانگی دەستکردەوە).

هەرچی ئەو موشەکەشە مانگە دەستکردەکانی پێ دەهاوێژرێ بۆ ئاسمان چەند جۆرێکی دیاریکراو هەن بۆ هەڵگرتنی مانگی دەستکرد و هەڵگرتنی لە زەویەوە بۆ خولگەی مانگی دەستکرد لە دەوری زەوی پاشان لێی جیادەبێتەوە و بەجێیدەهێڵێت تاوەکو لە دەوری زەوی بسوڕێتەوە، ئەم موشەکانە لە چەند وێستگەیەکی هاویشتن دەردەچن، لەسەرانسەری جیهان بوونیان هەیە و ژمارەیان (١٩) وێستگەیە، لە بەناوبانگترین ئەو موشەکانە بۆ هاویشتنی مانگە دەستکردەکان بەکاردێت مانگی (ئاریان)ی فەرەنسی، (کۆزمۆس)ی ڕوسی یە.

مانگە دەستکردەکان دوای جیابوونەوەیان لە موشەکی هاویشتن بێ ئەوەی بکەونە خوارەوە بە هۆی هێزی کێشکردنی نێوانیان بە دەوری زەویدا دەسوڕێنەوە، ئەم مانگانە بە خێراییەکی گونجاو بەدەوری زەویدا جوڵەدەکەن، تێکڕای ئەو جوڵە خێرایەش بە شێوەیەکی پێچەوانە گۆڕانی بەسەردادێت بەگوێرەی دوورکەوتنەوەی مانگەکە لە سەنتەری زەوی، بۆ نموونە ئەگەر ویسترا مانگێکی دەستکرد هەڵبدرێ لە خولگەیەکدا (٥٠٠) کم لە ڕووی زەوی بەرزبێت ئەوا پێویستدەکات خێرایی مانگە دەستکردەکە (٧،٦) کم بێت لە چرکەیەکدا، بەڵام ئەگەر ویسترا مانگێك هەڵبدری (١٠٠) کم بەرز بێت لە ڕووی زەوی پێویست بە (٧،٣٥)کم دەکات لە چرکەیەکدا، کەچی دەبینین ئەم خێراییە زیاتر دەبێت لە خێرایی خولانەوەی زەوی ئەگەر بەرزی خولگەی مانگەکە لە زەوی کەمتربێت لە (٣٦٠٠٠) کم، بەڵام ئەگەر زیاتر بوو یان نزیکی بوو ئەوا مانگە دەستکردەکە بە هەمان خێرایی جوڵانەوەی زەوی جوڵەدەکات، لەبەرئەوە بە جێگیری دەمێنێتەوە لە خاڵێکی دیاریکراو لەسەر ڕووی زەوی.

وا باوە ئەو مانگە دەستکردانەی بە مەبەستی پەیوەندییەکان بەکاردێن، لەو بەرزیە دابن بە هەمان شێوەی مانگە دەستکردەکان دەکرێ پارچە بەردێك بە دەوری زەویدا بسوڕێتەوە ئەگەر بە خێرایی(٧،٩) کم لە چرکەیەکدا هەڵبدرێ.

**بەکارهێنانەکانی مانگە دەستکردەکان**

١. کۆکردنەوی زانیاری لەسەر زەوی و خۆر و گواستنەوەی بۆ زەوی.
٢. لێکۆڵینەوە لە باری کەشوهەوا.
٣. پەیوەندییە بە تەل و بێتەلەکان.
٤. بۆ مەبەستی سەربازی و وێنەگرتنی شوێنەکانی دوژمن.

**سەرهەڵدانی مانگە دەستکردەکان**

لە ساڵی (١٩٩٣) ڕوسەکان سەلماندیان دەکرێ تەنێك بە خێرایی هەڵبدرێ و لە خولگەی دەرەوەی زەوی لە ئاسمان بسوڕێتەوە، لە ساڵی (١٩٤٥) نووسەرێکی بەریتانی لە بواری خەیاڵی زانستی لە وتارێکی بە ناوی (ساڵی بێتەل) باسی لەوەکردبوو دەکرێ مانگی دەستکردیش هەبێ، تێیدا باسی لە چۆنیەتی هەڵدان و سوڕانەوەی لە دەوری زەوی کردبوو، ئاماژەی بە بوارەکانی بەکارهێنان و سوود لێوەرگرتنی دابوو، بە تایبەتی لە بواری پەیوەندییەکاندا.

لە ساڵی (١٩٤٨) زاناکان ڕاستی ئەم بۆچوون و بیردۆزەیان سەلماندبوو بە گریمانەیەکی واقیعی، دوای زنجیرەیەك گفتوگۆی تێروتەسەل سەبارەت بە ئەگەر و زەمینەکانی بەدیهاتنی دەسکەوتێکی لەم چەشنە دەستیانکرد بە هەنگاوە سەرەتاییەکانی گۆڕینی ئەم خەونە بۆ ڕاستی، ئیدی مەسەلەی هەڵدانی مانگە دەستکردەکان بووە مەسەلەی کات بە تایبەتی دوای چارەسەرکردنی کێشەی ئەو موشەکانەی دەتوانن مانگە دەستکردەکان هەڵبگرن بۆ ئاسمان، لەسەر دەستی زانا ئەڵمانییەکان توانیان نەوەی دووەمی موشەکی (V1) پەرەپێبدەن، ئەمە لە توانای موشەکی (V1)دا بوو ئەم کارە ئەنجام بدات، لە ساڵی (١٩٥٧) ڕوسەکان توانیان یەکەم مانگی دەستکرد ڕەوانەی بۆشایی ئاسمان بکەن بە ناوی (سبوتنیك)، دوای ئەویش ژمارەیەك مانگی دەستکرد هەڵدرا، ئیدی بۆشایی ئاسمانیش بووە گۆڕەپانێکی دیکەی کێبڕکێ لە نێوان یەکێتی سۆڤیەتی جاران و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەوسا بە شەڕی سارد ناودەبرا، لە ساڵی (١٩٦٢) ئەمەریکیەکان سەرکەوتوو بوون لە هەڵدانی

یەکەم مانگی دەستکرد بە ناوی (سکور) بەکارهێنرا لە گواستنەوەی پەخشی تەلەفزیۆنی لە نێوان ئەمەریکا و ئەوروپا، بەمەش زەنگی سەرەتای قۆناغێکی نوێ لە شۆڕشی جیهانی پەیوەندییەکان لێدرا، دوای ئەوە ژمارەیەکی زیاتر بە مەبەستی جیاواز لە مانگی دەستکرد هەڵدرا.

## پێکهاتەکانی مانگی دەستکرد

مانگی دەستکرد لە کۆمەڵێك کەرەستە و ئامێری جیاواز پێکدێت، پێویستی پێیان دەبێت لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی، چەند پێکهاتەیەکی سەرەکی هەیە لە هەموو مانگێکدا ئەوانیش:

- باڵی خانە خۆرییەکان **(اجنحة الخلايا الشمسية)** کە وزەی پێویست دەدات بە مانگەکە بۆ کارکردن.
- پاتریەکی هایدرۆجینی یەدەگ یان نیکل یان کادیۆم بۆ حاڵەتی نائاسایی یان لە کاتی خۆرگیراندا.
- ئامێری پەیوەندیکردنی مانگەکان بە وێستگەکانی زەوی و پەخشکردنی وێنە و داتا، وەرگرتنی ڕێنماییەکان.
- کامێرا ژمارەییە زۆر وردەکان بە تایبەت لە مانگە سیخورییەکان، کەشوهەوا و توێژینەوە زانستییەکان، وردی ئەم کامێرایە بە ڕادەیەکە دەتوانێ وێنەی ئۆتۆمبێلێکی جولاو بە هەموو وردەکاریەکانیەوە لە سەرزەوی بگرێت.
- گوێزەرەوەکان وەك ئەوەی لە مانگە دەستکردەکانی پەخشی کەناڵە ئاسمانیەکان و پەیوەندییەکاندا هەیە، لەم مانگانەدا کەناڵە ئاسمانی و تەلەفزیۆنیەکان هەڵدەگیرێن، ئەو مانگانە بەوە لە مانگە دەستکردەکانی دیکە جیادەکرێنەوە بە بوونی ئامێری هەوایی زۆر گەورە کە ڕێگە بە گواستنەوەی وێنە و داتا و پەیوەندییەکانی دەدات لەسەر ڕووی زەوی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە.

هەموو ئەمانەش لە پێکهاتەیەکی دەرەکیدان بەناوی (BUS) کە بەرگی دەرەکی مانگە دەستکردەکە یان پەیکەری سەرەکیەکەی کۆمەڵێك ئامێر، توێژاڵی ئەلیکترۆنی، کۆمپیوتەری تایبەت، بەرهەمهێنی وزە و کەرەستەی پەیوەندیکردن لە خۆیدەگرێت.

## مانگە دەستکردەکان و خولگەکانیان

خولگە ئەو شوێنەیە مانگی دەستکرد لە بۆشایی ئاسمان لە دەوری زەوی لێی جێگیر دەبێت، خولگەی هەر مانگێك لەوانی دیکە بەگوێرەی سروشتی مانگەکە و ئەرکەکانی جیاوازە، چەند خولگەیەك هەیە مانگە دەستکردەکان لێیەوە بە دەوری زەوی دەسوڕێنەوە لەوانە:

## خولگەی جەمسەری (Polar Orbiting)

جۆرێکە لە خولگەکانی (LEO)، تێیدا مانگی دەستکرد لە شوێنێکی نزیك لە زەوی جێگیر دەبێت وشێوەی سوڕانەوەی لە باکوور بۆ باشوور دەبێت و بە شێوەیەك کاردەکات تاوەکو ئەو پانتاییەی لەسەر زەوی داوای لێکراوە داپۆشێت.

## مانگەکانی خولگەی جەمسەری

ئەم خولگەیە یارمەتی مانگە دەستکردەکان دەدات لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ڕووپێوی گۆی زەوی بکەن و وێنە و داتاکانیان بە وردیەکی زۆرەوە تۆماربکەن، هەر بۆیە مانگی تایبەت لە توێژینەوە زانستییەکان بەکاردێنن بە تایبەت لە بواری ژینگە، کەشوهەوا، لێکۆڵینەوەی بیابان، ئاوی ژێر زەوی و گەڕان بە دوای نەوت و گازدا.

## خولگەی نزم – لیو (Orbit LEO –Low Earth)

کاتێك مانگێکی دەستکرد لە خولگەیەکی شێوە بازنەیی نزم و نزیك لە ڕووی زەوی دەسوڕێتەوە، ئەم خولگەیە پێیدەوترێت لیو (LEO) یان نزم، کە (٢٠٠) تا(٥٠٠) میل لە ڕووی زەوی دوورە، بەهۆی نزیکی لە ڕووی زەویەوە مانگە دەستکردەکانی ئەم خولگەیە بە خێراییەکی زۆر بە دەوری زەویدا دەسوڕێنەوە و بەرەو بەرگی زەوی بەهۆی هێزی کێشکردنی زەویەوە کەمەندکێشیان دەکات، خێرایی ئەم مانگانە دەگاتە (٢٧)

هەزار و (٣٥٩) کیلۆمەتر لە کاتژمێرێکدا، مانگە دەستکردەکانی ئەم خولگەیە دەتوانن لە ماوەی (٩٠) خولەکدا بە دەوری زەوی بسوڕێنەوە.

## مانگەکانی ئەم خولگەیە

ئەم خولگەیە یارمەتی مانگەکان دەدات وێنەیەکی نزیکی پانتاییەکی بەرفرەوانی ڕووی زەوی بگرن سوودی لێوەردەگیرێ لە توێژینەوەی جوگرافیی، نەخشەی ڕووپێویی، کانزایی، سیستەمی هاتووچۆی ئاسمانی و دەریایی، زۆربەی مانگەکان مانگی زانستین.

## خولگەی هاوکات (Orbits Geostationary)

بە شێوەیەکی سەرەکی مانگە دەستکردەکان دابەشدەبن بۆ:

- مانگی دەستکردی پەیوەندییەکان بۆ گواستنەوەی زانیاری بەکاردێن.
- مانگی دەستکردی پەخشی ئاسمانی بۆ پەخشی کەناڵە تەلەفزیۆنی و ئێزگەییەکان.
- مانگی دەستکردی چاوەدێریکردن و کۆکردنەوەی زانیاری لەبارەی بەرگی زەوی و پێشبینییەکانی کەشوهەوا.
- مانگی دەستکردی بواری سەربازی و هەواڵگری بۆ مەبەستی تەناهی و بەرگری.
- مانگی دەستکردی بواری زانستی لە تاقیکردنەوە و زانستە جیاوازەکان بەکاردێن.

## سیستەمی کارکردنی مانگە دەستکردەکان

مانگی دەستکرد لە کۆمەڵێك سیستەمی سەرەکی پێکدێت:

- سیستەمی بارهەڵگری ئاسمانی: ئەم سیستەمە بەرپرسە لە جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە سەرەکییەی مانگە دەستکردەکەی بۆ هەڵدراوە، ڕەنگە ئەو سیستەمە ئامێرێکی وێنەگرتن یان سیستەمی پەیوەندییەکان بێت بۆ پێشوازیکردن لەو پەیوەندییانەی لە زەویەوە ڕەوانەدەکرێن و دووبارە دەنێردرێنەوە بۆ شوێنی مەبەست.

- سیستەمی وزە: ئەم سیستەمە بەرپرسە لە دابینکردنی وزە بۆ مانگەکە و کۆنترۆڵکردنی چۆنیەتی دابەشکردنی ئەو وزەیەش بەسەر سیستەمە جیاوازەکان، مانگی دەستکرد لە کارکردنیدا پشت بە وزەی خۆر دەبەستێت، خانەی خۆری بەکاردێت بۆ گۆڕینی وزەی خۆر بۆ وزەی کارەبایی، هەندێك لەو وزەیە ڕاستەوخۆ بەکاردێنێت و هەندێکی دیکەش پاشەکەوت دەکات لە پاتری تایبەت دواتر لەو کاتانەی وزەی خۆر بەردەست نابێت و ئەوکاتەش مانگی دەستکرد لەبەر سێبەری زەوی خۆر بەدیارناکەوی سوودی لێوەردەگرێت.
- سیستەمی کۆنترۆڵکردنی ئاڕاستەی مانگی دەستکرد: لە ڕێگەی ئەم سیستەمە مانگی دەستکرد ڕووبەڕووی کارتێکەرە دەرەکیەکان دەبێت و ئاڕاستەکەی پێدەگۆڕێت، بێگومان پارێزگاریکردن لە ئاڕاستەی مانگەکە بە جۆرێك بەردەوام ڕوو لە زەوی بێت کارێکی پێویستە لە پێناو ئەنجامدانی پرۆسەی پەیوەندیکردن و گواستنەوەی زانیارییەکان بۆ زەوی بە شێوەیەکی دروست.
- سیستەمی پەیوەندییەکان: بەرپرسە لە گەیاندنی پرۆسەی پەیوەندییەکان بە وێستگەی زەوی لە کرۆکی مانگە دەستکردەکان و لە ڕێگەی ئەو ویستگانەی زەوی فەرمان و ڕێنمایی بۆ مانگەکە ڕەوانەدەکرێ و لە ڕێگەی ئەم سیستەمە پێشوازی لێدەکرێ، هەروەك مانگی زانیاری تایبەت بە ڕەوشی مانگە دەستکردەکە و ئاستی کارکردنی هەریەك لە سیستەمەکان ئاڕاستەی وێستگەکانی زەوی دەکات.
- سیستەمی پاڵنان: ئەم سیستەمە ڕەنگە لە هەندێ مانگی دەستکردی بچووکدا نەبێت، بەهۆی پێویست نەبوونی، بەڵام لەو مانگە دەستکردانەی ئەم سیستەمە لەخۆیدەگرێ بەکاردێت بۆ گواستنەوەی مانگەکە لە خولگەکەیەوە بۆ یەکێکی دیکە یان ڕاستکردنەوەی شوێنی مانگەکە لە ناو خولگەکەیدا.
- مانگە دەستکردەکان لە قەبارەدا لە یەك جیاوازن، کێشەکەی لە مانگەکانی پەیوەندیکردندا دەگاتە سێ تەن، مانگی دۆزینەوە و هەستکردن لە دوورەوە کێشەکەی دەگاتە ٢٥٠کگم، لە مانگە دەستکردە ئەزمونیەکان لە چەند کیلۆگرامێك تێپەڕناکات، ئەوانەی مانگە دەستکردەکان دروستدەکەن زۆرجار کۆمپانیا تایبەتمەندەکان یان دامەزراوە زانستییەکان یاخود زانکۆکانن.

## وێستگە زەمینییەکان

ژمارەی وێستگە زەمینییەکان ڕۆژ بە ڕۆژ لە زیادبوونێکی خێرادایە، زۆرێك لەو وێستگانە سەحنێکی گەورەی پێوە بەستراوە تیرەکەی (٣٠م)ە.

ئەم سەحنە دەکرێ بە هەموو ئاڕاستەیەکدا جوڵەی پێ**بکرێ**، زۆربەی ئەو وێستگانە کاریان وەرگرتن و ناردنی هێما بێتەلەکانە لە گفتوگۆی تەلەفۆنی و دەنگ و ماددە تەلەفزیۆنی و ئێزگەییەکانی هەڵگرتوە.

وێستگە زەمینیەکان دوو جۆرن، جۆرێکیان بەکاردێت بۆ پەیوەندیکردن بە مانگە دەستکردەکە و ئاڵوگۆڕکردنی فەرمان و زانیارییەکانی تایبەت بە کاری مانگە دەستکردەکە، جۆری دووەم زانیاری و پەیوەندییە پێویستەکان بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکە ئاسمانییەکە وەردەگرێ.

## مانگە دەستکردەکان لە ململانێی وڵاتە زلهێزەکاندا

بەگوێرەی زانیارییەکانی ئاژانسی ناسا لەوەتەی ساڵی(١٩٥٧) ەوە نزیکەی (٦٠٠٠) مانگی دەستکرد ڕەوانەی ئاسمان کراوە، تائێستا لەو ژمارەیە (٣٠٠٠) یان لە کارکردندایە، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی سیستەمێکی گشتگیری نوێ بۆ دیاریکردنی شوێنەکان لەسەر زەوی ئەویش سیستەمی جیهانی دیاریکردنی شوێنە ( Global Positioning System) کە زیاتر بە ناوە کورتکراوەکەی ناوبانگی دەرکردوە بە (GPS) وەك زۆرێك لەو سیستەمە ئەلیکترۆنی و ژمارەییانەی لە (٣٠) ساڵی ڕابردوو سەرەتای هاتۆتەئارا، سیستەمی (GPS) لە ڕەحمی دەزگا سەربازی و هەواڵگریەکانی ئەمەریکا لەدایکبوو، بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە تۆڕیك لە مانگە دەستکردەکان دەبەستێت.

لە سەرەتادا وەك چەکێکی پێشکەوتووی نهێنی تەنها سوپای ئەمریکی بۆی هەبوو بەکاریبێنێت، وەك ئینتەرنێت لە تاقیگەکانی لێکۆڵینەوە پێشکەوتوەکانی پێنتاگۆن داهێنرا، ئەم سیستەمە بۆ ئاڕاستەکردنی موشەکە بالیستییەکان بەکارهێنرا بە تایبەت (تۆماهۆك) کە لەچەند جەنگێکی گەورەدا بەکارهات، لە (یوگوسلاڤیا) بەر لە

هەڵوەشانەوەی، لە عێراق لە ساڵی (١٩٩١) و (٢٠٠٣) لە سەردەمی سەرۆکایەتی (بیل کلینتۆن) سیستەمی (GPS) لە خزمەتگوزاریە نهێنیەکان بەکارهێنرا.

ژمارەی مۆبایل لە جیهان لە دوو بلیۆن و نیو تێپەڕیکردوە و دابەشبووە بەسەر ناوچە دوورە دەستەکان و شارە پێشکەوتوەکان لەیەك کاتدا، کۆمپانیا و تۆڕەکانی مۆبایل کۆششی زۆر دەکەن بۆ ئەوەی مۆبایل سیستەمی پەیوەندیکردن بە مانگە دەستکردەکان لە خۆیبگرێت بۆ دەستنیشانکردنی شوێنەکان لەسەر زەوی، لە ئێستادا زۆربەی مۆبایلە پێشکەوتوەکان ئەم تەکنەلۆژیایە لەخۆدەگرن.

دوو بلیۆن مرۆڤ لە پەیوەندی ڕاستەوخۆدان لەگەڵ مانگە دەستکردەکان دەتوانێ شوێنی جوڵەیان دیاری بکات بە دریژایی ڕۆژ، دوو بلیۆن و نیو پەیوەندی بە مانگی دەستکرد دەکەن بە مەبەستی جیاجیا و لە بەرامبەریشدا پارە دەدەن، ئەوە هەموو بازارەکە نیە، بەڵکو ئێستا کۆمپانیاکانی مۆبایل سەرگەرمی دروستکردنی سیستەمێکن بۆ ئاڕاستەکردنی ئۆتۆمبێل لە کاتی لێخورینی بۆ یارمەتیدانی لە ناسینەوە و گەیشتن بە ئامانجەکەی و خۆلادان لە شەقامە قەرەباڵغەکان.

لەسەر ئاستی جیهان نزیکەی(٥٢) بلیۆن ئۆتۆمبیل هەیە و ژمارەیەکی زۆری ئەم ئۆتۆمبێلانە لە ماوەی چەند ساڵێکی کەمی داهاتوودا پاڵێوراون بۆ سوودوەرگرتن لەم سیستەمە نوێیە.

ئەم سیستەمە بەرلەوەی لە خزمەتگوزارییە مەدەنیەکان **بەکاربهێنرێ**، بە شێوەیەکی چڕوپڕ لە موشەکە ستراتیژیەکان وەك (بیرشینگ)ی ئەمریکی و (توبول)ی ڕوسی و فڕۆکە هەوالگرییەکانی وەك (ئەواکس) و فڕۆکە جەنگیە تایبەتمەندەکان لە بواری ژاوەژاو دروستکردن لەسەر سیستەمی پەیوەندییەکان بەکارهێنراوە، لە خزمەتگوزارییە مەدەنیەکان هەر زوو سیستەمی (GPS) لە فڕۆکەخانە، فڕۆکە مەدەنی، بازرگانییەکان، کەشتیە دەریاییەکان و شەمەندەفەر بەکارهات، بەمە بازاڕێکی گەورە لەسەر ئاستی جیهان دروستبوو بە دەوری ئەم سیستەمە تەکنەلۆژیای مانگە دەستکردەکان دەخاتەبەردەستی هەموولایەك بۆ دۆزینەوە و دیاریکردنی ئەو شوێنانەی دەبن بە ڕووگە و ئامانجی مرۆڤ و گروپ و کۆمپانیاکان، ئەم سیستەمە بۆ بەگەڕخستنی پێویستی بە تۆڕێکی فرەوانی مانگە دەستکردەکانە لە بیست تا سی مانگی دەستکرد، ئەو مانگە دەستکردەکانە سەرچاوەی ململانێیەکی نەبڕاوەن لە نێوان

(٣) زلهێزی جیهانی، له ئێستادا ئەمەریکا پاڵپشتی له سیستەمی (GPS) دەکات، یەکێتی ئەوروپا سەرگەرمی بەکارهێنانی سیستەمێکی ڕکابەره به ناوی (گالیلۆ)، ڕوسەکان ئومێدێکی زۆریان چنیوه لەسەر سیستەمی (گلۆناس) بەڵێنی زۆر دراوه له وردەکاریدا له پێش سیستەمه ڕکابەرەکانی بداتەوه.

ململانێی ئەم هێزانه لەگەڵ هەڵدانی یەکەم مانگی دەستکرد دەستیپێکرد لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتی جاران له ساڵی (١٩٥٧) به ناوی (سبوتنیك)، لەوساوه ئەمەریکا تۆڕیکی دامەزراند بۆ چاوەدێریکردنی بۆشایی ئاسمان به ناوی تۆڕی ئەمریکی بۆ چاوەدێریکردنی بۆشایی ئاسمان (US Space Surveillance Network) (SSN)، ئەم تۆڕه سەر به (سەرکردایەتی ستراتیژی ئەمریکی)یه، چاوەدێری هەر تەنێك دەكات (١٠) سانتیمەتر زیاتر بێت، به درێژایی کارکردنی زیاتر له(٢٦) هەزار تەنی ئاسمانی دەستنیشانکردوه و چاوەدێری کردوه، بەگوێرەی ماڵپەڕی ئەلیکترۆنی تۆڕی ناوبراو له ئێستادا زەوی به زیاتر له (٨٠٠٠) تەنی ئاسمانی دەورەدراوه.

ژمارەی مانگه دەستکرده کاراکان (ئەمه بۆ جیاکردنەوەی لەوانەی تائێستا کارانەکراون) نزیکەی (٩٠٠) مانگ دەبێت، ئەم مانگانه چاوەدێری هەموو شتێك دەکەن لەسەر زەوی ڕوودەدەن، بۆ ڕوونکردنەوه نموونه بەم هەواڵه دێنینەوه له ماڵپەڕی مەعریفه (Marefa.Org) بڵاوکرایەوه، له هەواڵەکه هاتووه له بیابانی جەزائیر جۆرێکی دەگمەنی پڵنگی بیابانی دۆزرایەوه پێشتر گومان دەبرا له ناوچووبێت، بەڵام وەك له هەواڵەکه هاتووه، دوای ئەوەی له ڕێگەی ئەو مانگه دەستکردانەی بیابانی جەزائیر دادەپۆشن، له ڕێگەی (٣٠٠٠) کامێرا چاوەدێری ئەو ناوچه فرەوانه دەکەن، سیستەمی کارکردن و وێنەگرتنی ئەو کامێرانه به جۆرێکن هەر جوڵەیەك بەدیبکەن وێنەی دەگرن.

مانگه دەستکردەکان کاریان به شێوەیەکی سەرەکی بریتییه له گواستنەوەی پەخشی تەلەفزیۆنیی و پەیوەندییه تەلەفۆنییەکان، چاوەدێریکردنی ڕەوشی کەشوهەوا، دەریا، ئۆقیانوس، با، هاتووچۆ ئاسمانی، دەریایی وشکانییەکان، رەوی پۆلی باڵندە، ماسی، کۆچی به کۆمەڵی خەڵك، ئاژەڵ، چاوەدێری پلەی گەرما و پێکهاتەی بەرگی زەوی دەکات.

بەگوێرەی ماڵپەڕێکی ئەلیکترۆنی زانستی ئەمریکی سەر بە (یەکێتی زانایانی خاوەن بایەخ) ڕۆژانە(٨٠٠٠٠) چالاکی چاوەدێریکردنیان هەیە بۆ زەوی، ئەم چالاکیەش تەنها بریتی نیە لە وێنەی فۆتۆگرافی وەك ئەوەی لەسەر ماڵپەڕی (Google Earth) دەردەکەوێت بەڵکو شریتی وێنەیی و فیلمی درێژ دەگرێتەوە لە ڕێگەی ئەو کامێرایانەی بە تیشکی ژێرسوور کاردەکەن، هەروەها شریتی وێنەگرتنی جوڵەی شەپۆل و باو و هتد دەگرێتەوە، ئەم کارە ڕۆژانە هەشتا هەزار جار دووبارەدەبێتەوە. لێرەوە دەکرێ وێنای ئەو قەبارە گەورەیەی زانیاری و بەرژەوەندی و دزیکردنە بکەین لە مانگانەوە دەردەچێت، ئەمە ئاستی ململانێیەکەی لە نێوان ئەو زلهێزانە بەرفرەوانتر کردوە بۆ هەڵدانی مانگە دەستکردەکان.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا خاوەنی زۆرترین ڕێژەی مانگی دەستکردە هەزار مانگی دەستکردە، (١٣٠٠) مانگە دەستکردەکەی دیکە دابەشدەبێ بەسەر سێ کۆمارەکەی بوونە میراتگری یەکێتی سۆڤیەتی جاران ئەوانیش ( ڕوسیا، ئۆکرانیا، ئۆزبەکستان)، ژاپۆن (١٠٠)، چین (٥٠)، فەرەنسا (٤٠)، هیند (٣٠)، بەریتانیا (٢٥)، بەشی هەریەك لە ئوستورالیا و ئیسرائیل بە (٢٠) مانگ دەخەملێنرێت.

مانگە دەستکردەکان دابەشدەبن بۆ سێ خولگەی سەرەکی ئەوانیش خولگەی نزم لیو (٤٣) مانگی دەستکردی کارا، خولگەی مامناوەند – میو (٥٦) مانگ، خولگەی بەرز لیو (٤٠٠٠) مانگ.

## کۆمپانیا تایبەتمەندەکانی بواری مانگە دەستکردەکان

ژمارەی کۆمپانیا تایبەتمەندەکان لە بواری سەتەلایت و مانگە دەستکردەکان و پەیوەندییەکان نزیکەی (٤٠٠) کۆمپانیای جیهانیە، بەڵام دیارترین ئەو کۆمپانیایانە لە ڕووی سەرمایە و جۆرەوە بریتیین لە (ئیردیۆم، گلۆبال ستار، ئیلۆ –سورەیا).

## پەخشی ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی مانگە دەستکردەکان ( Satellite Direct Broadcast)

لە ساڵی (١٩٤٥) ئەفسەرێك لە هێزی ئاسمانی شاهانەی بەریتانی وتارێکی بڵاوکردەوە لە گۆڤاری (جیهانی بێتەل) (Wireless World) پێشنیاری ئەوەی کردبوو

هەڵدانی مانگی دەستکرد و جێگیرکردنی لە دووری (٢٢٣٠٠) لە هێڵی ناوەڕاست دەبێتە کارێکی نموونەیی بۆ پەخشکردنی بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان، بەمەش دەکرێ سێیەکی پانتایی گۆی زەوی لە ڕێگەی پەخشی تەلەفزیۆنییەوە داپۆشێت، بەمە دەکرێ ئەو خەرجیە زۆرەی لە پەیوەندییەکان و پەخشی ماوە دوور دەکرێ کەمبکرێتەوە.

چەند ساڵێك تێپەڕی بێ ئەوەی هیچ کەس دەستپێشخەری بکات بۆ کارکردن لەسەر ئەو پێشنیارە، بەڵام دوای ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت یەکەم موشەکی ڕەوانەی ئاسمان کرد (Sputnik) لە ساڵی (١٩٥٧) قۆناغێکی نوێ لە ڕکابەری دروستبوو لە نێوان یەکێتی سۆڤیەت و ئەمەریکا بۆ داگیرکردنی بۆشایی ئاسمان، ئەمەریکا لە ساڵی (١٩٧٤) یەکەم مانگی دەستکردی بەناوی (Westar) ڕەوانەی بۆشایی ئاسمان کرد، لە کۆتایی ساڵانی حەفتای سەدەی ڕابردوو ئەرکی مانگە دەستکردەکان تەنها پەخشی تەلەفزیۆنی نەبوو، بەڵکو بۆ دەستەبەرکردنی گفتوگۆ تەلەفۆنییە دوور مەوداکان و چەندین ئەرکی دیکەش بوو.

بەو پێیە مانگە دەستکردەکان لەبەرچاوی خەڵکەوە دوورن، لەبەرئەوە ڕۆڵ و بایەخە زۆرەکەی لە شۆڕشی پەیوەندییەکان هەقی خۆی پێنەدراوە، وەك ئەوەی لەگەڵ کۆمپیوتەر ڕوویدا، مانگە دەستکردەکان چەندین کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر پێشکەوتنەکان هەبوو.

- دابەزینی خەرجی پەیوەندییە تەلەفۆنیە دوور مەوداکان، زیادبوونی ژمارەی ئەو کەناڵە تەلەفزیۆنییانەی لە بەردەستن.
- دەرفەتی رەخساند بۆ ڕۆژنامەکان بۆ زاڵبوون بەسەر گرفتی دووری شوێنەکان، زۆرجار ڕێگربوون لە گەیشتنی هەواڵ و زانیارییەکان بە خوێنەر لە کاتی گونجاودا، بەڵام ڕۆژنامەکان ئێستا دەتوانن لاپەڕەکانیان لە ڕێگەی مانگی دەستکردەوە لەیەك کاتدا ڕەوانەی چەندین شار و وڵات بکەن و لە چەندین شوێنی جیاجیا لە یەك کاتدا چاپبکرێن، لەو ڕۆژنامانە (وولّ ستریت جۆرنال) و (نیویۆرك تایمز) و (یو ئیس تودەی) ی ئەمریکی و ڕۆژنامەی **(الشرق الأوسط)**ی لەندەنی.
- گواستنەوەی خێرا و ڕاستەوخۆی هەواڵ و ڕووداوە نێودەوڵەتیەکان، بە جۆرێك هەواڵەکان لە ساتی ڕوودانی ڕەوانەی شوێنی مەبەست و پەخشکردنی بۆ بینەر دەکرێ.

## ڕادیۆی ژمارەیی

خزمەتگوزارییەکانی ڕادیۆی کلاسیکی بەرەو ئەوە دەچێت بە شێوەیەکی فرەوانتر ببێتە وێستگەی ڕادیۆیی خاوەن هێزی نزم (Low-Power-Station) ڕوو لە ژمارەیەکی سنورداری گوێگر و گروپە بچووکەکان دەکات، بە هەمان شێوە وێستگە ڕادیۆییەکان لە ئێستادا ڕوو لە سیستەمی (FM) دەکەن، ئەمە سنوری جوگرافی پەخشی ڕادیۆیی **کەمدەکاتەوە**، لە بری ئەوە ئاڕاستەکە بەرەو دواندنی ژمارەیەکی کەمترە لە جەماوەر کە خاوەن تایبەتمەندیی هاوبەشن.

شارەزایان باس لە چەمکێکی نوێی ڕادیۆ دەکەن لە بنەرەتدا پشت بە ڕادیۆی سنوردار و بەرتەسك دەبەستێت (Narrow –Cast)، ئەم چەمکە ئاماژەیە بۆ ئەو ڕادیۆیانەی ژمارەیەکی کەمتر لە گوێگر دەدوێنێت، بەڵام ئاستی هارمۆنی و هەماهەنگیان زیاترە.

هەرچی ڕادیۆی ژمارەییە (Digital Radio) تەکنەلۆژیای پەخشی ڕادیۆی ژمارەیی وەك تەکنەلۆژیای پەخشی تەلەفزیۆنیی ژمارەیی، بواردەدات بە ناردنی چەند کەناڵێکی دەنگی لە چەند شەپۆلێکی کەمدا، بەرنامەکانی لە ڕێگەی سێرڤەرێکی تایبەتەوە **پێشوازی** لێدەکرێت، بە مانایەکیتر ئەم تەکنەلۆژیایە ڕووبەرێکی بچووکتر لە شەبەنگی ڕووناکی (Spectrum) داگیردەکات بۆ نموونە (٧) ڕادیۆی ئەنەلۆگی ڕەنگە نزیکەی (MH29) بەکاربێنێت، لە کاتێکدا هەمان ژمارەی ڕادیۆ ئەگەر بگۆڕدرێن بە پەخشی ژمارەیی ئەوا ( ٢١، (MH5 بەکاردێنێت.

وێستگە ژمارەییەکان پەخشی خۆی لە ڕێگەی ئەو شەپۆلانە دەنێرێ بۆ هەر شوێنێك بەشێك لە شەبەنگی ڕووناکی داگیردەکات، تەکنەلۆژیای ژمارەیی هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی کۆمەڵێك کەناڵ لەهەر بەشێك لە بەشەکانی شەبەنگی ڕووناکی لە ڕێگەی دەستەبەرکردنی ئەو کەناڵانە لە شێوەی ژمارە، دواتر ئەو کەناڵانە بە شێوەی ژمارەیی و کۆد لە شێوەی شەپۆل پەخشدەکرێن، دواجار ئەو کۆدانە لەگەڵ گەیشتنی بە گوێگر دەکرێنەوە، بە شێوەی دەنگ دەردەکەون، ئەمە مانای وایە لەسەر هەمان فریکوێنسی ئاوێتەیەك لە وێستگەی ڕادیۆیی ژمارەیی هەن ناکرێ ڕێگەی لێبگیرێ تەنها لە ڕێگەی ئامێرێکی تایبەت نەبێت بە کردنەوەی کۆدەکە (De Coder) یان ئەوەی ناسراوە بە

ئامێری **پێشوازیکردنی** ژمارەیی تەلەفزیۆنی، لە حاڵەتی ڕادیۆ ئامێری کردنەوەی کۆد لە ناو دەزگای ڕادیۆیەکە خۆیدا دەبێت، شەپۆلە ژمارەییەکانی ڕادیۆ دەتوانیٚ (٨ تا ٩) وێستگە یان کەناڵ هەڵبگرێ.

لێکۆڵینەوەکان سەرگەرمی پەرەپێدانی تەکنەلۆژیایەکی تازەن بە ناوی (IBOC) دەکرێ پەخشی ژمارەیی بەرنامە ڕادیۆییەکان لە ڕێگەی کەناڵە تەقلیدییەکانی ناردن و پەخشەوە **بکرێ**، هێما ژمارەییەکان لە نێو کەناڵەکانی پەخشی (AM،FM) ە تەقلیدییەکان ڕەوانەدەکرێن، بەمە دەکرێ هێما نێردراوەکان بگۆڕدرێن بۆ شێوەی ژمارەیی، لە حاڵەتی سەرکەوتنی ئەم ئەگەرانە بۆ وەرگرتنی شەپۆلی ڕادیۆی ژمارەیی پێویست بە کڕینی ئامێری تایبەت بە پەخشی ڕادیۆی ژمارەیی ناکات، لە ئەمەریکا وێستگەکانی ڕادیۆ دەستیانکردوە بە پەخشکردنی بەرنامەکان لە ڕێگەی مانگە دەستکردەکان، ئەو وێستگانە بە (S) ناودەبرێن لە بەرامبەر شەپۆلی (FM)(AM) کە ساڵی چلەکانی سەدەی ڕابردوو دەستیانپێکردوە. ئەم تەکنەلۆژیایە دەرفەتی رەخساندووە پەخشی ڕادیۆی ژمارەیی بگاتە ڕووبەرێکی یەکجار فرەوان بە بەراورد لەگەڵ پەخشی کلاسیکی ڕادیۆ.

## تایبەتمەندییەکانی پەخشی ڕادیۆی ژمارەیی

فەراهەمکردنی ناردنی دەنگ بە شێوەیەکی ڕوون هاوشێوەی ڕوونی ئەو دەنگانەی لەسەر سی دی و دی ڤی دی تۆمارکراوە، هەروەها دەنگی ڕادیۆی ژمارەیی دوورە لەو ژاوەژاوەی لەسەر دەنگی ڕادیۆی کلاسیکی دروستدەبێت.

- دەستەبەرکردنی ژمارەیەکی زیاتر لە وێستگەی ڕادیۆیی بژاردەی زیاتر دەخاتەبەردەستی گوێگر بۆ گوێگرتن لە ڕادیۆی تایبەتمەند.
- وەرگرتنی داتا و زانیارییەکان لەسەر شاشەی ڕادیۆی ژمارەیی و پەخشکردنی زانیارییە ژمارەییەکان لەبارەی هاتووچۆ، کڕین و فرۆشتنی ئەلیکترۆنی، بازارە ئەلیکترۆنییەکان و پێشکەشکردنی بەرچاوڕوونی بۆ کڕیارەکان، لە هەمان کاتدا ڕادیۆ بەستراوەتەوە بە ئامێرێکی تەلەفۆن کرداری کڕینی کەلوپەلەکە جێبەجێ دەکات.

**ڕادیۆی ئینتەرنێتی** (Internet Radio)

لە ئێستادا ژمارەیەکی زۆری ڕادیۆ بەرنامەکانیان لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێت پەخشدەکەن، ئەوە هاندەرە بۆ زیادبوونی ئەمجۆرەی پەخشی ڕادیۆیی، دەرچوونی کۆپی تازەی بەرنامەکانی بەکارهینانی ئینتەرنێت (Browsers) ئایکۆنی تایبەت بە گوێگرتن لە ڕادیۆ لە خۆیدەگرێ، هەروەك ئێستا کۆمپیوتەرەکان ڕادیۆ کارت ( Radio Card) ی تێدایە، ئەگەرچی بەگوێرەی خواستی کەسەکان دەبێت، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بەردەستە بۆ هەموان، ئەم سیستەم و بەرنامانە بە شێوەیەك دانراون پەخشی ڕادیۆی ئەنەلۆگی وەربگرن، بەڵام لە توانادا هەیە بەوشێوەیە دیزاین **بکرێ پێشوازی** لە پەخشی ژمارەیی ڕادیۆ بکات.

بڵاوبوونەوەی بەرفرەوانی ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر بە تایبەتی لە نووسینگە بازرگانییەکان، ئەگەری شوێنگرتنەوەی ڕادیۆی ئەنەلۆگ زیاتر دەکات بە مۆسیقا و هەواڵەکان لە ڕادیۆی ژمارەیی دەکرێ لە ڕێگەی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت گوێی بۆ بگیرێ، لە ئایندەیەکی نزیکدا کۆمپیوتەر لە ماڵ یان نووسینگە بۆ گوێگرتن لە ڕادیۆ بەکاردێت.

(BBC) پلانێکی ڕاگەیاندووە بۆ فەراهەمکردنی خزمەتگوزاری ئینتەرنێتی کە ڕەگەزەکانی مەڵتیمیدیا لە خۆی بگرێ، ئەم خزمەتگوزارییە بە زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان دەبێت، بەمە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە (BBC) لە پێشکەشکردنی خزمەتگوزارییە هەواڵییە ڕاستەوخۆکان پێشەنگ دەبێت، بەدەستەبەرکردنی بەکارهێنەر دەتوانێ لە یەك کاتدا سوودمەندبێت لە ناوەڕۆکی ماڵپەڕەکە و بەرنامەکانی ڕادیۆکە، بە هەمان شێوە بەکارهێنەران سوودمەنددەبن لە بینینی وێنە ڤیدیۆیی و پەخشە ڕاستەوخۆکەی تەلەفزیۆن لەسەر ماڵپەڕەکە، دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێت کارێلك بکەن لەگەڵ بابەتەکان، بەشداری گفتوگۆ زیندووەکان بکەن لە ڕێگەی پەیوەندی تەلەفۆنی یان پۆستی ئەلیکترۆنییەوە، دوای تەواوبوونی پەخشی بەرنامەکانیش بیروڕا گۆڕینەوە لەسەر ماڵپەڕەکە بەردەوام دەبێت.

دوایین پێشکەوتنە تەکنۆلۆژییەکان لەو بوارەدا بریتییە لە بەرهەمهێنانی ئامێرێکی بچووك بۆ گوێگرتن لەو ڕادیۆیانەی لەسەر ئینتەرنێت هەن لەجیاتی بەکارهێنانی

کۆمپیوتەر، لەپاڵ ئەمەدا هەوڵەکان بەردەوامن بۆ زاڵبوون بەسەر گرفتی نەبوونی تەکنەلۆژیاوە، بەرنامەیەك یارمەتی گوێگر بدات بۆ گێڕانەوەی ئەو بەرنامە و بابەتانەی چەند هەفتەیەك یان مانگێك بەر لە ئێستا **پێشکەشکراون**، لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ئەو بەرنامانەی پەخشدەکرێن کۆپی تۆمارکراو یان (Transcripts) نیە ئەگەر هەبێ لە شێوەی بابەتی نووسراودایە بە گەڕان لە ناویدا، ئەگەرچی کۆمپانیاکانی پەخش هەڵدەستن بەخەزنکردنی ئەو بەرنامانە بەڵام ئەو بەرنامانە تەنها ناو و ڕێکەوتی پێشکەشکردنی لە لیستێك تۆمارکراوە، لە ساڵی (٢٠٠٠) تەکنەلۆژیایەکی نوێ لەسەر ئینتەرنێت بۆ یەکەم جار تاقیکرایەوە، ئەویش ناوەڕۆك(Index) ێك بوو زیاتر لە (٧١٩٥) کاتژمێری بەرنامە کۆنەکانی لەخۆیگرتبوو لە کۆی (٦٦١٣) بەرنامەی ڕادیۆیی، هەندێك لەو بەرنامانە مانگی ئازاری (١٩٩٩) پێشکەشکرابوون، ئەم ناوەڕۆك و پێڕستە ڕۆژانە نوێدەکرێتەوە، ئەوەی پێویستە گوێگر بیکات ئەوەیە بچێتە سەر ماڵپەڕەکە، بە بەکارهینانی وشە کلیلییەکان بە دوای ئەو بابەتەی دەیەوێ بگەڕێت، ئەوکات خزمەتگوزارییەکەی بۆ ئەنجامدەدرێت، ئەو پارچە دەنگیانەی بۆ دەهێنرێتە سەر شاشەی کۆمپیوتەر داوایکردبوو.

**تەلەفزیۆنی** HD (High Defination Tv)

ئەو سیستەمە تەلەفزیۆنیەی ئێستا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەکاردێت بریتییە لە سیستەمی (National Television System Committe) (NISC) لە سییەکان و چلەکانی سەدەی ڕابردوو پەرەپیێدرا، لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوو سیستەمی ڕەنگی بۆ زیادکرا، ئەم سیستەمە تەنها لە وڵاتانی ئەمەریکای باکوور و ژاپۆن بەکار دەهێنرا، زۆرینەی وڵاتانی جیهان یان سیستەمی ( PAL) Phase Atternating Line)) بەکاردەهێنا کە سیستەمێکی ئەوروپی بوو یان سیستەمی (Sequential Color Secam With Memory) بەکاردەهێنرا ئەو سیستەمە لەلایەن فەرەنساوە پەرەپیێدرا، لە یەکێتی سۆڤیەت و بەشێك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقیا بەکاریاندەهێنا، ئەم سیستەمانە لە جۆر و کارکردنیاندا جیاوازن بەڵام هەموویان لە نزمی ئاستی کوالێتی ڕوونی وێنە و ڕەنگدا هاوبەشن، ئەم کەموکوڕیانە بە ئاشکرا دەردەکەون کاتێك شاشەی گەورەی پیشاندان بەکاردەهێنرێت.

ئەم گرفتانە زەمینەیان خۆشکرد بۆ داهێنانی تەلەفزیۆنێکی خاوەن ڕوونییەکی زۆر بەرز (HDTV) یەکێکە لە تەکنەلۆژیا هەرە پێشکەوتووەکانی تەلەفزیۆن لەوەتەی داهێنانی تەلەفزیۆنی ڕەنگاوڕەنگ لە سەدەی ڕابردوو، لە ئێستادا کاردەکرێ ئەم تەکنەلۆژیا نوێیە چەند تەکنەلۆژیایەك لەخۆیبگرێ ئەوانیش تەکنەلۆژیای تەلەفزیۆن و کۆمپیوتەر و فیلمە، بە جۆرێك ببێتە تەلەفزیۆنی کۆمپیوتەری مەڵتیمیدیایی، چاوەڕێ دەکرێ لە ئایندەیەکی نزیکدا ڕووناکی ببینێت، تەلەفزیۆنی (HD) چەند تایبەتمەندییەکی هەیە ئەوانیش:

- ئاستیبەرزی ڕوونییەکەی، لەبەرئەوەی وێنەکەی لە (١١٠) هێڵ پێکدێت، بە بەراورد لەگەڵ سیستەمی (NISC) لە (٥٢٢) هێڵ، لە سیستەمی ( (PAL SECAM)) لە (٦٢٥) هێڵ پێکدێت.
- کوالێتی و وردی وێنەکەی بە ڕێژەی(٤٠٠٪ تا ٥٠٠٪) زیاترە، بەوپێیەی شاشەی تەلەفزیۆنی (HD) دابەشدەکرێت بۆ تۆڕێك پێکدێت لە (١٠٨٠) × (١٩٢) خاڵی ڕووناکی (Pixel) بە بەراورد لەگەڵ سیستەمی (NISC) تەنها لە (٣٤٠) × (٤٢٠) خاڵی ڕووناکی (Pixel) پێکدێت.
- بەوپێیەی ئاستی ڕوونی وێنەکان لە (HD TV) بەرزە، بۆیە دەکرێ شاشەی قەبارە گەورە بەکاربهێنرێت بێ ئەوەی کاریگەری نەرێنی بکاتەسەر ئاستی ڕوونیەکەی.
- جوڵەی وێنە لە تەلەفزیۆنی (HD) بە شێوەیەکی هارمۆنیتر و ڕێکوپێکتر ئەنجامدەدرێت بەوپێیەی ئەم وێنانە لە چرکەیەکدا بە (٦٠) چوارچێوەیە لە سیستەمی (NISC).
- وێنەی شەبەنگی ڕووناکیەکەی سێبەری نیە کە لە تەلەفزیۆنە ئاساییەکان بە دەردەکەوێت.
- ئاستی ڕوونی دەنگەکەی بەرزە هاوشێوەی ڕوونی ئەو دەنگانەی لەسەر سیدی و دی ڤی دی تۆمارکراون..
- ئەم تەکنەلۆژیایە وایکرد ڕەنگەکان باشتر بگوازرێتەوە و پیشانبدرێت، بە جۆرێك زۆرتر ڕوون و لە سروشتی خۆی

نزیکترە، بۆیە پرۆسەی سەیرکردنی وێنە لەجۆرە تەلەفزیۆنە کارێکی چێژبەخشە، هاوشێوەی سەیرکردنی فیلمە سینەماییەکانە لە هۆڵەکانی سینەما.

لەلایەکی دیکەوە لەو کاتەی هێشتا زۆرێك لە ئێمە خەریکی بیرکردنەوەیە لە بە دەستهێنانی تەلەفزیۆنی بەرزە ڕوونی (HD TV)، کەچی ژاپۆنیەکان پەردەیان لادا لەسەر تەکنەلۆژیایەکی نوێی تەلەفزیۆن بەناوی تەلەفزیۆنی سەرووی بەرزە ڕوون (Ultra-defition TV) (UD TV)، زیاتر لە ١٠٠ کۆمپانیا و ڕێکخراو باس لە بەرهەمهێنانی ئەو تەکنەلۆژیا ژمارەییە زۆر بەرزە دەکەن (٢٠٠٠) هێڵ بەکاردەهێنێت ئەمە دوو هێندەی ئەو ژمارەیەیە لە (HD TV) بەکاردێت.

## تەلەفزیۆنی ژمارەیی

سەردەمانێکی نزیك پەخشی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن پشتی دەبەست بە گۆڕینی دەنگ و ڕەنگ بۆ چەند هێمایەکی شەپۆلی لە ڕێگەی هەوایی یان سێرڤەرێکی بچووك لە ماڵەکاندا جێگیردەکرا **پێشوازی** لێدەکرا، بەڵام تەلەفزیۆن و ڕادیۆی ژمارەیی گۆڕانێکی گەورەیان هێنا ئاراوە بە خێراییەکی زۆرەوە بڵاوبووەوە.

ئەم تەکنەلۆژیایە لەگەڵ خۆی کۆمەڵێك تایبەتمەندیی و خزمەتگوزاری هێنا لەوانەی پێش خۆیدا بوونی نەبوو، لە سەرووی هەموویان کارلێککردن و خزمەتگوزارییەکانی کارلێکردن کە تەلەفزیۆنی ژمارەیی دەیخاتە بەردەست، هەر لە داوا کردنی خواردنی خێرا و برینی بلیتی گەشت کردن و بەدواداچوونی نرخی پشکەکان و هەواڵی ئابووری و سیاسی و وەرزش، سەرباری چوونە نێو ئینتەرنێت لە ڕێگەی تەلەفزیۆن و لە بری کۆمپیوتەر.

تۆڕەکانی تەلەفزیۆنی ژمارەیی لە ڕێگەی پەخشی مانگە دەستکردەکان یان تەلەفزیۆنی کێبڵی یان لە ڕێگەی پەخشی وێستگەی زەمینی، بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای پاڵەپەستۆ (Compressing) دەتوانێ ژمارەیەکی زۆری بەرنامە لەسەر هەمان شەپۆلی هەوایی بنێرێ تەکنەلۆژیای ئەنەلۆگی بەکاریدەهێنێ، بەڵام لە ئەنەلۆگدا دەکرێ یەك کەناڵ بنێردرێ، ئەمە سەرباری ئەوەی کوالێتی دەنگ و ڕەنگی تەلەفزیۆنی ژمارەیی بە بەراورد لەگەڵ تەلەفزیۆنی ئەنەلۆگدا گەلێك بەرزە.

## تایبەتمەندییەکانی تەلەفزیۆنی ژمارەیی

بەرزی و جۆرایەتی دەنگ و وێنەکەی لەچاو ئەوەی لە تەلەفزیۆنی ئەنەلۆگدا هەیە، **وادەکات** کردەی سەیرکردنی تەلەفزیۆنی ژمارەیی هاوشێوەی هۆڵەکانی سینەما تاموچێژی خۆی هەبێت بەهۆی ڕوونی دەنگ و وێنەکانیەوە.

ژمارەیەکی زیاتر لە کەناڵ و بەرنامە دەخاتەبەردەست لە یەك باندی پەخشدا (band with)، لە کاتێکدا تەنها یەك بەرنامە یان کەناڵ لە سیستەمی ئەنەلۆگ دەکرێ لەو باندە پەخشبکرێ.

تەلەفزیۆنی ژمارەیی توانای پێشکەشکردنی ئەو خزمەتگوزارییەی هەیە مەڵتیمیدیای جۆراوجۆر لەخۆیدەگرێ، بواری بەکارهێنانی پۆستی ئەلیکترۆنی و ئینتەرنێت دەڕەخسێنێ، خزمەتگوزاری کارلێکردن لە نێوان بینەر و بەرنامە پەخشکراوەکان، لاپەڕە تەلەفزیۆنییەکان، دەقە نووسراوەکانی هەواڵ پیشاندەدات و لە ئێستادا جۆری جیاوازی هەیە، دەکرێ وێنەی لەگەڵ دابنرێ لەپاڵ لینکی ئەلیکترۆنی.

دەستکەوتنی وێنەیەکی کوالێتی بەرز بۆ تەلەفزیۆنی جوڵاو وەك ئەو تەلەفزیۆنانەی لە ناو ئۆتۆمبێلەکان دانراون، بە پێچەوانەی تەلەفزیۆنی ئەنەلۆگی ماڵان، بە هەمان شێوە ئەو تەلەفزیۆنە بچووکانە بەدەست هەڵدەگیرێن.

## تەلەفزیۆنی کێبڵی (Cable TV)

تەلەفزیۆنی کێبڵی لە چلەکانی سەدەی ڕابردوو لە ئەمەریکا بەکارهات، بەهۆی نەگەیشتنی هێمای تەلەفزیۆن بۆ ناوچە دوورەکان، یان بە هۆی گەیشتنی هێمای تەلەفزیۆنی بە شێوەیەکی لاواز بۆ ئەو شوێنانە، **وادەکات** بینەر بە شێوەیەکی ڕوون یان بەردەوام سوود لە ناوەڕۆکی بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان وەرنەگرێ.

بە مەبەستی باشترکردنی خزمەتگوزارییە تەلەفزیۆنییەکان، یەکەم سیستەمی کێبڵی لە بەشی باشووری ویلایەتی بەنسیلڤانیا لە ساڵی (١٩٤٦) دانرا، بە هاتنی ساڵی (١٩٥٠) ژمارەی کۆمپانیاکانی کێبڵ لە ئەمەریکا گەیشتە (٧٠) کۆمپانیا، لە ساڵی (١٩٧٥) کۆمپانیای (هۆم بۆکس ئۆفیس (H.B.O)) مانگە دەستکردەکانی بەکارهێنا

بۆ ئاوێتەکردنی پەخشی تەلەفزیۆنی کێبڵی بە پەخشی ئاسمانی، لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو ژمارەی ئەو وڵاتانە زیادیکرد کە تەلەفزیۆنی کێبڵی بەکارهێنا.

داهاتی تەلەفزیۆنە کێبڵییەکان لە ساڵی (١٩٨٢) گەیشتە دوو بلیۆن و نیو دۆلار، ژمارەی ئەو ماڵانەی لە ساڵی (١٩٨٧) سوودمەندبوون لە خزمەتگوزاری تەلەفزیۆنی کێبلی گەیشتە (٤٦٪) لە ساڵی (١٩٩٧) ڕێژەکە زیادیکرد و گەیشتە (٩٧٪)، ئەم خزمەتگوزارییە تەنها لە وڵاتە پێشکەوتووەکانی وەك ئەمەریکا و ئەورووپای خۆرئاوا بڵاوبووەوە، بەڵام دابینکردنی ئەم خزمەتە لە وڵاتە دواکەوتووەکانی وەك وڵاتانی جیهانی سێ بەهۆی خەرجیە زۆرەکەی نەتوانرا کاری لەسەر **بکرێ** لە بری ئەوە کار بە سیستەمی کێبڵی هەوایی کرا.

## ئینتەرنێت

ئینتەرنێت شۆڕشێکی گەورە بوو، بە تازەترین هۆکاری میدیا دادەنرێت، زۆر زوو بڵاوبووەوە و گەشەیکرد. وشەی (internet |) لە ڕووی زمانەوانییەوە بە واتای پەیوەندیی نێوان تۆڕەکان دێت، چونکە ئینتەرنێت لە ژمارەیەکی زۆری کۆمپیوتەر پێکهاتووە لە هەموو جیهاندا بەیەکەوە بەستراوەتەوە، ئەم تۆڕانە بەپرۆتۆکۆڵێك کۆنترۆڵکراوە پێی دەوترێت پرۆتۆکۆڵی نامەناردنی ئینتەرنێت و کورتکراوەکەی بەپیتی ئینگلیزی بریتییە لە (TCP\IP). ئەم تۆڕە زۆر گرنگە، لە هەمان کاتدا مەترسیدارە، چونکە توانای تێپەڕاندنی بەسەر شوێن و کاتدا هەیە، بەکارهێنەرانی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیادبووندایە لە جیهاندا. لە نێوان تۆڕی گەیاندنە جیهانییەکاندا ئینتەرنێت بە دیارترین تەکنیك دادەنرێت بۆ مرۆڤ کە تێچوون و کاتی کەمی بوێت، بەڵام دەستکەوتی زۆرە و سەرنجی بەکارهێنەرانی ڕادەکێشێت بەهۆی ئەو هەموو خزمەتگوزارییە جۆراوجۆرەوە پێشکەشی دەکات، وەك پۆستی ئەلیکترۆنی (E-mail)، گواستنەوەی فایلەکان (FTP)، تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی (Web)، گروپی تایبەت، هەواڵ و بازرگانی ئەلیکترۆنی و پەیوەندیکردن لە بوارە جۆربەجۆرەکانی چالاکی مرۆڤدا.

یەکەم هەنگاوی ئەم داهێنانە نوێیە، بەستنەوەی دوو کۆمپیوتەر بوو بەهۆی کێبلێکەوە، کە چوار مەتر و نیو لە یەکترەوە دوور بوون. ئەمڕۆ سەدان ملیۆن کەس لە هەموو گۆشەیەکی ئەم دنیایەوە تۆڕی ئینتەرنێت بەکاردێنن، زانیاری و هەواڵ و مۆزیك

و وێنە لە نێوانی خۆیاندا ئاڵوگۆڕدەکەن. لە (٢) ی سێپتەمبەری (٩٦٩) دا، لە یەکێك لە لابۆرا تۆڕەکانی زانکۆی لۆس ئەنجلۆس (Ucla)ی کالیفۆرنیادا، پرۆفیسۆر ( Lein Kreinrock) لەگەڵ خوێندکارەکانیدا (StephenCrocker) و (Vinton Cerf) توانیان هەندێ زانیاری لە کۆمپیوتەرێکەوە بگوێزنەوە بۆ کۆمپیوتەرێکیتر.

کاتێك پێنتاگۆن بودجەی بۆ یەکەمین هەنگاوی ئەو ئەزموونە زانستییە تەرخانکرد، وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا بەدوای سیستەمێکی نوێی پەیوەندیکردندا دەگەڕا بتوانێ بەرگەی هێرشێکی ئەتۆمی بگرێت و سەلامەت بێت. لە قۆناغی هەرە هەستیاری جەنگی سارددا، خەمی هەرە گەورە دروستکردنی ستراکچەرێکی (ناسێنترالْ) لامەرکەزی بوو، یان ڕاستتر بڵێین، ستراکچەرێك بە لەدەستدان و نەمانی بەشێکیشی بتوانێ درێژە بە کارەکانی خۆی بدات. ئەمڕۆ ئینتەرنێت پەنجەرەیەکی فرەوڵات و فرەنەتەوەی ئاوەڵایە بەڕووی جیهاندا، هۆیەکی خێرا و گرنگە بۆ پەیوەندییەکانی خێزان، سەکۆ و هۆڵی گفتوگۆی سیاسەتمەدارە کاندیدکراوەکانە، جێژوانی لەبار و دڵنیای ڕۆحە تەنیا و دڵ زگورتییەکانە.

(Crocker) و (Cerf)، ئەو دوو خوێندکارەی تائێستا بەردەوام لەگەڵ داهێنراوەکەی خۆیاندا کاردەکەن.. لەو باوەڕەدان سەرکێشی و داهێنانە ڕاستەقینەکە هێشتا لە سەرەتای ڕێگادایە. (Cerf) کە لەگەڵ (Nasa) دا وەك هاوکار کاردەکات، هەندێ سیستەمی نوێی لە مێشکدایە بۆ بەستنەوەی ئینتەرنێت بە ئامێرەکانی ناو ماڵەوە، ئەو ئامێرانەی ڕۆژانە بەکاریاندێنین، تەنانەت بۆ بەستنەوەی سەگەکانمان، یان بۆ پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ بە وێستگە ئاسمانییەکانەوە.

لە حاڵی حازردا، زۆرانبازیی هەرە دژوار لە دژی گەشەکردنی ئاشکرای تاوانە ئینفۆرماتیکیەکانە، کۆمەڵێك گرفتی نوێی لەبەردەماندا دروستدەکەن، نەك تەنها گرفتی تەکنیکی، بەڵکو یاسایی. لە مانگی دیسەمبەری (٢٠٠٣) دا، ئەنجومەنی پیران (سێنات) ی ئەمریکی بەهۆی ئەوەی لە ئەمەریکا (١٦٧٧٥٠٠٠٠) کەس ئینتەرنێت بەکاردەهێنن. واتە یەکەم وڵاتە لە دنیادا زۆرترین ژمارەی کەسانی ئینتەرنێتی تێدایە. یاسایەکی نوێی پەسندکرد بۆ سزادانی زۆر توندی ئەو کەسانەی تاوانی (on- line) ئەنجامدەدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەش شارەزایان و پسپۆڕانی بواری ئینفۆرماتیکە، بەردەوام سەرقاڵی باشکردن و خێراکردنی پەیوەندییەکانن. سیستەمی (Internet2) ئەو داهێنانە

نوێیەیە دەتوانێ وەڵامی پێداویستییە جدییەکانی باشترکردن و خێراکردنی پەیوەندییەکان بداتەوە، ئەو سیستەمە تازەیە، سەدجار لەم سیستەمە خێراترە ئێستا لە دنیادا بەکاردەهێنرێ.سیستەمی (Internet2) خەیاڵ نیە و پڕۆژەیەکی نوێ سەرکەوتووە. تائێستا تەنیا لەچەند زانکۆیەکی تایبەتمەندی بواری ئینفۆرماتیکەدا کاری پێدەکرێت. سەرەڕای هەموو ئەمانە، تائێستا چەندین ڕێگر و ئاستەنگی بەهێز لە بەردەم توێژینەوە زانستییە نوێیەکاندان، گەلێك کۆمپانیای ئەهلی لەدژی گەشەکردنی دیاردەی پێشێلکردنی مافەکانی داهێنەرن، بەهۆی کۆپیکردن و گواستنەوەی بەرهەمە ڤیدیۆیی و مۆزیکیەکانەوە، خەمی زۆریان لە داهێنانە نوێیەکان لێنیشتووە. لەلایەکی ترەوە پاش ڕووداوەکانی یازدەی سپتەمبەری (٢٠٠١)، جەنگی دژی تیرۆر گەیشتۆتە نێو دنیای ئینتەرنێتەوە، دامودەزگا جەماوەرییەکان و ئۆرگانە دەوڵەتیە جۆراوجۆرەکان زۆر بە زەحمەت دەتوانن چاوەدێر و پشکنەری بەردەوامی ئەو بابەتانە بن لەم تۆڕەدا بڵاودەکرێنەوە، خەمی گەورەیان ئەوەیە تاوانەکان تادێت زیاتر دەبن و زۆرینەیان بێ سنور پێشێلکار و دژە یاسا و دژە دەوڵەتن.

لە دوایین توێژینەوەکانی ئینتەرنێت هاتووە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەکارهێنەری ئینتەرنێت کاتێکی زیاتر لەسەر ئینتەرنێت بەسەر دەبات بە بەراوردی ئەوکاتەی لە سەیرکردنی تەلەفزیۆندا بەسەری دەبات.

ڕاپرسییەکە زیاتر لە (٢٥٠٠) بەکارهێنەری ئینتەرنێتی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئەفریقیا گرتۆتەوە، بە ڕوونی ئەوە پیشاندەدات (٨٨٪) ی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت لە ناوچەکەدا ڕۆژانە دەچنە ناو تۆڕی ئینتەرنێت، ڕێژەیەکی گەورە لەوان کاتێکی زیاتر لەسەر ئینتەرنێت بەسەردەبەن لە بەرامبەر ئەوکاتەی لە سەیرکردنی تەلەفزیۆن بەسەری دەبەن.

سەرۆکی جێبەجێکاری کۆمپانیاکە (بریندوون ئوجیلفی) دەڵێت: ئەم لێکۆڵینەوەیە بە شێوەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا پیشانی دەدات خەڵك لە کاتەکانی ڕۆژ و شەودا، ئینتەرنێت بەکاردەهێنن، لەکاتێکدا کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی تری وەکو ڕۆژنامە و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن، چەند کاتێکی دیاریکراوی بەکارهێنانیان هەیە، هەروەها دەڵێت: سەرەڕای ئەمە، بەردەوام ژمارەیەکی زیاتری خەڵك ئارەزووی بەکارهێنانی ئینتەرنێت دەکەن بە شێوەیەکی ڕۆژانە، هەروەك ئەوان کاتێکی زۆرتر لە گەڕان و تازەکردنەوەی

زانیارییەکانیان بە یەك ئاست لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەسەر دەبەن، بە بەراورد لەگەڵ ئەوکاتەی لە بەکارهێنانی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی تەقلیدی بەسەریدەبەن. ئەم ئەنجامانە ئاماژەن بۆ گۆڕانێکی کردەیی لە ڕێگە و شێوازی بەدەستهێنانی زانیارییەکان لەلایەن خەڵکی ئەم ناوچەوە.

هەروەك دەڵێت: کە (٧١٪)ی ئەوانەی لە ڕاپرسییەکە بەشداربوون، ڕۆژانە سەیری تەلەفزیۆن دەکەن، زۆربەشیان (٨٠٪) لەکاتی ئێوارە لە نێوان کاتژمێر (٨)ەوە تا نیوەی شەو سەیری تەلەفزیۆن دەکەن، لەکاتێکدا زۆربەیان لەکاتی بەیانیان (کاتژمێر٦: ٠٠ ی بەیانی و ٣: ٠٠ی دوای نیوەڕۆ) گوێ لە ڕادیۆ ڕادەگرن و ڕۆژنامەکان دەخوێننەوە.

ڕاپرسییەکە پیشانیداوە ئەو کەسانە بە شێوەیەکی ڕێژەیی بە یەکسانی لە ڕۆژدا ئینتەرنێت بەکاردەهێنن، لە کاتێك (٦٠٪) ی کەسەکان (لە ١ تا ٣) کاتژمێر ڕۆژانە لە سەیرکردنی تەلەفزیۆن بەسەردەبەن،، (٦٨٪) لەوان کاتێکی زیاتر (لە ١ تا ٦) کاتژمێر لە بەکارهێنانی تۆڕی ئینتەرنێت بەسەردەبەن.

دیسان لە ڕاپرسییەکەدا ئەوەش بەدیارکەوتووە کەسەکان کاتێکی کەمتر لە خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بەسەردەبەن، زیاتر لە (٨٠٪) ی ئەوان ڕۆژانە تەنها (٣٠ خولەك تاکو یەك کاتژمێر) لە ئەنجامدانی ئەمجۆرە چالاکییانە بەسەردەبەن.

ئاماژە بەوەشکراوە کە زیاتر لە (٧٠٪)ی بەشداریووانی ڕووپێوەکە، ماڵپەڕی (فەیسبووك) بەکاردەهێنن، (٧٣٪) ئەوان سەیرکردنی پۆستی ئەلیکترۆنیی کاری سەرەکییانە، (٤١٪) گوتویانە تۆڕە کۆمەڵایەتییکان دیارترین چالاکییانە لەسەر ئینتەرنێتدا.

- (٤٢٪) لەوان کاری گەڕان بە دوای زانیارییەکانی پەیوەست بە ئارەزووەکانیانەوە ئەنجامدەدەن.
- زیاتر لە (٤٠٪) ی بەشداربووان زۆربەی کات سەرگەرمی گەڕانن بەدوای زانیاری لەبارەی چەند بەرهەمێکی دیاریکراو، یان بەردەوام خەریکی کڕینی بەرهەمەکانن لەسەر ئینتەرنێت.

ئەم ڕووپێوکردنەی "إفکتیف میجر" "سبوت أون" لە ماوەی نێوان (٩-١٢)ی مانگی تەمموزی (٢٠١٠) لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە (١٠٠ ماڵپەڕی ئەلیکترۆنی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست)، بەهۆی تەکنەلۆژیای ڕووماڵکردنی تایبەت بە

کۆمپانیای "إفکتیف میجر" ەوە ئەنجامدراوە، قەبارەی تێکڕایی سامپڵەکە گەیشتۆتە (٢٥٨٧) کەس.

ئامارەکان لەبارەی تەکنەلۆژیای ژمارەییەوە

- ئینتەرنێت ئەو ئامرازەی پەیوەندییە خێراترین بڵاوبوونەوەی هەیە، پەخشی هەوایی ڕادیۆ پێویستی بە (٣٨) ساڵ بوو تاوەکو (٥) ملیۆن گوێگر بۆ خۆی پەیدابکات، هەمان ژمارە بۆ بینینی تەلەفزیۆن لە ماوەی (١٣) ساڵدا. بەڵام بەکاربردنی ئینتەرنێت لە ماوەی کەمتر لە چوار ساڵ گەیشتە (٥٠) ملیۆن بەکارهێنەر.
- ژمارەی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت لە جیهاندا بە (١.٠٨) ملیار مەزەندە دەکرێت،ئەو ژمارەیە لە ساڵی (٢٠٠٠) دا تەنها (٤٠٠) ملیۆن کەس بوو لە کاتێکدا (١٩٩٥) تەنها (٢٠) ملیۆن کەس بوو.
- لە ساڵی (٢٠٠١) دا توانرا ژمارەیەکی زۆر بروسکەی زانیاری لە یەك بروسکەی ئینتەرنێت دا ڕەوانە بکرێت بەڵام لە (١٩٩٧) دا ئەو برە پێویستی بەیەك مانگی تەواو بوو.
- بری تێچوونی ناردنی زانیارییەکان بە شێوەیەکی زۆر کەم بووەوە لە ساڵی (١٩٧٠) دا بری ملیار ترپە لە زانیارییەکان لە (بۆستن)ە وە بۆ (لۆس ئانجلۆس) دەگەیشتە (١٥٠) هەزار دۆلار بەڵام ئەمڕۆ تەنها (١٢) سەنتە، ناردنی بڕوانامەیەکی (٤٠) لاپەڕەیی لە (چیلی)یەوە بۆ (کینیا) کەمتر لە (١٠) سەنت کە هەمان شت بە فاکس(١٠) دۆلارە و بە پۆستی ئاسایی (٥٠) دۆلاری تێ دەچێت.
- ڕاکێشانی هێڵی ئینتەرنێت لە ڕێی تەلەفۆنەوە بۆ ماوەی یەك مانگ و (٢٠) کاتژمێر لە ئەفریقیا نزیکەی (٦٠) دۆلاری ئەمریکی تێ دەچێت بەڵام لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا تەنیا (٢٢) دۆلارە.
- بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت ئەوانەی زمانی ئینگلیزی وەك زمانێکی بنەڕەتی بەکاردەهێنن دەگاتە (٣٥٪) هەرچەندە نزیکەی (١٠٪) ی دانیشتوانی جیهان زمانی دیکە بەکار دێنن، ئەوانەش کە زمانی چینی دەدوێن ڕێژەی دووەمی هەیە دەگاتە (١٦٪).
- بەکارهێنەرانی چیللی ئەوانەی ئینتەرنێت بەکاردەهێنن لە قۆناغە باڵاکانی خوێندن دان کە دەگاتە (٨٩٪) ئەم ڕێژەیە لە سریلانکا (٦٥٪) و لە چین (٧٠٪) یە

پاشان ویلاته یەگرتووەکان (٥٦٪) ومالّیزیا (٣٦٪) و ئوردون (٨٠٪) و لە فەلەستین (٤٪) و نایجیریا (٠.٦٪) و تاجیکستان (٠.١).

فاکتەرە کۆمەلاّتیەکان لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت دا

- زۆربەی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت توێژی گەنجانن و لە رەگەزی نێر و چینی دەوڵەمەندەکانی کۆمەڵگەن.
- رێژەی ژنان لە بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت دا (٤٢٪) لە جیهاندا ئەم رێژەیە بە بری (٣٧٪) لە ئیتالّیا و ئەلّمانیا دان لە ولاّتانی تر کەمبوونەوەی ئەم رێژەیە بەدیدەکرێت بۆ نموونە لە بەرازیل (٤٧٪) ە لە تایلاند (٤٩٪) و لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا ئەگاتە (٥١٪) ئەو ولاّتانە زۆربەیان موسلّمانن.
- تەنیا (٤٪) ژنانی عەرەب ئینتەرنێت بەکاردەهێنن سێ یەکی ئافرەتانی مەغریبن.
- نزیکەی (١٦٪) بەکارهێنەر لە خۆرهەلاّتی ناوەڕاست دا هەن ئەم رێژەیەش لە نێوان سالاّنی (٢٠٠٠-٢٠٠٥) بە رێژەی (٣٩٪) بەرز بووەتەوە.
- لە فەلەستین(٥.٣١٪) ژنانی کۆمپوتەر بەکاردەهێنن بەرامبەر (٨.٣٩٪) لەپیاوانی بەلاّم بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت ژنان لە (٧,٢٣٪) و پیاوانیش (٩، ٤) پێك دەهێنن.
- لەنێو (١٠)دایشتوانی عەرەبدا یەك تەلەفۆن بەکاردێت بەلاّم لە ولاّتە پێشکەوتەوکان (١\١٠٧) بۆ هەر کەسێك تەلەفۆن بەکاردێت.
- کەمتر لە (١٨) کۆمپیوتەر بۆ (١٠٠٠) لە جیهانی عەرەب دا بەکاردێت لەچاو جیهاندا (٧٨، ٣٪)یە.
- لە ئوردون سێ یەکەی دامودەزگا بچووك و مامناوەندییەکان ئینتەرنێت بەکاردەهێنن و لەوانەش (٧٨ ٪) یان کۆمپیوتەر بەکاردێت و نزیکەی (٦٦٪) هەوڵی بەکارهێنانی ئینتەرنێت دەدەن تەنها چارەکێکی کۆمپانیاکان خاوەنی لاپەڕەی تایبەتە لە تۆڕەکەدا.
- لە عەمان (٢٦٧) هەزار کەس خاوەنی تەلەفۆنە بەرامبەر (٩٧٧)هەزار بەشدار بووی لە هێڵی مۆبایل و نزیکەی (٤٨) هەزار بەشدار بوو لە هێڵی ئینتەرنێت.
- میسر خاوەنی هەمان رێژەیە لە تەلەفۆن دا بەرامبەر مۆبایلیش دەگاتە (٩.٧) ملیۆن.
- ئەفغانستان هەمان رێژە لە تەلەفۆن و مۆبایل دا کە دەگاتە (٣.٤٪).

**بۆشایی ژمارەیی:**

- لە کۆتایی سەدەی بیست دا لە ئەوروپا و ویلایەتە یەگرتووەکانی ئەمەریکا (٩٠٪) ی داتاکانیان سەبارەت بە ئەفریقیا کۆکردەوە.
- وڵاتانی ڕێکخراوی ئەوروپی بۆ هاریکاری و گەشە پێدان تەنها (١٨٪)ی جیهانی پێك دەهێنێت، کەچی نزیکەی(٧٩٪) لە بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت لە جیهاندا لەخۆی دەگرێت.
- (٣٤٪)ی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت لە وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان دا هەیە لەگەڵ ئەوەی تێکڕای دانیشتوانی جیهان بە ڕێژەی (٨١٪) لەو وڵاتانەیە.
- هێڵی تەلەفۆن و مۆبایل بە ڕێژەی (٥) ئەوەندە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان دا بەرزترە بە بەراورد لەگەڵ وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان، هەبوونی کۆمپیوتەر (١١) ئەوەندە زیاترە و بەکارهێنانی ئینتەرنێتیش (٨) ئەوەندە زیاترە، لە ئەوروپای خۆر ئاوا، ئوسترالیا، کەنەدا، ژاپۆن، نیوزلەندا، ویلایەتە یەگرتووەکانی ئەمەریکا.
- لە نێو هەر (٥-٨) ملیۆن کەس دا نزیکەی (٢) ملیۆن بەکارهێنەری ئینتەرنێت لە ئەفریقیا دا هەیە، ئەمانەش لە باکوور یا باشووری ئەفریقیا دان، واتە یەك کەس لەنێو (٤٠٠-٢٥٠) کەس دا، ڕێژەکە لە ئەوروپا یەکسانە بەیەك کەس لەنێو دوو کەس دا.
- لەنیوەی گۆی باشووریش دا ڕێژەکان یەکسان نین، لە کۆماری دوومینیکان (٨٠ ٪)ی بەکارهێنەری ئینتەرنێت دانیشتوانی پایتەختن، لە چین بەکارهێنەران لە شارەکانی(شەنگەهای) و بێجین یەکسانە بەژمارەی بەکارهێنەران (١٥) شاری دیکەی ئەو وڵاتە کە پەیوەندییان لاوازە و ژمارەیان (٦٠٠) ملیۆن کەسە، لە هیندستان کە یەکێکە لە گرینگترین جەمسەری نوێبوونەوە لە جیهاندا تەنیا(٠,٤٥) کەس ئینتەرنێت بەکاردەهێنن.
- ساڵی (٢٠٠١) لەنێو(٨١٦) ملیۆن کەس لە ئەفریقیا دا ئەم داتایە کۆکراوەتەوە.
  - ❖ **لە نێو(٣٩) کەس دا (١) کەس خاوەنی تەلەفزیۆنە.**
  - ❖ **لەنێو (٣٥) کەس دا (١) کەس مۆبایلی هەیە.**
  - ❖ **لەنێو (٤٠) کەس دا (١) تەلەفۆنی هەیە.**

❖ **لەنێو (٣٠) کەس دا (١) کەس کۆمپیوتەری هەیە.**
❖ **لەنێو (٦٠) کەس دا (١) ئینتەرنێت بەکاردەهێنێت.**

تەلەفۆن:

- سێ یەکەی دانیشتوانی جیهان بە هیچ شێوەیەك تەلەفۆنی بۆ پەیوەندیکردن بەکارنەهێناوە.
- ئەفریقیای نیمچە بیابانی کە (١٠٪) ی جیهان پێك دەهێنێت خاوەنی تەنها (٠,٢) تەلەفۆنە لە جیهاندا یەك ملیار هێڵی تەلەفۆنی تێیدایە.
- نرخی بەکرێدانی هێڵی تەلەفۆن لە کیشوەری ئەفریقیا نزیکەی (٢٠٪) ی داهاتی نیشتمانی تاك پێك دەهێنێت بە بەراوورد لەگەڵ ڕێژەی جیهانی کە (٩٪) یە داهاتی بەرزیش دەگاتە یەك لە (سەد) دا.
- لە هیندستان بۆ هەموو (١٠٠) کەسێك تەنها (٥) تەلەفۆن هەیە.
- لەجیهاندا زیاتر لە (١,٢) ملیار هێڵی تەلەفۆن هەیە (١.٣) ملیار بەشدار بوو لە هێڵی مۆبایل هەیە، ساڵانەش (١٤٠) ملیار دەقیقە پەیوەندی لە تەلەفۆنی نێودەوڵەتی دا.

**مۆبایل:**

- ساڵی(٢٠٠٢) ژمارەی بەشداربووانی مۆبایل لە تەلەفۆن زیاتر بوو، هێڵەکانی مۆبایل زۆر خێرا لە جیهاندا بڵاوبوونەوە بەپێی شوێن و کۆمەڵگە و داهات و تەمەن و باری ئابووری کەسەکان جیاواز دەبێت.
- ژمارەی بەشداربووانی لە بەرازیل وەك چەندین وڵاتی ئەفریقی و ئاسیا (٤٥٠) ملیۆن بەشدار بووی تێیدایە کە دەگاتە دوو ئەوەندەی بەشداربووانی هەر دوو کیشوری ئەمەریکا لە وڵاتانی نێو ڕێکخراوی ئابووری بۆ هاریکاری و گەشە پێدان، نزیکەی (٨٣٦.٥) ملیۆن بەشدار بووی مۆبایل هەیە.
- هەرچەندە نزیکەی (١٩٩) ملیۆن بەشداربووی مۆبایل لە ویلایەتە یەگرتوەکان دا هەیە، بەڵام ئەمانە ئەو (١٠) وڵاتە یەکەمانە نین کە ژمارەی بەشداربووانی مۆبایل تێیدا دەگاتە (٥٥٪) لە دانیشتوانی ویلایەتە یەگرتووەکان کە خاوەنی مۆبایلن.

- ئەفریقیا تەنها (٣٪) ی بەشداربووان لە جیهان پێك دەهێنن لە ماوەی ساڵانی(١٩٩٧-٢٠٠٢) ژمارەی بەشداربووانی مۆبایل بە ڕێژەی (١٦٠٠٪) بەرز بووەتەوە.
- لە نیکاراگوا ژمارەی بەشداربووانی مۆبایل سێ ئەوندەی خاوەن تەلەفۆنەکانە، واتە (٧٣٩) هەزار بەرامبەر (٤١٤) هەزار کەس.
- لۆکسمبۆرگ ژمارەی بەشداربووانی مۆبایل (١٢٠) کەس لە چاو دانیشتوانی (١٠٠)کەس و (٤٤) لە مالیزیا (٢٤) کەس ئەردەن و (١٣) لە فەلەستین و (٣) لە نیجیریا و (٠، ٧) لە تاجیکستان.

**پاشماوەی ئامێری ئەلیکترۆنی:**

- ساڵانە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان (٢٠٠) ملیۆن کۆمپیوتەری کۆن فڕێدەدرێت لەگەڵ ئامێری تر.
- تەنها(١١٪) کۆمپیوتەری سوڕاوەن، ڕێژەی سوڕاوی تەلەفزیۆن لەمە کەمترە.
- ویلایەتە یەکگرتووەکان لە هەموو وڵاتێکی دیکە زیاتر پاشماوەی ئەلیکترۆنی لێدەکەوێتەوە.
- نزیکەی (٨٠-٥٠ ٪)ی پاشماوە ئەلیکترۆنییەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ڕەوانەی شوێنی دیکە دەکرێت وەك چین و هیند و پاکستان بەڵام ئامێرە بەکارنەهاتووەکان لەبەر دوورکەوتنەوە لە تێچوونی سوڕاو ڕەوانی وڵاتە تازەپێشکەوتوەکان دەکرێت چ بە فرۆشتن یان بەخشین.

یەکێك لەو خزمەتگوزاریانەی ئینتەرنێت بۆ بەکارهێنەرانی دەستەبەری دەکات بریتییە لەچۆنیەتی زانینی ئەوەی چ ماڵپەڕێك زۆرترین خوێنەری هەیە، ماڵپەڕی ئەلێکسا، ماڵپەڕێکی جیهانی تایبەتە بۆ زانیینی ئەوەی کام ماڵپەڕی زیاتر دەکرێتەوە لەلایەن خوێنەرانەوە، کام ماڵپەڕ زۆرترین جار سەردانی دەکرێت. ئەم ماڵپەڕە بەسوودە بۆ ئەوەی بزانرێت بابەت و ئاگادارییەکان لە چ ماڵپەڕێك بڵاو**بکرێت**ەوە کە زۆرترین خوێنەری هەیە. ئەگەر ماڵپەڕی ئەلێکسا بکەیتەوە لە شریتی گەڕانەکەی دا ئەدرەسی ماڵپەڕێك بنووسیت، ئەوا چەندین زانیاری گرنگت بۆ ئاشکرا دەکات، لەوانەش:

أ- (Alexa Traffic Rank:) ڕیزبەندی سایتەکە لە جیهاندا واتە چەندەمین سایتە لە ڕووی زۆری سەردان و خوێنەرەوە.

ب- (Traffic Rank in IQ:) کە لە بەرامبەر ئەم نووسینەدا ڕیزبەندی سایتەکەت لە عێراق دا بۆ دەنوسێت، بێگومان هەتا ژمارەکە کەم بێت واتە ئەو سایتە لە ڕیزی پێشەوەیەیە. بۆ نموونە بەپێی ڕیزبەندی ماڵپەڕی ئەلێکسا، لە عێراق دا ماڵپەڕی فەیسبووك یەکەم سایتە کە زۆرترین بەکارهێنەری هەیە، دووەم گۆگڵە، سێیەم یوتیوبە، ئەم ریزبەندەش بە شێوەیەکی بەردەوام گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەگەر کلیك بکەیت لە (IQ) ئەوا هەموو ئەو ماڵپەڕانەت بۆ ریزدەکات کە لە عێراق دا زۆرترین سەردان دەکرێن و زۆرترین جار دەکرێنەوە. دەتوانێت ئەدرەسی ماڵپەڕی دیکە بنوسیت لە خانەی گەڕانەکەی دا و پاشان کلیك بکە لە ئایکۆنی گەڕان، زانیاری ڕیزبەندی ئەو ماڵپەڕەت بۆ دەخاتەبەردەست.

## دەروازەیەکی تیۆری بۆ میدیای نویٚ

ئامانج لەم نووسینە ئەوەیە تیشك بخەینە سەر چەمکی میدیای نویٚ و تێگەیشتنی لایەنە پراکتیکییەکانی گوزارشت لە دیاردە و سەردەمێکی نویٚ دەکەن نەك تەنها لە زانستی نوێی پەیوەندیکردندا، بەڵکو لە زۆرێك لەو چەمك و دەستەواژانەی پەیوەستن بەمجۆرە تازەیەی میدیا، لەگەڵ بەهەند وەرگرتنی ئەو ڕاستیەی زۆربەی خەسڵەتەکانی ئەم دیاردەیە هێشتا نەخەملیوە و وەکو پێویست دەرنەکەوتوون.

هەوڵدراوە بە شێوەیەکی فرەوان چەمکە پەیوەندیدارەکان بە میدیای نویٚ بخرێنەڕوو لە ئێستادا تێروانینێکی دیاریکراو لەبارەیانەوە هەیە، لە نێویاندا ئەو پێناسانەی لە ئینسکلۆپیدیا و فەرهەنگە تایبەتەکان بە تەکنەلۆژیا هاتووە، لەپاڵ خستنەڕووی چوارچێوەیەکی تیۆری بۆ میدیای نویٚ لە ڕوانگەی تێڕوانینی ژمارەیەك لەو پسپۆڕانەی سەرگەرمی لێکولێنەوەن لەو دیاردەیە، ئەوانیش نیکولاس نیگرۆپۆنتی Nicholas (Negroponte)، جۆن پاڤلیك (John Pavlik)، ڤین کرۆسبی (Vin Crosbie)، ستیڤ جۆنز (Steve Jones) بە مەبەستی هەڵوەستەکردن لە هەمبەر ئەو شۆڕشە مەزنەی میدیای نویٚ بەرپایکردوە و دەستنیشانکردنی ئەو لایەن و دەرهاویشتانەی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت.

## سەرەتا:

دەروازەگەلێك هەن بۆ لێكولێنەوە لە چەمكی میدیای نویٚ و **بەرەوپێشچوونی** كەرەستە و ئامرازەكانی لەلایەنە مێژوویی و تەكنەلۆژییەكاندا، بۆ نموونە (پاڤلیك) میدیای نویٚ لە ڕوانگەی شۆڕشی ژمارەیی و ئینتەرنێت و پراكتیك كردنیان لەم پەنجا ساڵەی دواییدا دەبینێت، هەندیٚ لە لێكۆڵەرەوان وەك (دیڤیس Davis و ئۆوین Owen) دەستپێكی ئەم بابەتە لە شێوە تازەكانی میدیا دەبینن كودەتایەكی بەسەر میدیای كۆندا هێنا وەك پرۆگرامەكانی گفتوگۆی تەلەفزیۆنی(show talk) و پرۆگرامە هەمەرەنگ و زیندووەكانی كەناڵی ئێم تی ڤی (M T V) تایبەت بە میوزیك، بۆ نموونە ئەم پرۆگرامانە گۆڕانێكی گەورەی بەسەر شاشەی تەلەفزیۆنیدا هێنا، هەریەك لە دیڤیس و ئۆوین بە بایەخەوە باسی ڕۆڵی تەكنەلۆژیای ژمارەیی و پەیدابوونی ئینتەرنێت دەكەن لە گەڵاڵەبوونی میدیای نویٚ، ئەم دوو لێكۆڵەرە بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەگەڵ لێكۆڵەرەوەكانی دیكە لەبارەی سەرەتا و مێژووی سەرهەڵدانی میدیای نویٚ.

هەندیٚ توێژەری دیكە وەك گیتلمان (Gitelman) و پینگری (pingree) سەرەتای پەیدابوونی میدیای نویٚ دەگەڕێننەوە بۆ ئەوكاتەی تەلەگراف پەیدابوو لە ساڵی (١٧٤٠)، ئەوان بیرۆكەكەیان بیناكردبوو لەسەر بنەمای (حاڵەتی ڕاگوزەری میدیا) بەمدواییە لە كۆنگرەیەك بە هەمان ناونیشان (media in transition conference) سازكرا، تاوتوێی چەمكی میدیای نوێی كرد، لەلایەن پەیمانگای ماسیوشینتسی ئەمەریكی بۆ تەكنەلۆژیا ڕێكخرابوو.

لەم لێكۆڵینەوەیە كۆمەڵێك پێناسەی بنەڕەتی و پراكتیكی بۆ واتای میدیای نویٚ دەخەینەڕوو، دواتر شەن و كەوی دەروازە جۆراوجۆرەكانی دەكەین بۆ ڕوونكردنەوەی ڕەهەند و لایەنەكانی هەروەك گرنگترین كەرەستە و ئامرازەكانی بنیاتنان و پێشكەشكردنی ئەمجۆرە نوێیەی میدیا دەخەینە ڕوو.

دەبیٚ لە سەرەتاوە دانبنێین بەوەدا ئەم میدیایە زادەی ئاوێتەبوونێكە (convergence) لە نێوان تەكنەلۆژیا كۆن و تازەكانی پەیوەندیكردن لەگەڵ كۆمپیوتەر

و تۆڕەکانی، سەرباری ناولێنانە زۆرەکانی هێشتا دوا خەسڵەتەکانی بە ڕوونی دەرنەکەوتوون، کاتێك ئەم ناوەی لێدەنرێت لەبەرئەوەیە لە زۆر ڕووەوە جیاوازە لە ئامرازە تەقلیدییەکانی پەیوەندیکردن، بۆ نموونە لەمجۆرە میدیایەدا لە یەك کاتدا لە چوارچێوەی پەیامێکی ڕاگەیاندندا دەتوانرێ دەقێکی نووسراو، وێنەی جوولاّو، فۆتۆ و دەنگ بخرێتە بەردەستی خوێنەرانی.

ئەم ناوانەی لە میدیای نوێ نراوە هەریەکەیان بۆ زەمینە و ڕەهەندە نوێیەکانی دەگەڕێتەوە، بۆ نموونە ناوبردنی بە میدیای ژمارەیی ((digital media) بۆ وەسفکردنی لایەنە پراکتیکییەکانیەتی لە بنەرەتدا پشتی بە تەکنەلۆژیای ژمارەیی وەك تەلەفزیۆن و ڕادیۆی ژمارەیی هتد بەستووە، یان بە مەبەستی ئاماژەکردن بەهەر سیستەمێك یان ئامرازێکی میدیایی لەگەڵ کۆمپیوتەر لە یەك بدرێ، هەروەك پێیدەگوترێ میدیای کارلێکردن (interactive media) مادام جۆرێك لە حاڵەتی کارلێکردن و ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری و ئەزموونە جیاوازەکان فەراهەمدەکات لە نێوان بەکارهێنەرانی تۆڕی ئینتەرنێت و تەلەفزیۆن و ڕادیۆی ژمارەیی و ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی و هتد.

هەروەها میدیای ڕاستەوخۆ و زیندووی ئینتەرنێتیشی پێ دەگوترێت لەسەر هێڵەکانی پەیوەندیکردن

(online media) لە ڕوانگەی گرنگیدان بە لایەنە پراکتیکییەکانی ئینتەرنێت، هەروەها پێشیدەگوترێ ئامرازە سایبەرونییەکان (cyber media) لە دەربڕینی بۆشایی ئاسمانی سایبەروونیەوە هاتووە (cyberspace) ئەم ناوە نووسەری ڕۆماننوسی ئەندێشەی زانستی ولیەم گیبسۆن (William Gibson)) لە رۆمانەکەی ناوی لێناوە ساڵی (١٩٨٤) ناوی (Neuromancer)ی بەکارهێنا کە لە زانستی سایبەروونیتیك وەرگیراوە (cybernetics) بە کوردی پێیدەگوترێت (زانستی کۆنترۆڵکردنی ئامێری)، دەربڕینی (سایبەرمیدیا) گوزارشتە لەو جیهانەی دروستکراوە لە زانیارییەکان، ئەو زانیارییانەی شێوەی ماددە وەردەگرن بەوپێیەی لەسەر ئاستی نیشتمانی و نێودەوڵەتی بازارێکی گەورە پێکدەهێن، بۆتە سەرچاوەیەکی گرنگی هێز و داهاتی دارایی و مەعریفی زۆرێك لە کۆمپانیا و وڵاتە پێشکەوتووەکان، هەروەك گوزارشتە بۆ بەکارهێنانە ئەلیکترۆنییەکان شوێنی کار و کارامەییەکانی ئادەمیزادیان گرتۆتەوە، بەڵام لێرە زیاتر بۆ وەسفی فەزای زانیارییەکان لە تۆڕی ئینتەرنێت دێت.

میدیای نوێ بە میدیای زانیارییەکان ناودەبرێ (info media) وەك هێماکردن بۆ ئاوێتەبوونی نێوان کۆمپیوتەر و میدیا، دواجار پەیدابوونی سیستەمێکی میدیایی نوێ سوود لە پێشڤەچوونی تەکنەلۆژیای زانیارییەکان وەردەگرێت و لەگەڵی تێکەڵدەبێت، پێیدەگوترێت میدیای ئامرازە تێکچڕژاوەکان (hyper media) ئەمە لەبەرئەو تێکچڕژان و بەیەکداچوونەی لەمجۆرە میدیایە بەدیدەکرێ توانای دروستکردنی تۆڕێکی زانیاری بەیەکەوە بەستراوی هەیە لە ڕێگەی دانانی چەندین لینکی جۆراوجۆر لە ناو جەستەی یەك بابەتدا (hyperlinks) ئێمە لێرە لە بەردەم یەکێك لە تایبەتمەندیی و خەسڵەتە سەرەکییەکانی میدیای نوێداین بە هیچ شێوەیەك لە توانای میدیا کلاسیکییەکانی دیکە نیە، هەروەك هەندێ لەلایەنە پراکتیکییەکانی ئەو میدیایە پێیدەگوترێ مەڵتیمیدیا (multimedia) بەوپێیەی لە یەك بابەتی میدیایی کە بڵاودەکرێتەوە دەق و وێنە و ڤیدیۆ و دەنگ و رەگەزە تایپۆگرافییەکانی دی تێکەڵاوکراون.

تێبینی ئەوە دەکەین هەندێ لەو ناوانە پەیوەستن بە بەکارهینانەکانی کۆمپیوتەر، هەندێکیان دەرچوونە لە سروشتی ئامرازێکی پەیوەندیکردن، هەندێکشیان سنوری ئەزموون و شارەزایی ڕۆشنبیریان تێپەڕاندووە و ئەستەمە ناوێکی هاوتای بۆ دابنرێ لە دەرەوەی ئەو ژینگەیەی لێی پەیدابووە، هەندێ لە ناوەکان ئاماژەن بۆ لایەنێکی بەکارهێنانەکانی میدیای نوێ یان یەکێك لە خەسڵەتەکانی، ئەو ناوانەی خەسڵەتەکانی تۆڕی ئینتەرنێت دەردەخەن، بە شێوەیەکی گشتی زەمینەی پێناسەکردنی میدیای نوێ فرەوان دەکات.

هەندێ پێناسەی سەرەتایی بۆ میدیای نوێ:

فەرهەنگی تەکنەلۆژیای باڵا (high-tech dictionary) میدیای نوێ بەمشێوەیە پێناسەدەکات "پێکەوە بەستنەوەی کۆمپیوتەر و تۆڕەکانی کۆمپیوتەرە لەگەڵ مەڵتیمیدیا".

بەگوێرەی پێناسەی لیستەر (lester) "میدیای نوێ بریتییە لەو تەکنەلۆژیانەی پەیوەندیکردن لە ئەنجامی ئاوێتەبوونی نێوان کۆمپیوتەر و ئامرازە تەقلیدییەکانی ڕاگەیاندن وەك چاپەمەنی و وێنەگرتنی فۆتۆگرافی و دەنگ و ڤیدیۆ پەیدابووە".

فەرهەنگی کۆمپیوتەر (computimg dictionary) بە دوو لایەن پێناسەی دەکات:

١. "میدیای نوێ تێکەڵێکە لە بەکارهێنانەکانی پەیوەندیکردنی ژمارەیی و بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی لەسەر سیدی و دی ڤی دی بە گشت جۆرەکانی و تەلەفزیۆنی ژمارەیی و ئینتەرنێت. ئاماژەیە بۆ بەکارهێنانی کۆمپیوتەرە کەسییەکان و لاپتۆپ، جگە لە بەکارهێنانی پەیوەندی بێتەل و مۆبایل لەم بوارەدا، کۆمپیوتەر خزمەت بە بەکارهێنانی میدیای نوێ دەکات، **وادەکات** لە ڕێگەی ئاوێتەکردنی ژمارەیی( Digital convergence) دەتوانرێ کار بە دەنگ و ڤیدیۆ **بکرێ** لە هەمان کاتیشدا چارەسەری دەقە نووسراوەکان و ئەنجامدانی پرۆسەی پەیوەندیکردنی تەلەفۆنی ڕاستەوخۆ لەهەر کۆمپیوتەرێکدا **بکرێت** ".

٢. " ئاماژەیە بۆ ڕێگا نوێیەکانی پەیوەندیکردن لە فەزایەکی ژمارەییدا بەوەی ڕێگا دەدات بە گروپ و کۆمەڵە بچووکەکانی تر بۆ بەیەکگەیشتن و کۆبوونەوە لەسەر ئینتەرنێت، ئاڵوگۆڕی سوود و زانیاری لە نێوان یەکتر بکەن، هەروەك ژینگەیەکە ڕێگادەدات بە هەمووان دەنگی خۆیان و کۆمەڵگەکانییان بە جیهان بگەیەنن ".

فەرهەنگی بچووکی ئینتەرنێت (condensed net glossary) میدیای نوێ بەوە پێناسەدەکات " بریتییە لە ئامرازەکانی میدیای ژمارەیی، یان دروستکردنی ڕۆژنامەوانی لەسەر ئینتەرنێت، ئاماژە بۆ ئامێرەکانی میدیای کۆنیش دەکات، دەربڕینێکە بۆ وەسفکردنی ئامرازەکانی میدیای کۆن: چاپەمەنی، تەلەفزیۆن، ڕادیۆ، سینەما ".

بەپێی ئینسکلۆپیدیای ئینتەرنێتی ناسراو بە وێبۆپیدیا (webopedia) میدیای نوێ ئاماژەیە بۆ "جۆرەها شێوەی تازەداهێنراو لە سیستەمی پەیوەندیکردنی ئەلیکترۆنی وایلێهاتووە بەردەستبێت بەهۆی کۆمپیوتەر، هەروەك میدیای نوێ پەیوەستە بەسیستەمە ڕاگەیاندنە کۆنەکان، ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان ڕۆژنامەوانی کۆن لە دەق و وێنەکانیدا سیفەتی بێ جوڵەیی دەبینرێ، لە بەرامبەردا لە میدیای نوێ هەست بە داینامیکی بوون دەکەین، میدیای نوێ لە گۆڕانکاری و نوێبوونەوەیەکی بەردەوامدایە، لەگەڵ توانای ئەنجامدانی پەیوەندیکردن بە ئامرازە جیاوازەکان، لە ڕێگەیەوە دەتوانرێت زانیاری بگوازرێتەوە هەندێکیان بە ڕێگای پەیوەندیکردن لە کەسێکەوە بۆ یەکێکی دیکە (POINT-TO –POINT)، بۆ نموونە پەیوەندیکردن بە تەلەفۆن، یان لە کەسێکەوە بۆ کۆمەڵێك (POINT TO MANY)،

بۆ نموونە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ، هەرچی میدیای نوێ و بەکارهێنانەکانیەتی بە تایبەتی ئینتەرنێت، ئەوا ئەمجۆرە گۆڕانگارییەی بە شێوەیەکی ریشەیی بەسەردا هاتووە، بەوپێیەی ئینتەرنێت توانی بگاتە گشت شێوەکانی پەیوەندیکردن.

ئەگەرچی جۆنز (jones) داندەنێت بەوەی هیچ وەلامێکی کۆتایی بۆ ئەو پرسیارە نییە دەڵێت:(میدیای نوێ چییە؟)، هەر بۆیە وەلامەکانی لەسەر ئەوە بنیاتدەنێت دەڵێ میدیای نوێ لە سەرەتای قۆناغی دروستبوونیدایە، میدیای نوێ زاراوەیەکە بۆ وەسفکردنی شێوەی هەندێ لە جۆرەکانی پەیوەندیکردنی ئەلیکترۆنی بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر لە میدیای کۆن کە بریتی بوو لە ڕۆژنامەوانی نووسراو لە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و هەندێ لە ئامرازە نەجولاوەکان (Static). جیاوازی میدیای نوێ لەگەڵ کۆن لە بوونی توانای گفتوگۆ و قسەکردنە لە نێوان هەر دوولای پرۆسەی پەیوەندیکردن (نێرەر و وەرگر). لەگەڵ ئەوەش مەوداکان لە نێوان میدیای نوێ و کۆن زۆر کەمبۆتەوە لەبەرئەوەی خودی میدیای کۆن سەرلەنوێ لەژێر ڕۆشنایی ئەو گۆڕانە نوێیانە بنیاتنراوە و پێداچوونەوەی بۆ کرا تاوەکو لەگەڵ میدیای نوێ لە هەندێ لایەنیدا یەك بگرێتەوە.

کۆلیژی شریدانی تەکنەلۆژی (Sheridan) پێناسەیەکی پراکتیکی بۆ میدیای نوێ دادەنێ بەوەی "هەموو جۆرە ڕاگەیاندنێکی ژمارەیی بە شێوەی ژمارەیی و کارلێکردن پێشکەشدەکرێت".

دوو حاڵەت هەن میدیای نوێ و کۆن لێك جیادەکەنەوە، یەکەم دەربارەی چۆنیەتی بلاوکردنەوەی بابەتی میدیای نوێ، دووەم سەبارەت بە چۆنیەتی گەیشتن بە خزمەتگوزارییەکانی میدیای نوێ، ئەمجۆرە میدیایە پشت بە **تێکەڵکردنی** دەقە نووسراو و وێنە و ڤیدیۆ و دەنگ لە جەستەی یەك بابەتی ڕۆژنامەوانیدا دەبەستێت، جگە لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر وەك ئامێرێکی سەرەکی لە کرداری بەرهەمهێنان وپێشکەشکردن.بەلام ئاست و مەودای کارلێکردن جیاوازی سەرەکیە جیایدەکاتەوە وەك یەکێك لە گرینگترین خەسڵەتەکانی.

**بەشەکانی میدیای نوێ**

لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانین میدیای نوێ بکەین بە چوار بەشەوە ئەمانەن:

١- میدیای نوێ لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت (ONLINE) بەکارهێنانی تایبەتمەندییەکانی ئەمجۆرە سەرلەبەری نوێیە و بێ پێشینەیە، زۆر بە خێرایی نەشونما دەکات و کۆمەڵێك بەکارهێنانی بێ سنوری لێ دروستدەبێت.

٢- میدیای نوێ لەسەر بنچینەی ئامرازە هەڵگیراوەکان دروستدەبێت، ئەویش ئامرازەکانی خوێندنەوەی پەڕتوك و ڕۆژنامەکان دەگرێتەوە کە زۆر بەخێرایی گەشەدەکات و زۆر جۆری بەکارهێنانی لێ دروست دەبێ، لەسەر جۆرەها ئامێری هەڵگیراوی وەك مۆبایل و ئامرازە ئەلیکترۆنییەکانی دیکە.

٣- جۆرێکی دیکەی میدیای نوێ پشت بە ئامرازەکانی میدیای کۆن دەبەستێت، هەندێ تایبەتمەندیی نوێی بۆ زیادکراوە وەك کارلێکردن و ژمارەیی بوون و **وەڵامدانەوەی** داواکاری.

٤- میدیای نوێ پشتبەستوو بە کۆمپیوتەر (Offline) ئەمجۆرە لە ڕێگەی تۆڕەکانی کۆمپیوتەر بەکاردێت یاخود لە ڕێگەی هۆیەکانی پاراستن و خەزنکردنە جۆراوجۆرەکانی وەك سیدی و دی ڤی دی و هتد.

بە سادەیی دەتوانین میدیای نوێ یان میدیای ئەلیکترۆنی بناسێنین "بەو هەواڵ و زانیارییانەی بە شێوەیەکی ئەلیکترۆنی دەگوازرێتەوە بە بەکارهێنانی ئینتەرنێت یان یەکێك لە خزمەتگوزارییەکانی"

**تایبەتمەندییەتەکانی میدیای نوێ**

- خێرایی.
- سەربەخۆیی لە بیرکردنەوە.
- ڕوونی لە دیاریکردن و بە دەستهێنانی ئامانج.
- ئەرشیفکردن و زانیاری قوڵ و بەربڵاو.
- گەڕانی زیرەکانە.
- پێشکەوتنی خێرا و خێرایی لە داهێنان یان جێبەجێکردن.

دەرکـــەوتنـــی هـــەر ئامراز و ڕێگایـــەکـــی نوێی پەیوەندیکردن لـــە مێـــژوودا لە بایەخ و ڕێگا کـــۆنـــەکـــانی پێـــش خـــۆی کـــەمنـــاکـــاتەوە، چونکە دەرکـــەوتنـــی ڕادیۆ نەبووە هـــۆی نـــەمـــانـــی ڕۆژنامەی نووســـراو، دەرکـــەوتنـــی تـــەلـــەفزیۆن ڕادیۆی وون نـــەکـــرد، دەرکـــەوتنـــی ئینتەرنێت نەبووە هۆی نـــەمـــانـــی کـــەنـــاڵـــەکـــان، بـــەڵام ئێســـتا لەوە دڵـــنیـــا بووین هـــەر ڕێگایـــەکـــی نوێی ڕاگەیاندن بـــەشێـــکـــی زۆر بینـــەرانـــی ڕاگەیاندنە کـــۆنـــەکـــە بـــۆ خـــۆی ڕادەکێشێـــت.

لەم هەموو پێناسانەی ڕابردوو سەختە بتوانین پێناسەیەکی گشتگیر بۆ میدیای نوێ دابنێین لەبەر چەند هۆیەك. ئەویش ئەوەیە ئەم ڕاگەیاندنە لە ڕاستیدا گوزارشتە لە قۆناغێکی ڕاگوزەر و هێشتا تێڕوانین لەبارەی ئامراز و بەکارهێنانەکان و تایبەتمەندییەکان بە شێوەیەکی گشتی ڕوون نین و تێگەیشتنی تەواو لەبارەیانەوە گەڵاڵەنەبووە. ئەمجۆرە میدیایە تاکو ئێستا بەخێراییەکی زۆر هەر لە باری پەرەسەندن و بەرەوپێشچوونە، بەجۆرێك ئەوەی ئەمڕۆ نوێیە بۆ بەیانی کۆن دەبێت. ئەگەر بمانەوێت پێناسەیەك بۆ میدیای نوێ دابنێین لەسەر بنەمای ئامرازە تازەکانی ئەوا لەگەڵ داهێنانی هەر ئامرازێکی نوێ ئەو پێناسەیە بەشێکی زۆر مانا و ناوەڕۆکەکەی لە دەستدەدات، بەمەش دانانی پێناسەیەکی یەکلاکەرەوە و گشتگیر زۆر دژوارە، بەڵام کارەکە ئاسانتر دەبێت ئەگەر پێناسەکە لەسەر بنەمای تایبەتمەندییەکانی میدیای نوێ بنیاتبنێین کە میدیای نوێ جیادەکاتەوە بە تایبەت نیمچە ڕێککەوتنێك هەیە لەسەر کۆمەڵێك لە تایبەتمەندییەکانی، دواتر بەدرێژی لەسەری دەوەستین.

دەکرێ کۆی ئەو پێناسانەی خستمانە ڕوو لێرەدا لە یەك پێناسەی گشتگیر کە نیمچە ڕێککەوتنێکی لەسەرە پوخت بکەینەوە بەوەی میدیای نوێ ئاماژەیە بۆ "ئاوێتە و هەمە چەشنییەك لە شێوە و تەکنەلۆژیا و تایبەتمەندی کە ئامرازە نوێیەکان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە بە تایبەتی زەقکردنەوەی باری تاکایەتی (Individuality)، ڕەچاوکردنی تایبەتمەندی **تاکەکەسی** (customization)، کە هەردووکیان بەرەنجامی یەکێك لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی میدیای نوێیە ئەویش (کارلێکردن)ە"، لەبەرئەوە ئەگەر میدیای جەماوەری (Mass media) بە میدیای سەدەی بیستەم ناودەبرا، ئەوا میدیای **تاکەکەسی** میدیای سەدەی بیست ویەکە، ئینتەرنێت یەکێکە لە ئامرازە

سەرەکییەکانی ئەم میدیایە وایکردوە لە توانای هەموو کەسێکدا بێت، بگەڕێت بەدوای ئەو گۆرانی و بەرنامە تەلەفزیۆنی و فیلمە سینمایی و زانیارییە ڕۆژنامەوانی و زانستییەی دەیەوێ و پێویستیەتی و دەستخستنێتی لە هەمان کاتدا.

بەڵام بەرلەوە پێویست دەکات ڕێککەوین لەسەر ئەوەی میدیای نوێ تەنها ئینتەرنێت نیە، لەبەرئەوەی بەشێك لە بەکارهێنانەکانی میدیای نوێ تەواو دوورە لەو بنەمایانەی لەسەر تەکنەلۆژیای ئینتەرنێت بنیاتنراوە، میدیای نوێ لە دووتوێیدا ژمارەیەك تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن لەخۆیدەگرێت دوای دەرکەوتنی یەکەم بەکارهێنانی بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی لە دەق و وێنە نەجوڵاوەکان لە سیستەمی کۆمپیوتەر و تۆڕە داهێنراوەکان تادەگاتە بەکارهێنانە بێ پێشینەکانی بواری پەیوەندیکردن لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

لێرەدا کۆمەڵێك لەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانە پوختدەکەینەوە میدیای نوێ جیادەکاتەوە لەوانەی پێش خۆی، لە دیارترین ئەو خەسڵەتانەش ئاوێتەکردنی ئامرازە کۆن و نوێیەکانە لە یەك شوێندا، لەسەر کۆمپیوتەر و تۆڕەکانی زانیاری، ئەو ئاوێتەکردنەی کودەتایەکی بەسەر شێوە و کایە تەقلیدییەکانی پرۆسەی پەیوەندیکردن هێنا، بەجۆرێك بواری لە بەردەم تاك رەخساند پەیامەکانی بگەیەنێ بەو کەسانەی دەیەوێ لەو کاتەی خۆی **دیاریدەکات**، بە ڕێگای فرەئاڕاستە، نەوەك لەسەرەوە بۆ خوارەوە کە مۆدێلی کلاسیکی پەیوەندیکردنی لەسەر بنیاتنرا بوو، سەرباری ئەوەی ئەم میدیایە پشتدەبەستێت بە تەکنەلۆژیای ژمارەیی و کارلێکردن و هایپەرلینك و بەکارهێنانی واقیعی گریمانەیی، بەکارهێنانی رەگەزەکانی مەڵتیمیدیا، لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندی و ئاڕاستە **تاکەکەسییەکان** و تێپەڕاندن و کاڵکردنەوەی چەمك و تێگەیشتنەکانی سەروەری دەوڵەتی نیشتمانی و سنوری نێوان دەوڵەتان.

## چوارچێوەیەکی تیۆری بۆ تێگەیشتن لە میدیای نوێ

لێرەدا کۆمەڵێك تێڕوانینی تیۆری دەربارەی میدیای نوێ دەخەینەڕوو بۆ تێگەیشتن لە دەروازە و ئاراستە سەرەکیەکانی، بەشێك لەو تێڕوانینانەی لێرە خستوومانەتەڕوو بایەخی بە لایەنە پەیوەندیدارەکانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن داوە، بەشێکی دیکە لە پسپۆڕان لە ڕوانگەی لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکان و هتد سەیری بابەتەکە دەکەن، هەموو ئەو بۆچوونانەش وەك دەروازەیەك وایە بۆ تێگەیشتن لە

تایبەتمەندییەکانی میدیای نوێ و ئەو لێکۆڵینەوانەی لەو بوارەدا کراون، بۆچوونەکانی نیگرۆپۆنتی و پاڤلیل و گرۆسپی و مانۆڤیچ و دیڤیس و ئۆوین باسدەکەین.

**ڕوانگەی نیگرۆپۆنتی بۆ تێگەیشتن لە میدیای نوێ**

نیگرۆپۆنتی (Negroponte) ئەو تایبەتمەندییانەی میدیای نوێ جیادەکاتەوە لە ئامرازە کۆنەکانی میدیا و کورتیدەکاتەوە لە " ئاڵوگۆڕ کردنی یەکە ماددی و ئەنەلۆگییەکان بە ژمارەیی، یان ئاڵوگۆڕکردنی گەرد و زەڕەکان بە بایت ( Bits not Atoms)، وەك ئامرازی سەرەکی بۆ هەڵگرتنی زانیارییەکان و دواجار گەیاندنی لە شێوەیەکی ئەلیکترۆنی نەك بە شێوە فیزیاییەکەی جاران، ئیدی وشە و وێنە و دەنگ و ڤیدیۆ و هتد بەم ڕێگە نوێیە بڵاودەکرێنەوە و دابەشدەکرێن لە بری دابەشکردنی لە ڕێگەی کاغەز و لە چوارچێوەی سندوقە داخراوەکاندا.

سەبارەت بە توانای میدیای نوێ لەسەر دواندنی ژمارەیی **دوولایەنە** ( Digital Address ability)، کە گوزارشتە لە مۆدێلێکی پێشکەوتوو لە پرۆسەی گواستنەوەی ژمارەیی زانیارییەکان لە کۆمپیوتەرێك بۆ کۆمپیتەرێکی دیکە لەوەتەی بە ژمارەیی کردنی خودی کۆمپیوتەر لەدوای جەنگی جیهانی دووەم پەیدابووە، بەڵام دواتر ئەم لایەنە پێشکەوتنێکی گەورەی بەخۆوەبینی بۆ دروستکردنی تۆڕیکی بەرفرەوان لە نێوان ژمارەیەکی بێئەندازە لە کۆمپیوتەر، ئەمە لەلایەك لە ئاست خواست و ئارەزووە **تاکەکەسییەکان** دەبێت (Individual Interest)، لەلایەکی ترەوە تێرکردنی پێویستی و خواستە گشتییەکان، ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت میدیای نوێ توانای دواندنی **دوولایەنەی** پێویستی و ئارەزووە کەسی و گشتییەکانی هەیە، کارێکی وەها نەدەتوانرا لە میدیای کۆن بە ئەنجام بگەیەنرێت.

تایبەتمەندییەکی پڕ بایەخی ئەم میدیایە دەرچوونیەتی لە نێو کۆتوبەندی دەسەڵاتی سیاسی کە خۆی لەسەرکردەکانی کۆمەڵگە و دەوڵەت دەبینێتەوە، ئیدی ئەم میدیایە لەدەستی خەڵکدایە، هەرکەسێ بیەوێ بەکاریبهێنێ و سوودی لێوەربگرێ و دەنگی ببیسترێ، بە پێچەوانەی میدیای کۆن تا سەردەمانێکی نزیك لەلایەن دەوڵەت و حیزب و کەسە دەست ڕۆیشتووەکان قۆرخکرابوو بۆ ئاڕاستەکردنی ڕای گشتی بەگوێرەی بەرژەوەندەییەکانی خۆیان.

ئەو شۆڕشە گەورەیەی لە بواری میدیاییدا لە هەنگاوی یەکەمیدا بە شێوەیەکی لاوەکی لە داهێنانی گۆتنبێرگ بۆ چاپخانە دەستیپێکرد، دواتر بە داهێنانی تەلەگراف و سەرهەڵدانی ئینتەرنێت سیمایەکی کامڵتری وەرگرت، بە کۆکردنەوەیان لە یەك پرۆسەی پەیوەندیکردنی دەستەجەمعیدا.

## کرۆسپی و مۆدێلێکی نوێی پەیوەندیکردن

ڤین کرۆسپی هاوڕایە لەگەڵ نیگرۆپۆنتی، بەراوردێکی سێ لایەنە دەکات لە نێوان میدیای نوێ و میدیای کۆن سەبارەت بە مۆدێلە کلاسیکییەکانی پەیوەندیکردن، هەر لە مۆدێلی پەیوەندیکردن لە نێوان مرۆڤ تەنانەت لە نێوان زیندەوەرانی دیکەش کە بە پەیوەندیکردنی کەسی ناودەبرێت (Interpersonal Communication) ئەم ئاستەی پەیوەندیکردن پێویستی بە ئامرازە تەکنەلۆژییەکان نیە بۆ ئەنجامدانی، دوو حاڵەتی جیا کەرەوەی هەیە:

### مۆدێلی یەکەم: پەیوەندیکردنی کەسی

- هەر تاکێك لە **دوولایەنە**کەی پەیوەندیکردن یەکسانن لە توانای کۆنترۆڵکردنی پەیوەندییەکە و پەیامە ئاڵوگۆڕکراوەکان لە نێوان هەردوولا.
- پەیام و ناوەڕۆکەکە هەڵگری ئەو هێمایانەیە جەخت لەسەر حاڵەتی تاکایەتی دەکەنەوە، پێویستی و بەرژەوەندییەکانی خاوەنی پەیامەکە دەستەبەردەکەن، هەروەها قازانج و زیانەکان لە نێوانیان.
- یەکسان بوون لە نێوان کۆنترۆڵکردن و خەسڵەتی تاکایەتی کەمدەبێتەوە لە حاڵەتی زیادبوونی ژمارەی بەشداربووان لە پرۆسەی پەیوەندیکردن.

لەبەر ئەمە ئەم مۆدێلە تەنها بۆ پەیوەندیکردنی تەنها دوو کەس گونجاوە، بۆیە شارەزایانی پەیوەندیکردن ناویان لەم مۆدێلە ناوە پەیوەندیکردن لە خاڵێك بۆ یەکێکی تر (one – to – one).

## مۆدێلی دووەم: پەیوەندیکردنی بە کۆمەڵ

ئەم پەیوەندیکردنە جەماوەریە، زۆرێك هەن بە هەڵە وای بۆ دەچن ئەم مۆدێلەی پەیوەندیکردن یەکێکە لە دەرهاوێشتەکانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژی، لەبەرئەوەی ئەم مۆدێلە هاوشێوەی مۆدێلی پەیوەندیکردنی کەسی بەر لە شۆڕشی تەکنەلۆژیا هەبوون، سەرەتای ئەم مۆدێلە دەگەڕێتەوە بۆ ڕێگا و شێوازی پەیوەندیکردنی سەرکردەی کۆمەڵگە کۆنەکان و شا و پێشەوا ئاینییەکان بەژێردەستە و شوێنکەوتوانیان، هەرچی تەکنەلۆژیایە ئەوا مەودای پەیوەندیکردنەکەی گەیاندە ئاستێکی جیهانی.

لە کەرەستە کلاسیکییەکانی ئێزگە و تەلەفزیۆن و سینەما و هاوشێوەکانی دروستدەبێت لە ڕوانگەی پەیوەندیکردنی خاڵێك یان تاکێك بە کۆمەڵێك، بۆ نموونە لە پیاوێکی ئایینی یان سەرکردەیەك بۆ ژمارەیەك لە خەڵك کە دەکرێ چەندین ناویان لێبنرێت وەك گوێگر، خوێنەر، بینەر، ئەمە وایکردوە پسپۆڕان ناو لەم پەیوەندیکردنە بنێن لە تاك بۆ کۆمەڵ (One – to – many media) کە چەند تایبەتمەندییەکی هەیە:-

- هەمان پەیام دەگاتە هەموو جەماوەرەکە.
- کۆنترۆڵکردنی ناوەڕۆکی پەیوەندیکردنەکە بەدەست نێرەری پەیامەکەیە.

ئەمە مانای وایە بەگوێرەی ئەم مۆدێلە:

- ناکرێ پەیام جیابکەینەوە لە بەدیهێنانی خواست و بەرژەوەندی هەریەك لە تاکەکان.
- تاك دەبێت کۆنترۆڵی ئەو پەیام و ناوەڕۆکە بکات کە پێیدەگات.

## مۆدێلی سێیەم: میدیای نوێ

میدیای نوێ بەگوێرەی بۆچوونی (کرۆسپی) ئەم تایبەتمەندییانەی هەیە:-

- پەیامە تاکەکەسییەکان دەکرێ لە یەك کاتدا بگاتە ژمارەیەکی بێئەندازە لە خەڵك.
- هەریەك لەوان هەمان توانای کۆنترۆڵکردنی هەیە بۆ پەیامەکان و دەرفەتی یەکسانیان لە بەردەمدایە لە بەشداریکردن لە پەیامە ئاڵوگۆڕکراوەکان.

بە گوزارشتێکی دیکە، میدیای نوێ جیاوازە لە دوو مۆدێلەکەی تری (کەسی و دەستەجەمعی)، بێئەوەی خەسڵەتە نەرێنییەکانی ئەوان هەڵبگرێت، لەگەڵ ئەوەش لە میدیای نوێدا هیچ رێگریەك نیە لە بەردەم تاك کە پەیوەندی بە کەسێکی ترەوە بکات و پەیامێکی ئاڕاستەبکات، هەروەك هیچ رێگری نیە لە بەردەم تاك کە پەیامێك ئاڕاستەی کۆمەڵێك خەڵك بکات،لەگەڵ توانای بەخشینی تایبەتمەندیی بە ناوەڕۆکی پەیامەکە بۆ هەریەك لەوان.

## بۆچوونەکانی کرۆسپی بۆ تواناکانی میدیای نوێ

کرۆسپی دەڵێت: " بۆ ئەوەی لەو توانایانە تێبگەین لە هەژموونی میدیای نوێدا هەن، پێویستە ئەوەمان لە بیربێت ملیۆنەها کۆمپیوتەری بەستراو بە ئینتەرنێت کاردەکەن بۆ دەستخستنی زانیاری و جیاکردنەوە و گواستنەوەی بۆ ژمارەیەکی بێشومار لە خەڵك، ئەوانیش دەتوانن لە یەك کاتدا پەیوەندی بە یەکترەوە بکەن (Simultaneously)، لە ژینگەیەکدا بە شێوەیەکی یەکسان دەرفەت دەداتە هەموو بەشداربوویەك، نێرەر بێت یان وەرگر بۆ کۆنترۆڵکردنی پەیام و بەشداریکردن.

کاتێك هەریەك لە ئێمە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت سەردانی ماڵپەڕێك لە ڕۆژنامەیەکی ئەلیکترۆنی دەکات، لەو ڕۆژنامەیەدا تەنها هەواڵ و بابەتی گشتی بەدیناکەین، بەڵکو بەشێك لە ماڵپەڕەکە تەرخانکراوە بۆ پڕکردنەوەی پێویستییە **تاکەکەسییە**کانی بەکارهێنەر، ئەمە بۆ ئەو کەسە نیە بەتەنها، بەڵکو بەخشینی ئەم تایبەتمەندییە بۆ ملیۆنەها کەس لە یەك کاتدا ئەنجامدەدرێت، ئەو کارەی نەدەکرا لە سیستەمەکانی پەیوەندیکردن لە ڕابردوودا دەستەبەربکرابایە، لە داهاتووی نزیکیش هەڵکشانی هێز و هەژموونی میدیای نوێ خۆی لە داهێنان و بڵاوکردنەوەی میکانیزمی تەواو نوێ دەبینێتەوە بۆ بەرهەمهێنان و دابەشکردن، ڕەنگە سەرلەنوێ کۆمەڵێك تێگەیشتنی نوێ بۆ فۆڕمەکانی میدیا و ناوەڕۆکەکەی بێنێتەکایەوە.

## ڕوانگەی دێڤیس و ئۆوین و پۆلێن کردنی میدیای نوێ

بە پێی ئەو بۆچوونانەی خستمانەڕوو لە ڕوانگەی نیگرۆپۆنتی و کرۆسپی و ئەو پێناسانەی لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێیانکرد، پۆلێنی میدیای نوێ لە نێوان دوو حاڵەت کرابوو، نوێ بەرامبەر کۆن، لە نێوان ئەنەلۆك و ژمارەیی، لە نێوان قۆناغی بەر لە ئینتەرنێت و دوای ئینتەرنێت، ئەم پۆلێنکردنە جۆرێك لە ناواقعیەتی پێوەدیارە، بەوپێیەی هەڵوەستەی نەکردوە لەسەر ڕووە لەیەکچووەکانی نێوان میدیای کۆن و نوێ، ئەو شێوە دەربرینە لێکچوانەی گوزارشت لە هەردووکیان دەکات، ئەو تەکنەلۆژیایەش لە هەردوو جۆر بەکارهاتووە، مادام لە ئێستادا بەشێکی زۆری ئامرازە سەرەکییەکانی ڕابردوو هەمان ئەو ئامرازە سەرەکییانەی میدیا پێکدەهێنن، بە تایبەت دوای ئەوەی بەشێك لەو ئامراز و میدیانە هەڵگری هەندێ خەسڵەتەکانی میدیای نوێن لە ڕووی ئەرك و ئامانج و تەکنەلۆژیای بەکارهاتووەوە، بۆ نموونە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکان تەنها نەگۆڕدراونەتە سەر سیستەمی ژمارەیی و بە مانگە دەستکردەکان و تۆڕی شەپۆلە ڕووناکییەکان نەبەستراونەتەوە کە دوو خەسڵەتی میدیای نوێن، بەڵکو بوونەتە دوو ئامرازی کارلێکردن و لەسەر کۆمپیوتەر کاردەکەن، ئەمە خەسڵەتێکی سەرەکی میدیای نوێیە، سەرباری ئەوەی بەهۆی ئامادەبوونی میدیای نوێ و گواستنەوەی ڕاستەوخۆ و زیندوو لە شوێنی ڕووداوە گەورەکان کە بووە خاڵێکی وەرچەرخانی مەزن لە کۆتایی سەدەی رابردوو بە تایبەتی لە جەنگی ئەفغانستان و عێراقدا.

بە هەمان شێوە ڕۆژنامەوانی چاپکراو شێوازی بەرهەمهێنانی خۆی گۆڕیوە بە جۆرێك پشت بە سیستەمی ژمارەیی دەبەستێت لە هەنگاوەکانی نووسینی ڕۆژنامەوانی و چارەسەرکردنی وێنە و قۆناغەکانی بەر لە چاپدان، بە هەمان شێوە ڕێگەی نووسینی هەواڵ و دەرهێنان و بەکارهێنانی ڕەنگەکان و چاپەمەنی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە چاپدانی ژمارەیی وایکردوە یەك چاپی ڕۆژنامەیەك لە چەند شوێنێکی دونیا لە یەك کاتدا چاپ**بکرێن** و بڵاو**بکرێتە**وە، ئەوەی دەمێنێتەوە بریتییە لە خۆ رزگارکردن لە کاغەز، ئەوە ئەگەرێکی کراوە دەبێت لە سایەی هەوڵە بەردەوامەکان بۆ داهێنانی کاغەزی ئەلیکترۆنی و ئامێرەکانی تایبەت بە خوێندنەوەی ورد.

هەریەك لە ریچارد دێڤیس (Richard Davis) و دیانا ئۆوین (Diana Owen) لە کتێبە هاوبەشەکەیان (میدیای نوێ و سیاسەتی ئەمەریکا) پۆلێنی میدیای نوێ دەکەن بۆ سێ جۆر:

- میدیای نوێ بە تەکنەلۆژیای کۆن.
- میدیای نوێ بە تەکنەلۆژیای نوێ.
- میدیای نوێ بە تەکنەلۆژیای تێکەڵ.

**یەکەم: میدیای نوێ بە تەکنەلۆژیای کۆن:**

هەردوو لێکۆڵەر وایدەبینن مۆدێلی میدیای نوێ بەگوێرەی ئەم پۆلێنە خۆی لە چەند شێوەیەکی وەك ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، ڕۆژنامە دەبینێتەوە، نموونە دێنێتەوە بە گفتوگۆی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ دەیەی سێیەمی سەدەی ڕابردوو، (فرانکلین رۆزفێلت) سەرۆکی ئەوسای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ڕادیۆی بەکاردەهێنا وەك ئامرازێکی سەرەکی گفتوگۆکردن لەگەڵ خەڵك، گوتار و گفتوگۆکانی لەسەر ئاستێکی فرەوان گوێی بۆ دەگیرا. تەلەفزیۆن وەك ڕادیۆ گۆڕانکاری زۆری بەسەر خۆی داهێنا لە ڕێگەی بەرنامە زیندووەکانی گفتوگۆ (Talk show) گۆڤاری هەواڵی (Television news magazine) وەك (Date Line) و (٦٠ Minutes)، هەروەها بەرنامە زیندووەکانی هەواڵی (Live show) بەرنامەکانی ئێواران وەك (Night Line)، بەرنامە بەناوبانگەکانی بەیانیان وەك بەیانی باش ئەمەریکا (Good Morning America)، بەرنامەی تابلۆید وەك (Inside Edition) زیاتر لە ڕۆژنامەی کاغەزی قەبارە تابلۆید دەچوو، گۆڕانکارییەکان زۆر بواری گرتەوە، وەك بەرنامەکەی ئۆپرا و کەناڵەکانی وەك ئێم تی ڤی تایبەتمەند لە بواری مۆسیقا لە ئێستادا ئاسۆی کارکردنی فرەوانکردوە بۆ ڕوومالّکردنی هەواڵ بە شێوەیەکی بەردەوام.

هەندێك لەو بەرنامانەی باسکران بۆ نموونە تودەی (Today) دەگەڕێتەوە بۆ پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو، بەڵام لە ئێستادا وەك شێوازێکی نوێی ڕاگەیاندن خۆی دەنوێنێ، زۆرێك لەو بەرنامانە دەستپێشخەریان کردوە بۆ بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێ وەك کۆمپیوتەر و تۆڕە جیاوازەکان، شێوازی نوێیان پەیڕەوکرد لە بنیاتنان و پێشکەشکردنی بابەتەکانیان، هەندێ لە ڕوومالّکردنەکان بووە سەرەتای قۆناغێکی نوێ

له كاری میدیا وەك ڕوومالّكردنی كێشەی وەرزشوانی بەناوبانگ ئۆ.جەی سیبسون و كێشەی ویلیام كیندی سمیس و تیموپـی ماكفی باڵەخانەی شارەوانی لە ئۆكلاهوما سیتی تەقاندەوە، ئەم ڕوومالّكردنانە گۆڕانی گەورەی بەسەر داهات لە شێوە و ڕێگەی بە دواداچوون و بەكارهێنانی ئامرازەكانی پەیوەندیكردن و پەخش و گرافیك و ئامار بەهۆی كۆمپیوتەرەوە.

## دووەم: میدیای نوێ بە تەكنەلۆژیای نوێ:

مەبەست لەمجۆرە زۆربەی ئەو میدیایانەیە لە ئێستادا لەگەڵیدا دەژین و بەكاریدەهێنین، ئەوانەی لە ڕێگەی كۆمپیوتەرەوە بەكاردێن، تۆڕە جیاوازەكانی كۆمپیوتەر لە سەرووی هەموویان تۆڕی ئینتەرنێت و پۆستی ئەلیكترۆنی و هتد، ئەم ئامرازانە ڕێگەیان خۆشكرد بۆ ئەنجامدانی ئاڵوگۆڕی ڕاستەوخۆ و خێرای زانیاری، پەیوەندیكردنی زیندووی نێوان هەردوو لایەنی (نێرەر و وەرگر) دەرفەتی ڕەخساند بۆ هاوولاّتی ئاسایی دەنگی خۆی بگەیەنێتە جیهان، بەهۆیەوە توانرا ئامراز و تەكنەلۆژیا جیاوازەكان تێكەڵ بەیەك **بكرێن** و سنور و بەربەستە شوێن كاتییەكان لە نێوان ولاّتان تێپەڕێنێت كە جاران ڕێگرییەكی گەورە بوو لە بەردەم میدیای كۆن، ئەم میدیایە ڕۆڵێكی كارای لە بەدیهێنانی كارلێكردنی، بەردەستكردنی سەرچاوە و ژمارەیەكی زۆر لە شێوە و بەكارهێنانەكانی پەیوەندیكردن هەیە.

## سێیەم: میدیای نوێ بە تەكنەلۆژیای تێكەڵ:

لێرەدا جۆرێك لە بە یەكگەیشتن و ئاڵوگۆڕكردنی سوود و قازانج لە نێوان میدیای نوێ و كۆن دەبینرێ، زۆرێك لەو ڕۆژنامەوانانەی ئێستا لە ئامرازە تەقلیدییەكانی میدیا كاردەكەن ئامرازە نوێیەكان بەكاردەهێنن بۆ تەواوكردن و ئەنجامدانی كارە ڕۆژنامەوانییەكانیان، بەو مانایەی ئەو ڕۆژنامەوانانە هەردوو جۆری میدیا لەیەك كاتدا بەكاردەهێنن، هەروەك چۆن تاكەكان بە بایەخەوە دەڕواننە میدیای نوێ، بە هەمان شێوە دامەزراوە كۆنەكانی میدیا دان بە بایەخی میدیای نوێ دادەنێن و هەڵسوڕاوانی ئەو بوارە كاردەكەن بۆ گەیشتن بە تەكنەلۆژیا و بەكارهێنانە جیاوازەكانی میدیای نوێ،

بۆ نموونە زۆرێك لە ڕۆژنامە گەورەکانی وەك واشنتۆن پۆست و هاوشێوەکانی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت ماڵپەڕێکی گەورە و دەوڵەمەندیان هەیە، بە هەمان شێوە زۆرێك لە بەرنامەکانی تەلەفزیۆن و بڵاوکراوە هەواڵییەکان هەوڵدەدەن لە ڕێگەی کەرەستەکانی میدیای نوێ پەیوەندی لەگەڵ جەماوەرەکانیان بگرن و لە ڕێگەیەوە کارە میدیاییەکانی تەواودەکات و ڕاپرسی بەردەوام لە ڕێگەی ئامرازە نوێیەکانیانەوە ئەنجامدەدەن.

## ڕوانگەی مانۆڤیچ بۆ میدیای نوێ

لیف مانۆڤیچ (Manovich) دەڵێت" بۆ ئەوەی لە سروشتی میدیای نوێ تێبگەین، پێویست بەوە دەکات تێگەیشتنە باوەکان تێپەڕێنین کە بە شێوەیەکی گشتی کورتدەبێتەوە لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر بۆ دابەشکردن و نمایشکردنی زانیارییەکان، بەڵکو پێویست دەکات بڕوانینە ئەو ڕۆڵە تەواوکارییانەی کۆمپیوتەر هەیەتی لە پڕۆسەی بەرهەمهێنان و لە تەواوی ئامرازەکانی ڕاگەیاندندا، بەو هۆیەوە گۆڕانکارییەکی گەورەی هێنایەئاراوە لە سروشت و ماهیەتی پەیوەندیکردن، بە هەمان شێوە پێویست دەکات بڕوانینە سروشتی پەیامە نوێیەکان لەم پڕۆسەی پەیوەندیکردنە نوێیە دا بەرهەمهێنرا، شێوە گرافیکی و جۆرە جیاوازەکانی وێنە و نیگار و هێڵکاری و دەنگ و ڤیدیۆ و ئیفێکت و دەقە نووسراوەکان هەموویان لە ڕێگەی کۆمپیوتەرەوە چارەسەر دەکرێن، مانۆڤیچ باس لەوە دەکات تەکنەلۆژیای زانیارییەکان کۆمەڵێك ئامراز و پیشەسازی جیاواز لە یەکتری لە بۆتەی یەك فۆڕم ئاوێتەکردوە وەك کۆمپیوتەر و ئامرازەکانی میدیا و سیستەمەکانی پەیوەندیکردن.

مانۆڤیچ لایەنە سەرەکییەکانی میدیای نوێ لە چەند خاڵێکدا کۆدەکاتەوە:

- نواندنی ژمارەیی (Nambercal represention).
- حاڵەتی گواستنەوە (Modularity).
- حاڵەتی بە ئامێرکردن (Automation).
- قابلیەتی گۆڕان (Variability).
- بەرەمزکردنی کلتوری (Cultural Transcoding).

هەریەك لە پرەنسیپەکانی نواندنی ژمارەیی گوزارشتە لە سروشتی ژمارەیی میدیا (Digital Nature Of Media)، هەرچی حاڵەتی گواستنەوەیە مەبەست لێی ئەوەیە

کایە میدیاییەکان لەگەڵ یەك ئاوێتە**بکرێن** بێئەوەی بەشێك لە خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی خۆیان لە دەستبدەن، ئەمە کرۆکی خەسڵەتە سەرەکییەکانی میدیای نوێیە، دواتر دوو حاڵەتەکەی تر دێن، حاڵەتی بە ئامێرکردن تێیدا میدیا دەچێتە ژێرباری چارەسەری ژمارەیی لە ڕێگەی کۆمپیوتەرەوە، حاڵەتی دووەمیش قابیلەیەتی گۆڕانە تێیدا میدیاکان ڕوخسار و شێوەی هەمەچەشن وەردەگرن، دوا بنەما بریتییە لە رەمزکردنی کلتوری لەڕوانگەی تایبەتی مانۆڤیچ مەبەست لێی پڕۆسەی ئەو کاریگەرییە کلتوریانەیە لە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر دەکەوێتەوە.

- نواندنی ژمارەیی(Nambercal represention)

مادەم چارەسەری دەنگ و ڕەنگ بە شێوەیەکی ژمارەیی **بکرێ**، مانای وایە ئەم چارەسەرکردنە تەنها لە ڕێگەی کۆمپیوتەر دەکرێ، بەو پێیە سیستەمی ئەنەلۆگ بۆ شێوەی ژمارەیی دەگۆڕدرێ، کە وایکردوە **تێکەڵکردنی** ڕەگەزە گرافیکییە جیاوازەکان لەگەڵ یەکتر کارێکی ئاسان بێت و بواری سەرهەڵدانی مەڵتیمیدیا خۆشبکات.

- حاڵەتی گواستنەوە(Modularity)

دەکرێ پێکهاتەکانی میدیا لە یەکەی جیاجیا کاربکەن، بەڵام دەشکرێ لە یەك کاتدا کۆ**بکرێتە**وە بێئەوەی شوناس و خەسڵەتی خۆیان لەدەستبدەن بۆ نموونە: دەکرێ چارەسەری وێنەیەکی فۆتۆگرافی بکەین بە بەکارهێنانی ئەدۆبی فۆتۆشۆپ (Adobe photo shop) لەیەکبدرێ لەگەڵ چین و لایەری دیکە کە هەریەك لەو چینانە بەشێکی جیا لە وێنەکە لەخۆیدەگرێ، دەکرێ دواتر جارێکی دیکە چارەسەر**بکرێ** ئەو چین و لایەرانە لەیەك جیا**بکرێنە**وە بەبێ ئەوەی رتوش و کاریگەرییەکی لەسەر بەجێمابێت، هەمان کردار لەگەڵ تراکە دەنگی و ڤیدیۆیی و رەسمە جوڵاوەکان و هتد دەکرێت بەکاربێت.

- حاڵەتی بە ئامێرکردن و نوێبوونەوە (Automation)

تەواوی ئامرازەکانی میدیای نوێ بە شێوەیەك لە شێوەکان، لە تەواوی پڕۆسەی کارکردنی یان بەشێکیدا دەچێتە ژێرباری حاڵەتی جوڵە و نوێبوونەوە لە ڕێگەی سیستەمێکی ژمارەیی یەکجار ئاڵۆز و دژوار لە ڕێگەی کۆمپیوتەر، ئەم حاڵەتی نوێبوونەوە و جوڵەکردنە بۆ خێرا **وەڵامدانەوەی** داواکاری و پێویستیە زۆر و زەبەندەکانی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێتە، بۆ نموونە گوگڵ بە خێرایی وەڵامدەداتەوە بە پشتبەستن بە سیستەمێکی ژمارەیی تایبەت بۆ داواکاری ئەوانەی بە دوای زانیاری دەگەڕێن.

- قابیلیەتی گۆڕان و ڕەنگاڵەیی(Variability)

یەکێکە لە کۆڵەکەکانی میدیای نوێ، مەبەست لێی کۆی ئەو داتایانەیە دەکرێ هەریەك لە بەکارهێنەرانی میدیای نوێ بەگوێرەی خواست و ئارەزووەکانی خۆیان چارەسەریان بکات، ئەمە بۆ نوێکردنەوەی حاڵەتی تاکایەتی (Individualize) و پێدانی سیمای کەسێتی (Personalized) بەو داتایانە، بۆ نموونە کاتێك سەردانی گوگڵ دەکەین هەریەکەمان کۆمەڵێك هەڵبژاردنی (Option) خراوەتە بەردەست بۆ ڕێکخستن و دیزاینکردنی لاپەڕەی گوگڵ تایبەت بەخۆی بەو شێوەی حەزی لێدەکات و پێویستییەکانی بۆ دابیندەکات.

حاڵەتی گۆڕان و ڕەنگاڵەیی ئەمانە دەگرێتەوە

- توانای لەیەك جیاکردنەوەی ناوەڕۆك (Delinking of content) بۆ نموونە ڕەنگە ڕۆژنامەیەك چاپێکی کاغەزی و چاپێکی ئینتەرنێتی بەجیا بلاوبکاتەوە، بەجۆرێك چاپە ئینتەرنێتییەکە بە شێوەیەکی فرەوانتر زانیاری لە خۆبگرێ و هەوڵی رازیکرنی خوێنەر و پێویستییەکانی بدات.
- توانای دەستکاریکردن (Potential scalability) دەستکاریکردنی قەبارەی وێنە و نیگار و لاپەڕەکان یان جولاندن و خولقاندنی جیهانی گریمانەیی و سێ ڕەهەندییەکان لەمجۆرە میدیایەدا کارێکی ئاسان و ئاساییە.
- توانای نوێکردنەوە: لە سیستەمەکانی میدیای نوێ دەکرێ هەندێك زانیاری لەخۆبگرێ بە شێوەیەکی ڕێکوپێك نوێدەکرێنەوە، ئەمە لەبەرئەوەی سروشتی کارەکە وا دەخوازێت بۆ نموونە نرخی پشکەکان.
- تایبەتکردن و کارلێکردن: یەکێکە لە بەرەنجامەکانی حاڵەتی گۆڕان، تێیدا بەکارهێنەر کۆمەڵێك هەڵبژاردنی لەبەردەستدایە.

## ڕوانگەی پاڤلیك بۆ میدیای نوێ

جۆن پاڤلیك وایدەبینی سیمای میدیای نوێ دەگۆڕێت بە ئەندازەی ئەو خێراییەی تەکنەلۆژیای میدیای نوێ بەرەوپێش دەچێت، بە بۆچوونی ئەو گۆڕانێکی ڕیشەیی دێنێتەئاراوە بۆ شێوازی پەیوەندیکردن بەشت و کەسەکانی دەوروبەرمان، بەوشێوەیەی کەسەکان پەیوەندیی بەیەکەوە دەکەن، بە هەمان شێوە سەرلەبەری ڕووخسارەکانی

ژیانمان گۆڕیوە هەر لە دروستکردنی پەیوەندییە کەسییەکانمان پەیداکردنی سەرچاوەی داهات و چاوەدێری تەندروستی و هتد.

بەردەوام لە هەموو ساڵێکدا بازدانی گەورە ڕوودەدات لە بواری پێشکەوتنی تەکنەلۆژی تەنانەت هەموو بەیانییەك داهێنانێکی نوێمان بەگوێدا دەدەن.

ئەم کارە دووسەد ساڵی خایاند هەر لە داهێنانەکەی گوتەنبێرگ بۆ چاپەمەنی ساڵی (١٤٥) تاوەکو ئەوەی گەیشتە ئەمەریکا لە ساڵی (١٦٩٣)، سەدەی ڕابردوو پڕ بوو لە داهێنانی تەکنەلۆژی سەرسوڕهێنەر، هەریەکەیان شۆڕشێکی گەورەی لە بواری پەیوەنیکردنی مرۆییەوە بەرپاکرد.

پاڤلیك پێیوایە دەبێت نەخشە ڕێگایەك لەبەرچاوبگرین بۆ تێگەیشتنی ڕەهەندەکانی تەکنەلۆژیای میدیای نوێ، کەرەستەیەکی سەرەك بۆ وێناکردن و کێشانی ئەم نەخشەیە بریتییە لە تێگەیشتن لە ئەرکە سەرەکییەکانی میدیای نوێ، ئەوانە بەرهەمهێنان (Production)، دابەشکردن (Distribution)، پیشاندان (Display)، خەزنکردن (Storage)ی زانیاریە، سەرەڕای ئەوەی ئەم دەروازەیە سنوردارە بەهۆی حاڵەتی بەیەکگەیشتن (Convergence) و ئەو لێڵی و ناڕوونیەی لە نێوان هێڵەکانی ئامرازە هەمەچەشنەکانی پەیوەندیکردن هەیە، بەڵام کارێکی باش دەبێت ئەگەر هێڵە ڕوونەکانی تەکنەلۆژیای نوێ بەمشێوەیە بخەینەڕوو:

١- سیستەمی بەرهەمهێنان: تەکنەلۆژیاکانی بەرهەمهێنان بەکاردێ لە کۆکردنەوە و چارەسەرکردنی زانیارییەکان، کە ئەمانە دەگرێتەوە (کۆمپیوتەر، وێنەگرتنی ئەلیکترۆنی، سکانەر و... هتد)، ئەم تەکنەلۆژیایانە هەر تەنها یارمەتی نەداین بۆ ڕێگاگەلێکی تازە بۆ کۆکردنەوە و شرۆڤەکردنی زانیارییەکان، بەڵکو یارمەتیمان دەدات دەستمان بگات بە جۆری نوێی زانیاری و چارەسەرکردنی کێشە کۆن و نوێیەکان بە شێوەیەکی خێراتر، ئەگەرچی ئەم تەکنەلۆژیایە شوێنی دەستکاری مرۆیی گرتۆتەوە، مافی تایبەتمەندی ژیانی کەسەکان ڕووبەڕووی هەڕەشە دەکات، هەروەك پرسیارگەلێکی ووروژاندووە سەبارەت بەوەی کێ زانیارییەکانی بەدەستە و خاوەنیەتی؟ جگە لەوە ئەو داهێنانە تەکنەلۆژیانە توانای مرۆڤەکانی تێپەڕ کردوە لە گەیشتن بەوەی فێری بێت و بە شێوەیەکی تەواو لێی سوودمەندبێت.

٢- سیستەمی دابەشکردن: تەکنەلۆژیاکانی دابەشکردن ئەوانەن پەیوەندییان بە پرۆسەکانی نمایشکردن و جوڵە بۆ زانیارییە ئەلیکترۆنییەکان هەیە، ئەم سیستەمە سەرەکیانە دەگرێتەوە:

أ- پەخشی هەوایی (Over – the air).

ب- تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردنی زەمینی (Land based tele communication).

ت- کێبڵی پەیوەنیکردن (Coaxial cable) تەلەفزیۆنی کێبڵی دەگرێتەوە.

پ- پەیوەندیکردن لە رێگەی مانگە دەستکردەکانەوە (Satellitecommunication).

ج- پەخشی تەلەفزیۆنی ڕاستەوخۆ (Direct broad casting satellite).

ح- پەیوەندیکردنی بێتەل، خزمەتگوزارییەکانی پەیوەندیکردنە کەسییەکان و هاوشێوەکانی لەم بوارە دەگرێتەوە.

گومانی تێیدانیە ئەم تەکنەلۆژیا نوێیانە وەك چۆن لایەنی ئەرێنی زۆری هەیە، بە هەمان شێوە شوێنەواری نەرێنی لە بوارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکە هەیە، ئەم تەکنەلۆژیایە بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر زانیاری دەخاتەبەردەستمان، تەکنەلۆژیای ڤیدیۆ لەبەردەستدایە (Video on demand) کارێکی ئاسایی و خەسڵەتی تایبەتکردن و تاکایەتی و چەندین لایەنی ئەرێنی دیکە وایکرد ئامرازەکانی میدیا زیاتر ئاسان و کردەیی بن، وەلیٰ لە هەمان کاتدا چەندین گرفتی کۆمەڵایەتیی خولقاندووە لەوانە کردەکانی چەتەی زانیاری بە شێوەیەکی ترسناك پەرەیسەندووە، بەڕای زۆرێك لە شارەزایان ئەم تەکنەلۆژیایانە بۆشایی ژمارەیی (**الفجوة الرقمية**) لە نێوان کۆمەڵگە دەوڵەمەند و هەژارەکان زیاتر کردوە.

٣- سیستەمی پیشاندان: : ئامرازەکانی نمایش و پیشاندان ئاماژەیە بۆ ئەو تەکنەلۆژیایەی لە بواری پێشکەشکردنی زانیارییەکان بە بینەر و بەکارهێنەر بەکاردەهێنرین کۆمەڵێك ئامێری تایبەت بە پیشاندانی زانیاری ئەلیکترۆنی لە شێوەی جیاجیادا لەوانەش وێنە و دەق و ڤیدیۆ و مەڵتیمیدیا، هەندێك لەو ئامێرانە زانیاری بەشێوەی سێ ڕەهەندی پیشاندەدات، ئەم ئامێرانەش ئامێری کەسی ژمارەیی (Personal digital appliance) و شاشە تەختەکانی نمایشکردن (Flat Panel screens) دەگرێتەوە وەك ئامێرەکانی دوارۆژ سەیریان دەکریٰ بۆ پیشاندانی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی، دواتر دێینە سەر باسکردنیان، جگە لە شاشەکانی تایبەت بە پیشاندانی مۆبایل.

ئەم ئامێرانە گەیشتن بە زۆرترین بڕی زانیاریان کردوە بە کارێکی ئاسان، لە بەرامبەردا شوێنەواری خراپیان هەبووە لە بواری کۆمەڵایەتیی و تەندروستی بە ڕادەیەك لە هەندێ لایەنەوە بە هۆکاری توشبوون بە چەندین نەخۆشی ترسناکی جەستەیی و عەقڵی دادەنرێن و هەندێکیتر بە هۆکاری زیادبوونی ڕێژەی نەخوێندەواری و دابەزینی ئاستی ڕۆشنبیری و زانستی دەزانن.

٤- سیستەمی خەزنکردن: مەبەست ئەو تەکنەلۆژیایانەیە کە بەکاردێت بۆ هەڵگرتن و پاراستنی زانیارییەکان لە هەندێ شێوە و پێکهاتەی ئەلیکترۆنی کە چەندین شێوەی وەك سی دی و دی ڤی دی و میمۆری دەگرێتەوە، بەجۆرێك هەڵگرتنی بریکی زۆر زانیاری لەسەریان بۆتە کارێکی ئاسان.

جگە لە داهێنانی ئامرازی قەبارە جیاواز مەودا و توانایەکی گەورەیان هەیە بۆ نموونە سێرڤەری ڤیدیۆ (Video servers) کەسێکی پیشەگەر بەوهۆیەوە دەتوانێ وێستگەیەکی تەلەفزیۆن دروستبکات بەبێ بوونی کاسێت، لەبەرئەوەی ئەم ئامێرە بریکی زۆر ڤیدیۆی لەسەر هەڵدەگیرێ، سەرباری ئەوەی تایبەتمەندی (ڤیدۆیی بەردەست) یان (Video on demand)ی لەخۆدەگرێت.

## ڕوانگەی بولتەر و گرۆسین

بولتەر (Bolter) و گرۆسین (Grusin) لە ڕوانگەی نوێبوونەوەی تەواوەتی (Refashioning) وە سەیری تەکنەلۆژیاکانی میدیای نوێ دەکەن، ئەوان ناو لەوە دەنێن چارەسەری یان دوا چاکسازی (Remediation)، دەڵێن بیرۆکەی چاکسازی ئەو دەرچە و لۆژیکە سەرەکییەیە لە ڕێگەیەوە تەکنەلۆژیای میدیای نوێ پرۆسەی نوێکردنەوەی ئامرازەکانی میدیای نوێ داناوە لە چوارچێوەی تایبەتمەندییەکانیدا وەك ئاستی هەنووکەییبوون (Immediacy) و هایپەرلینك (Hypermediacy)، ئەم ئارەزووکردنە بۆ حاڵەتی هەنووکەییبوون گوزارشتە لە خواستی شەفافبوونی میدیا لەم سەردەمە.

بولتەر و گرۆسین لەسەر بنەمای چارەسەری و چاکسازی دەڕواننە مێژووی بەرەوپێشچوونی ئامرازەکانی میدیا هەریەکە بەجیا دەڕواننە ئەو پرۆسە خودچاکسازیەی هەریەك لەم ئامرازانە بەسەر خۆیاندا هێناوە، بۆ نموونە وێنە جوڵاوەکانی کۆمپیوتەر سوودی لە ئەزمونەکانی سینەما وەرگرتووە، سینەما سوودی بینیوە لە وێنە

جوڵاوەکانی کۆمپیوتەر، یەکێکی دیکە لەو نموونانەی بیردۆزەکەیان ڕووندەکاتەوە ئەو پرۆسەی چاکسازیەیە لە نێوان تەلەفزیۆن و ئینتەرنێتدا ڕوودەدات، ئینتەرنێت مۆدێلی کارکردنی بیناکردوە لەسەر ئەو ئەزمونانەی تەلەفزیۆن پێیگەیشتووە لە مامەڵەکردن لەگەڵ بینەر، دوای ئەمە دەبینین تەلەفزیۆن کاردەکات بۆ ئەوەی ستراتیژە تازەکانی بنیات بنێت لەسەر ئەزمونەکانی ئینتەرنێت لەو نموونانە بەکارهێنانی پەنجەرەکانە (Windowing) و بەکارهێنانی کەرەستەکانی جوڵاندن (Scrolling) و هتد.

## ڕوانگەی فیدڵەر بۆ تێگەیشتن لە میدیای نوێ

فیدڵەر (Fidler) ڕوانگە تیۆریەکەی بۆ تێگەیشتن لە میدیای نوێ بیناکردوە لەسەر مۆدێلە کلاسیکیەکەی هەریەك لە ئیڤرت رۆجەرز (Everet Rogers) و پۆڵ سافۆ (Pawl saffo) سەبارەت بە داهێنانە تازەکان و ئاستی جێبوونەوەی لە نێوان کۆمەڵگە، رۆجەرز و سافۆ دەڵێن بیر و داهێنانە تازەکان پێویستیان بە نزیکەی سێ ساڵ هەیە تاوەکو وردە وردە لەنێو کلتوری تاك و کۆمەڵگە جێگەی خۆیان دەکەنەوە، فیدڵەر پێیوایە ئامرازەکانی میدیا لە باری گۆڕانێکی ریشەییدا ئەو پرۆسەیە ناودەنێن (Media morphosis)، ئەم زاراوەیە فیدڵەر بۆ یەکەمجار لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو بەکاریهێنا بۆ ئاماژە کردن بەو گۆڕانە سەرتاسەریەی بەسەر ئامرازەکانی پەیوەندیکردندا سەپێندراوە بەهۆی کارلێکی ئاڵۆزی نێوان پێویستییە سەرەکییەکان و گوشارە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان و هەروەها داهێنانە تەکنەلۆژیا خێرا و سەرسوڕهێنەکان.

### فیدڵەر شەش بنەمای سەرەکی دەخاتەڕوو بۆ ئەم پرۆسەی گۆڕانکارییە کە ئەوانیش:

- پێکەوەژیان (Coexistense)،پێکەوەگەشەکردن (Coevolution) لە میدیای کۆن و نوێ.
- گۆڕانێکی ریشەیی پلەبەندی کایە میدیاییەکان لە کۆنەوە بۆ نوێ.
- بڵاوبوونەوەی خەسڵەتە باوەکانی کایە میدیاییەکان لە نێوان یەکتردا.
- مانەوەی هەندێك کایە و دامەزراوەی میدیایی لە ژینگەیەکی گۆڕاودا.
- هاتنەپێشەوەی هەندێك بارودۆخ و پێویستییە بابەتییەکان بۆتە هۆی ڕووکردن لە میدیای نوێ.

▪ حاڵەتی دواکەوتن لە پەیڕەوکردنی چەمکەکە و دواتر بڵاوبوونەوەی فرەوانی ئامرازەکانی میدیای نوێ.

بەگوێرەی بۆچوونەکانی فیدلەر لەو گۆڕانە ریشەییەی بەسەر ئامرازەکانی میدیای نوێ و قۆناغەکانی پەیوەندیکردنی مرۆیی دا هاتووە سێ کەرەستەی سەرەکی هەن ئەوانیش: زمانی قسەکردن (Spoken language)، زمانی نووسین (writinglanguage)، زمانی ژمارەیی (Digital language).

زمانی قسەکردن ڕێگەی بۆ سەرهەڵدانی کۆمەڵگە مرۆییەکان خۆشکرد و گەشەکردنی توانا و کارامەییەکان کێشە ئاڵۆزەکان چارەسەردەکەن، پێشەوەبردنی شێوەکانی پەخشکردن و بڵاوکردنەوە وەك گێڕانەوەی چیرۆك و ئەنجامدانی سرودە دەنگییەکان کە کۆمەڵگەی دەکردە سێ بەش بێژەر و دەرگاوان و گوێگر، دوای ئەوە زمانی نووسین بووە دەروازەیەك بۆ پێشەوەچوونی بەڵگەنامە گوازراوەکان و ئامێری چاپەمەنی و میدیای جەماوەری، هەرچی زمانی ژمارەییە بە پێچەوانەی زمانی قسە و نووسین ئەوا پرۆسەی پەیوەندیکردنی لە نێوان ئامێر و مرۆڤ بەهێزتر کرد.

دکتۆر سعید کاتب لەبارەی میدیای نوێ لە دوو خەسڵەتی سەرەکی کورتیدەکاتەوە ئەوانیش گۆڕینی لە شێوەی رەفتارکردن و ئاوێتەبوونی ئامرازەکانی پەیوەندیکردن، پێیوایە تەکنەلۆژیای میدیای نوێ ئازادیی میدیا و ڕادەربڕینی لە دروشم و سنورە تەسکەکانەوە کردە ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگر لە واقیعدا.

سەبارەت بە گۆڕینی رەفتاری بەکارهێنەر دکتۆر سعید دەڵێت" تەکنەلۆژیای میدیای نوێ گۆڕانێکی گەورەی هێنا بەسەر شێوەی رەفتارکردن لەگەڵ ئامرازەکانی پەیوەندیکردن، بەوپێیەی پێویستی بە ئاستێکی بەرزی ئاگایی و وریایی هەیە، دەبێت بەکارهێنەر هەست بکات بەتوانا و کارایی خۆی لە دیاریکردن و هەڵبژاردنی ئەو ناوەڕۆکەی دەیەوێت، زۆرێك لەو توێژینەوانەی لەمەڕ جۆرەکانی رەفتاری بەکارهێنەرانی میدیای کۆن کراون ئەوە دەردەخەن کە زۆرێك لە بەکارهێنەرانی ئەو میدیایە بە ئاگاییەکی کەمەوە بەدیار ئەو ئامرازانە دانیشتوون و سەیری دەکەن یان گوێی بۆ دەگرن یان دەیخوێننەوە، هەروەك شتی زۆریشی لێوە فێرنابن بە شێوەیەکی ڕووکەشانە مامەڵە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئامرازە کلاسیکییەکانی میدیا دەکەن بێئەوەی بە گرینگی و بە تەرکیزەوە لە ناوەڕۆکی ووردببنەوە، بۆ نموونە بینەری تەلەفزیۆن ڕەنگە چەند کاتژمێرێك

لەسەیرکردنی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن بەسەردەبەن بەڵام زۆربەی جار ئەو سەیرکردنە شێوەیەکی نەرێنی وەردەگرێت (Passive) بە ڕادەیەك ئەگەر دوای ماوەیەکی کەم سەبارەت بەوەی بینیویەتی پرسیاری لێ بکەین ئەوا ژمارەیەکی کەم لەوان لەیادی ماوە، بەڵام میدیای نوێ گۆڕانێکی گەورەی بەسەر ڕەفتاری بەکارهێنەر هێناوە و ئاستێکی بەرچاوی لە کارلێکردن لە نێوان ئامراز و بەکارهێنەر فەراهەم کردوە.

هەروەها کاتب باس لەو تێکەڵی و لێڵییە دەکات لە نێوان ئامرازە جۆربەجۆرەکانی میدیای نوێ هاتۆتەئارا، ئەم تەکنەلۆژیایە وایکردوە ئامرازە جیاوازەکانی پەیوەندیکردن تێکەڵ یەکتری **بکرێن** جاران هەریەکەیان دامەزراوە و ئامرازی سەربەخۆبوون و پەیوەندییان بەیەکدیەوە نەبوو، بەڵام ئێستا ئەم سنورانە لە نێوانیان نەماوە بۆ نموونە ڕۆژنامەی **(الشرق الاوسط)** بۆتە ڕۆژنامەیەکی ئەلیکترۆنی ڕاستەقینە، ئەو ڕۆژنامەیە ئێستا مانگە دەستکردەکان بەکاردەهێنێت بۆ ناردنی لاپەڕەکانی بۆ (١٢) شار لەسەرانسەری جیهان و کۆمپیوتەر بەکاردەهێنێت لەکارەکانی، دەکرێ لەسەر ئینتەرنێت بخوێندرێتەوە. تەلەفزیۆن و ئینتەرنێت بە شێوەیەکی فرەوان تێکەڵ بەیەك کراون و پێشبینییەکان ئاماژە بەوە دەکەن ئەم تێکەڵکردنە شێوەیەکی سەرتاسەری وەردەگرێ لە ئایندەیەکی نزیکدا، لە ئێستادا تەلەفزیۆن بۆ سەیرکردنی بەرنامە تەلەفزیۆنییەکان بەکاردێت لە هەمان کاتدا بۆ بەکارهێنانی ئینتەرنێت و وەرگرتن و ناردنی نامەی ئەلیکترۆنی بەکاردێت، ئێستا ئامێری کۆمپیوتەر دەکرێ بۆ وەرگرتن و سەیرکردنی بەرنامەکانی تەلەفزیۆن و ڕادیۆ **بەکاربهێنرێ**، کۆمپانیاکانی کێبڵی تەلەفزیۆنی ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر پشت بە مانگە دەستکردەکان دەبەستن لە پەخشکردنی بەرنامەکانی، دەبینین زۆربەی ئامرازەکانی میدیای جەماوەری یاخود میدیای کۆن لە ئێستادا بە شێوەیەك لە شێوەکان بوونەتە ئامرازی ئەلیکترۆنی.

دکتۆر سعید لەسەر دەرهاویشتەیەکی دیکەی تەکنەلۆژیای نوێ هەڵوەستەدەکات ئەویش ئازادیی ڕاگەیاندنی کردە هەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگر لەسەر ئەرزی واقیعدا، تۆڕی زانیاری ئینتەرنێت وایکرد هەرکەسێك توانای بەکارهێنانی ئینتەرنێتی هەبێت بتوانێ ببێتە پەخشکار (Publisher)، هەر پەیامێك بیەوێ ئاڕاستەی جیهانی بکات بە تێچوونێکی زۆر کەم، لەسەر تۆڕەکە هەزاران گروپی هەواڵی هەیە دەرفەت دەدات بە بەکارهێنەرە تاوتوێی هەر بابەتێك بکات بەخەیاڵیاندا دێت یان بەلایانەوە گرنگە لەگەڵ ژمارەیەکی بێشوماری بەکارهێنەر لەسەرانسەری دونیا.

## ڕوانگەی "باری ڕاگوزەری میدیا"

پرۆژەی حاڵەتی ڕاگوزەری میدیا (Project Media in Transition) بریتییە لە دەستپێشخەریەکی پەیمانگەی"ساسوستیس"ی ئەمریکی لە سەرەتای ئۆکتۆبەری (١٩٩٩)دەستیپێکردوە، لە ساڵی (٢٠٠٣) چاپخانەی پەیمانگەی ناوبراو، کتێبێکی بڵاوکردەوە ژمارەیەك لێکۆڵەر بەشدارییان لە نووسیندا کردبوو لەوانە گیتلمان (Gitelman) و پنگری (Pingree)، هەڵوەستە لەسەر هەمان بیرۆکە دەکات لەبارەیەوە ژمارەیەك لە کۆنگرە و دەستپێشخەریی سازدراون، ئەو لێکۆڵەرانە جەخت لەسەر ڕاستییەك دەکەنەوە میدیا لە حاڵەتێکی بەردەوامی ڕاگوزەریدایە لە ڕابردوو، لە داهاتووشدا هەروا بووە و هەروا دەبێت، ئەوان دەڵێن هەر ئامرازێك پەیدابووە سەرەتا تازە بووە، بۆیە پرۆژەکە تیشك دەخاتە سەر رەگەزی تازەیی و نویّ بوونەوەی بەردەوامی ئامرازەکانی پەیوەندیکردن بە درێژایی قۆناغە مێژووەکانی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەیان.

لەم کتێبە باس لەوەدەکرێت ساتەوەختی ڕاگوزەرکردن لە ئامراز و سیستەمێکی کۆن بۆ میدیای نویّ بە شێوەیەکی ڕوون و ورد تائێستا دیاری نەکراوە و نەناسێنراوە، لەم کتێبە چەندین نموونە بە ئامرازەکانی وەك تەلەفزیۆن و تەلەگراف دەهێنرێتەوە کە لە سەرەتای پەیدابوونی وەك داهێنانێکی بێ پێشینە ناودەبران، بەڵام لەئێستادا وەك دوو کەرەستەی ئاسایی سەیریان دەکریّ، خستنەڕووی ئەو نموونانە بۆ ڕوونکردنەوەی تێگەیشتن و تێڕوانینە مێژووییەکەیە سەبارەت بە ئامرازەکانی میدیا هەریەکەیان لەساتی پەیدابوونیدا کودەتایەکی گەورەی بەسەر شێوازی ژیانی مرۆڤ و کۆی سیستەمی پەیوەندیکردندا هێنا.

# سەرچاوەکانی بەشی یەکەم

**١. الدكتورة سميرة شيخاني، الاعلام الجديد في عصر المعلومات، مجلة جامعة دمشق، المجلد ٢٦، العدد الاول+الثاني، ٢٠١٠.**

**٢. انتصار ابراهيم عبدالرزاق، صفد حسام الساموك، الاعلام الجديد تطور الاداء والوسيلة والوظيفة، جامعة بغداد، ٢٠١١.**

**٣. حوار مع يحيي اليحياوي مجلة عربيات، ١٩ يوليوز ٢٠٠.**

**٤. الإعلام الجديد دراسة في تحولآته التكنولوجية وخصائصه العامة، د. عباس مصطفي صادق، الامارات العربية المتحدة.**

**٥. دكتور سعيد صالح كاتب، الاعلام القديم والاعلام الجديد، هل الصحافة المطبوعة في طريقها الي الانقراض، المدينة المنورة للطباعة والنشر، جدة ٢٠٠٢.**

**٦. د.عبدالرزاق محمد الدلَيمي، الاعلام الجديد والصحافة الالكترونية، الطبعة الاولي، دار وائل للنشر، عمان ٢٠١١.**

**٧.** ژمارە و ڕاستیەکان لەبارەی تەکنەلۆژیا، گۆڤاری زانستی سەردەم، ژمارە (٣٤)، لا ٢٣٧-٢٤٠.

8. Definition for New Media ،High-Tech Dictionary.http: //www. computeruser.com /resources /dictionary /dictionary.htmlAccessed: Oct. 2006.

9. Dr. Paul Martin Lester ،California State University.http: //commfaculty. fullerton.edu /lester/ curriculum/newmedia.html Accessed: July. 2006.

10. Definition: New Media. Computing Dictionary.

11. http://computing-dictionary.thefreedictionary.com/new+media Accessed: Sep. 2006.

12. New Media. Condensed Net Glossary< http: //www.saila.com/usage/glossary/ > Accessed: Sep. 2006.

13. New Medi
http: //www.webopedia.com/TERM/N/new_media.html>

# بەشی دووەم

## تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان چییە؟

تۆڕی کۆمەڵایەتیی دەکرێ بەوە پێناسە **بکرێت** کەوا گروپێك خەڵك بەیەکەوە لە ڕێگای یەك سەرچاوەی دیارەوە پەیوەندییان هەیە. سەرچاوەکە دەکرێ کارێك بێت، کارمەندەکان یان کرێکارەکانی ئەو کارە کۆبوونەتەوە و تۆڕیکی کۆمەڵایەتییان پێکهێناوە.

**بەرەوپێشچوونی** ئەم دواییەی ئینتەرنێت وایکردوە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی لە خەیاڵ بەدەر فرەوان بێت. لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە خەڵکی دەبن بە ئەندام و لاپەڕەی تایبەت بەخۆیان دروست دەکەن بە ناو و وێنەی خۆیانەوە. تۆ دەتوانێت لاپەڕەی تایبەتی کەسانی دیکە ببینیت کە دەیانناسیت و بیانکەیت بە هاوڕێی خۆت.دەتوانێت لە ماڵپەڕەکەدا بە دوای ناوی کەسانیتردا بگەڕێیت و دواتر بیانخەیتە نێو لیستی هاوڕێیانتەوە، بە کردنی ئەمە تۆ دەتوانێ تۆڕێك دروستبکەیت لەو کەسانەی دەتوانێت بە ئاسانی پەیوەندییان پێوەبکەیت. لەگەڵ ئەوەشدا دەرفەتی دروستکردنی پەیوەندیت لەگەڵ کەسانی نوێ هەیە. هەندێك نموونەی ئەو ماڵپەڕانە بریتیین لە فەیسبووك، مای سپەیس و یوتیوب،... هتد

ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن یارمەتی خەڵکی بدەن بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە و پرسیارانەی کە زەحمەت و گرانن، ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییەکان بۆ مەبەستێکی تایبەت دانراون، وەك ئەو کەسانەی جۆرە ئۆتۆمبێلێکی تایبەت یان جۆرە پرۆگرامێکی

کۆمپیوتەری تایبەت بەکاردەهێنن. ئەمجۆرە ماڵپەڕانە بەهێزن، چونکە دەتوانن لە ڕێگەی ماڵپەڕەکەوە یارمەتی ئەو کەسانە بدەن ئەمجۆرە ئۆتۆمبێلانە بەکاردەهێنن، بە پەیوەندیکردن بە یەکترەوە کەسەکان لە نێوان خۆیان دەتوانن زانیاری ئاڵوگۆڕبکەن لەسەر جۆری ئۆتۆمبێلەکەیان بەبێ ئەوەی لە پێشتردا یەکتریان بینیبێت.

تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان یارمەتیدەرن بۆ ئەوەی ئێمە بە ئاسانتر لەگەڵ یەکتردا لە پەیوەندیدا بمێنینەوە، ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییانە ئاسانکاریت بۆ دەکەن تۆ پەیوەندیت بمێنێتەوە لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەت و هاوڕێکانت ئەگەر لێشیانەوە دوور بێت.ئەم نموونانەی هێنامانەوە چەند نموونەیەکی کەمن لەوەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن یارمەتیدەربن، لە ڕاستیدا زۆر شتیتر هەن کە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەبارەیانەوە ئاسانکاریت بۆ دەکەن.

## تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و نەوەی نوێ

نوێیەتی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وایکردوە زۆربەی بەکارهێنەرانی بە تایبەتی (MySpace.com) و (Facebook.com) ئەوانەن بن کە تەمەنیان لەخوار (٢٥) ساڵیدا بێت، واتە ئەوانەی تەمەنییان گەیشتووەتە ئەوەی بچن بۆ زانکۆ، بۆیە کاتێك باسی ئەم تۆڕانە دەکەین بە زۆری مەبەست لێیان نەوەی نوێیە.

جارجار دایکان و باوکان لاپەڕەی تایبەت دروست دەکەن تا وێنەی منداڵەکانیان پیشانبدەن، بەڵام تەنیا ڕێژەیەکی کەم تەمەنیان لە سەرووی (٢٥) ساڵیدایە. زۆربەشیان هونەرمەندن لەم ڕێیەوە هەوڵ بۆ ڕەواجدان بە بەرهەمەکانییان دەدەن.

هەندێ لە تۆڕە کۆمەڵایەتییە بچووکەکان، وەك کۆڕبەندە ئۆنلاینەکانی ئۆتۆمۆبێل، بەکارهێنەرانیان دەکرێ هەر کەسێك بێ، مادام خاوەن ئۆتۆمۆبێلێك بێ لەو جۆرەی ئەوان، گرینگ نییە تەمەنی چەندە. ئەمجۆرە بەکارهێنەرانە دەکرێ هەر کەسێك بن و لەهەر تەمەنێکدا بێت، بەڵام زۆرینەی بەکارهێنەران بریتیین لە تەمەنی نێوان هەژدە تا بیست و پێنج ساڵ.

ئەو ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییانە تاڕادەیەك بیرۆکەیەکی نوێن، بەڵام ئەوەندە ڕۆچوونەتە ناو خەڵکەوە تا ئەو ڕادەیەی سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناوە. ئەم ماڵپەڕانە ساڵانە ملیۆنان دۆڵار کۆدەکەنەوە و کار بۆ خەڵکێکی زۆر دەدۆزنەوە. ئەو ڕێکلامە

بازرگانیانەی ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییانە بڵاویدەکەنەوە، نەك هەر خۆیان پارەیەکی لەڕادەبەدەریان دەستدەکەوێت، بەڵکو ئەو کۆمپانیایەی ڕێکلامەکەی کردوە چانسی بەرزبوونەوەی فرۆشییەکانی هەیە. هەمیشە ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییانە لە زۆر ڕووەوە یاریدەردەری خەڵك بوون.

## نموونەی ماڵپەڕە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

ئینتەرنێت ماڵپەڕی کۆمەڵایەتیی جۆراوجۆر لەخۆدەگرێت، ئەمجۆرە ماڵپەڕانە لە ڕوانگەی بەکارهێنانیانەوە هەمە چەشنن. هەندێ لەو ماڵپەڕانە لەهەر ڕۆژێکدا ملیۆنان بەکارهێنەری هەیە. نموونەی ئەوانە مای سپەیس و فەیسبووك و یوتیوبن، ئەمانە بریتیین لە بەربڵاوترین ئەو تۆڕانەی هەن.

هەروەك پێشتر باسمان کرد ئەو کەسانەی ئەو ماڵپەڕانە بەکاردەهێنن لە تەمەندا هەمەجۆرن، هەر لە منداڵی تازە لەدایکبوو دا دایك و باوکی لاپەڕەیەکی تایبەت دروست دەکەن، وێنەکانی ئەوی تێیدا بڵاودەکەنەوە تا کەسێکی (٩٠) ساڵی.

هەریەك لەو سێ تۆڕە کۆمەڵایەتییە ئەندامبوون لێی بەخۆڕاییە.ئەمە تاکە هۆکاری سەرەکیی کەمەندکێشکردنی ئەم ماڵپەڕانەیە. چەند پرسیارێکی زۆر لەلایەن خەڵکەوە دەکرێن بریتییە لەوەی ئەم ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییە بە خۆڕاییانە پارەیان دەستدەکەوێت؟ کێ خاوەنی ئەم ماڵپەڕانەیە؟

### مای سپەیس MySpace.com

ئەم ماڵپەڕە لەلایەن (کریس دی وۆلف) و (تۆم ئاندەر سن) ەوە دانراوە، هەردووکییان مافەکانیان بۆ (مای سپەیس) بە بڕی (٥٨٠) ملیۆن دۆلار فرۆشتە (نیوس کۆرپۆڕەیشن).

(مای سپەیس) هەر ساڵێك (١٠٠) ملیۆن دۆلار بەدەست دەهێنێت، سەرەڕای ئەوەی (نیوس کۆرپۆڕەیشن) ساڵانە بە دەستی دەهێنێت، دەرکەوتووە زۆرینەی بەکارهێنەرانی (مای سپەیس) تەمەنیان لە نێوان (١٤ تا ٢٥) ساڵیدایە.

### یوتیوب YouTube.com

یوتیوب کەمێك لە ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییەکانی تر جیاوازە بەوەی بریتییە لە ماڵپەڕێکی هاوبەشی ڤیدیۆیی و بەخۆڕاییشە، لە کاتێکدا لە (فەیسبووك) و (مای سپەیس) دا زیاتر ئاڵوگۆڕ لە نێوان کەسەکاندا هەیە. یوتیوب لە ساڵی (٢٠٠٥) لەلایەن (جاد هێرلی) و (ستیڤ چێن) و (جاوید کەریم)ەوە دانراوە. یوتیوب لەوەدا لە (مای سپەیس) دەچێت تێکڕای ئەو تەمەنی ئەوانەی بەکاریدەهێنن بریتییە لە (١٦) ساڵی. لێکچوونێکی تری نێوان(یوتیوب) و (مای سپەیس) بریتییە لە قازانجەکەی. لە ساڵی (٢٠٠٦) یوتیوب لەلایەن کۆمپانیای گوگڵەوە بە بڕی (١.٦٥) ملیار دۆلار کڕدرا.

### فەیسبووك Facebook.com

فەیسبووك کەمێك جیاوازترە لە مای سپەیس و یوتیوب، بەوەی فەیسبووك لە بنەڕەتەوە بۆ قوتابیانی کۆلێژ و زانکۆ دانرابوو. هەرچەندە لە ساڵی ڕابردوودا فەیسبووك ئەمەی گۆڕی و هەرکەسێك بێت دەتوانێت ببێتە ئەندام ئەگەر ئەدریسی ئیمەیڵی هەبێت. (مارك زوکەربێرگ) دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری گشتیی فەیسبووکە. داهاتی فەیسبووك ساڵانە بە (٥٠) ملیۆن دۆلار دەخەمڵێنرێت.

### ئەم ماڵپەڕانە چۆن قازانج دەکەن؟

گەورەترین پرسیار زۆربەی خەڵکی هەیانە ئەوەیە چۆن ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییانە پارە بەدەستدێنن و قازانج دەکەن. ڕێکلامە بازرگانییەکان سەرەکیترین داهاتی ئەم ماڵپەڕانەن، ئەو ڕێکلامە چ لەلایەن هونەرمەندێکەوەیە دەیەوێت لە مای سپەیسەوە دەنگی ببیسترێت یان ئەوەتا کۆمپانیایەکی ئۆتۆمبێلە دەیەوێت قوتابیەکی زانکۆ ئۆتۆمبێلێکی ئەو **بکرێت**.

لەگەڵ ئەو گۆڕانەی بەسەر نەریتی ڕاگەیاندندا هات، ڕێکخراو و گروپە قازانج نەویستەکان زیاتر ڕوویانکردە ئامرازە بەدیلەکان بۆ گەیشتن بە خەڵك، لە هەمان کاتدا،

بڵاوکردنەوەی خودی و پەیوەندی وکارلێکی ڕاستەوخۆی تاك و گروپەکان لە ڕێگەی ئەو تۆڕانە لەسەر ئینتەرنێت بەرەو هەڵکشانی زیاتر دەچێت، بەرزبوونەوەی ڕێژەی ئەزمونە خودی وهەندێ جاریش هەرەمەکییەکان لەنێو بەکارهێنەران، پەیوەندی نوێی گرنگ و رواڵەتی ئەرێنی و نەرێنی زۆری هێناوەتە نێو ئەو جیهانە فرەوان و نادیارە، بە تایبەت لە ئێستادا بووەتە گۆڕەپانێکی گەورەی ئابووری و ڕێکلامکردن و ساغکردنەوەی کاڵاکان، بۆتە کەرەستەیەکی تازەی سیخوریکردن بەسەر تاك وگروپ و دەوڵەتەکانەوە، هەر بۆیەش ئاماژەکان بەو ئاڕاستەیەن ئینتەرنێت و میدیای نوێ و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەئایندەیەکی نزیکدا ببنە گەورەترین گۆڕەپانی کێبرکێی زلهێزەکان لە بواری بەرهەمهێنانی تەکنەلۆژیای پەیوەندییەکان و زانیاری و سیخوریکردن و چەتەگەری زانیاری، خەریکە ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە دەبنە ئامرازێکی گرنگی گەیشتن بە مەرامە سیاسییەکان لەسەر ئاستی لۆکاڵی و نێودەوڵەتیدا، وەك ئەوەی لە هەڵمەتی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی ئەمەریکای ساڵی (٢٠٠٨) دا بینیمان و بەو هۆیەوە باراك ئۆبامای گەیاندە کۆشکی سپی، لە هەمان کاتدا نابێت ئەوە لە بیربکەین لەو جیهانە نادیار و گریمانەییەدا ئاسایشی زانیاری و مافی تایبەتمەندی تاکەکەسی بەردەوام پێشێل دەکرێ لەو لایەنەوە بۆتە هەڕەشەیەکی گەورە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئێمە لە بەردەم شۆڕشێکی گەورەداین لە بواری ئاڵوگۆڕی زانیاری و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و نەهێشتنی بەربەستە تەقلیدییەکان لە بەردەم تاك و گروپەکان لە پەیوەندیکردن بە یەکتر و بەستنی ڕایەڵی پەیوەندی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا، هەر ئەمە وایکردوە لە هەموو لایەکەوە بە بایەخەوە باس لەو تەکنەلۆژیا تازەیە **بکرێ** و جەخت لەسەر حەتمیەتی سوودوەرگرتن لێی **بکرێتە**وە لە پێناو مانەوە و دانەبڕان و پەراوێز نەبوون لەو جیهانەدا کە لە گۆڕانێکی بەردەوام و زۆر خێرادایە.

باراك ئۆبامای سەرۆکی ئەمەریکا دەڵی: "من دەزانم ڕۆژنامە و میدیاکان باشترین ئامرازن بۆ هەڵماڵینی درۆ و دەلەسە و ئەفسانەی سیاسییەکان، دەتوانن ببن بەهەرەشەی ڕاستەقینە بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێ ڕێگری لەهەقیقەت بکەن". پاوڵ کریگمان لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمز دەڵێت: "گەورەترین دەرفەت دەربارەی ئەم سەردەمەی ڕۆژنامەکان بریتییە لەوەی خەڵك بە ڕاستی شتێك لەبارەی بابەتێك دەزانن بەخێرایی دەتوانن بڕیاربدەن بەبێ ئەوەی لە ڕێگای دەسەڵاتەوە بەشێواوی و ناڕاستی پێیان

بگات". مارکۆس مۆلیساس لەماڵپەڕی دەیلی کۆس دەڵێت: "ئێمە دەبێ لەوە دڵنیابین گروپە کارامە و لێهاتووەکان توانای کۆنترۆڵکردنی تایبەتییان دەبێ لە تاوتوێکردنی کێشەکان بە تایبەت کێشەی سیاسی، کلتوری، مۆسیقا، هونەر و هتد... ئەوەی ڕوودەدات تەکنەلۆژیایە کە ڕێگە بە خەڵك دەدات لە سەرتاسەری وڵات و جیهان بۆ تاوتوێکردنی شتەکان مایەی **گرنگیدانی** ئەوانە. کاتێك دەربارەی ئەم بابەتانە دەست دەکەن بە قسەکردن، زۆربەی کاتەکان، ئەوان لەسەر ئەم کێشانە کاردەکەن و هەڵوێستیان دەبێ".

### ئاسایشی زانیاری و مافی تایبەتمەندیی کەسەکان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

گومانی تێیدانیە هاتنی هەر دیاردەیەکی نوێی تەکنۆلۆژی، دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیی و مۆدێلێکی سیاسی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ، فەیسبووك بە تۆڕی کۆمەڵایەتیی ناسراوە و بۆ کایەی سیاسی کەڵکی لێوەردەگیرێ، لەبری ئەوەی فەزای گشتیی بخولقێنێ، کەچی بە پێچەوانەوەیە، چونکە ترسی هیچ جۆرە چاوەدێرییەکیان نییە، خەریکن خراپ کەڵکی لێ وەردەگرن و فەزایەکییان خولقاندوە، هەروەك چۆن پێشتریش خراپ بەکارهێنانی مۆبایل لە سەرەتای هاتنیدا گەورەترین کێشەی کۆمەڵایەتیی خولقاند، تاڕادەیەك ئاسانکاری و دەرفەتێك بوو بۆ ئەوانەی دەیانویست لە خراپە و شەڕانگێزیدا بەکاریبێنن، هەر ئەوەی کە لە ڕێگەی بلوتوسەوە وێنە و گرتەی ڤیدیۆیی درۆینە بڵاودەکرایەوە و چەندین ژنی بەدبەخت و خێزانی کوردی بوونە قوربانی ئەو کارە نەشیاوە، ئێستاش فەیسبووك جێگەی گرتۆتەوە و دیسان کەسانی نەخۆش و هەندێ جاریش باندی تاوانکاری سوودیان لێوەرگرتووە.

بایەخی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە کەس شاراوە نیە لە ئێستادا زۆربەی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت ڕۆژانە کاتێکی زۆر بە دیار ئەو تۆڕانەوە دادەنیشن و ڕۆڵێکی گەورە دەبینێت لە پەیوەندیکردنی کۆمەڵایەتیی، جگە لەمەش تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بوونەتە گۆڕەپانێکی نوێی بانگەشەکردن بۆ بیروباوەڕە سیاسی و ئایینی و کۆکردنەوەی لایەنگر و شوێنکەوتوان، ڕێکلامکردن بۆ کاڵا و کۆمپانییاکان، هەروەك بۆتە ناوەندێك بۆ چێژ وەرگرتن و بەسەربردنی کاتێکی خۆش.

لێ لەدیوەکەی دیکەیدا چوونە نێو ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە کارێکە دوور نیە لە مەترسی، بەهۆی ئەوەی لەنێو سەدەها ملیۆن بەکارهێنەری تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ژمارەیەکی زۆر لە تێکدەر و دز و چەتەی ئەلیکترۆنی لەو فەزا ئەلیکترۆنییە چالاکانە کاردەکەن و بونەتە سەرچاوەی هەڕەشەیەکی ڕاستەقینە بۆ سەر زانیارییە کەسی و داتا و دیکۆمینتی سەر بە ڕێکخراو و کۆمپانیا و دامەزراوە ڕەسمییەکان، بۆیە سەیر نیە لێرە لەوێ گوێبیستی هەندێ لەوانە بین داوای دوورکەوتنەوە و بەکارنەهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەکات لەو ڕوانگەیەوە گەرنتی ئاسایشی زانیارییەکانی کەس و دامەزراوەکان لەو جیهانە گریمانەییەدا لە ئاستی پێویستدا نیە و هەموو ئەو ڕێوشوێن و پرۆگرامانەی دادەهێنرێن بۆ پاراستنی زانیارییەکان، بەردەوام لەلایەن هاککەر و چەتە ئەلیکترۆنییەکان کاریگەرییەکانیان لەکارخراوە.

بێگومان داواکارییەکی لەمجۆرە تاڕادەیەکی زۆر ناواقیعیە وناکرێ مرۆڤایەتی دەستبەرداری ئەو هەموو ئاسانکاری و خزمەتگوزارییە زۆر و زەبەندانە بێت لە ڕێگەی تۆڕی زانیاری نێودەوڵەتی بە شێوەیەکی گشتی و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە شێوەیەکی تایبەتی خراوەتەبەردەست، بەڵام دەبێت لە کاتی بەکارهێنانی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا ئەو مەترسی وهەڕەشانە بەهەندوەربگرن چ لە ڕووی یاساییەوە یان ئەگەری پێشێلکردنی مافی تایبەتمەندی (**الحق في الخصوصية**)، یاخود لە ڕووی تەکنیکەکانی پاراستنی زیاتری زانیارییەکان بێت.

نەبوونی چاوەدێرییەك بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵ و وێنە و گرتە ڤیدیۆیی و زانیاریانەی هەر کەسێك بەکارهێنەری تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بێت، حاڵەتێکی زۆر ناشیرینی خولقاندووە، بۆ نموونە ڕووشاندنی شۆرەت و ناوزڕاندنی کەسێك، مەترسییەکە بۆ سەر هەر تاکێك، بە درێژایی ماوەی ڕابردووش چەندین ڕووداوی نەخوازراو تۆمار کراون، پێشێلکاریەکی ڕاستەوخۆ بوو بۆ سەر ئازادیی تاك، ئەمە لە بارێکدا زۆربەی ئەوانەی فەیسبووك بەکاردەهێنن خۆیان بە ئازادییخواز و ڕۆشنبیر دەزانن، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە هەست بە کەمزانین دەکەن، بۆیە لە ڕێگەی فەیسبووکەوە کەلێنەکانی ژیانی خۆیان پڕدەکەنەوە.

حاڵەتێکی دیکەی خراپ بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەیە کەسانێك هەن بەبێ ئەوەی داوای مۆڵەت بکەن یان بزانن کەسی بەرامبەر قەبوڵیەتی، وێنە یان

کۆمێنت یان هەر بابەتێکی کەسی بڵاودەکەنەوە، لەمەشدا نموونەم هەیە کەسانێکی نابەرپرس لە ڕێگەی مۆبایلەوە قسەی بڕادەرەکانی خۆیان کە ئادیان کردوون بڵاویدەکەنەوە یان ئەو کەسانەی هیچ پەیوەندییەکیان بە دونیای ئینتەرنێتەوە نییە، بێ ئەوەی بیر بکەنەوە ئەو کارە دۆخێکی نەخوازراوی تەناهی و کۆمەڵایەتیی و سیاسی دروستدەکات، ئەم دیاردەیە ئەگەر بەرنامە بۆداڕێژراویش نەبێ، جۆرێك لە چاوەدێریکردنی تاکە بەبێ ئەوەی بەکارهێنەری فەیسبووك بزانێ، دواجار سیستەمی چاوەدێری کۆمەڵایەتیی و تەناهی کەڵکی لێوەردەگرن، بۆیە ئەمە لە چاوەدێری تەناهی دەزگا ناوەخۆییەکان خراپترە و فەزای گشتیی دەخنکێنێ.

بەشێکی زۆر لەو کەسانەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەکاردەهێنن، نەك هەر جێگەیان نابێتەوە لە نێو تۆڕی پەیوەندی کۆمەڵایەتیی یان دونیای نووسین و ڕۆژنامەوانی، بگرە ئەو سیاسەتەش لە کوردستان هەیە، نووسین و بۆچوونی نالۆژیکی و قسەی بازاڕی بڵاودەکەنەوە و کۆمێنتیشی لەسەر دەنووسرێت، لەحاڵێکدا بڵاوکردنەوەی نووسین و بۆچوون، تەنها بەکارهێنانی ئازادیی بیروباوەڕ و رادەربرین نییە، بەڵکو بەرپرسیارییەتیشە، ئەم نەبوونی بەرپرسیارییەتیە بەهای بۆ نووسین و ڕۆژنامەوانی جددیش نەهێشتۆتەوە، ئەم پاشاگەردانییە لە دونیای بەکارهێنانی فەیسبووکی کوردیدا هەیە، بابەتێکە شایانی توێژینەوە و قسە لەسەرکردنی زیاترە بۆ ئەوەی لە هۆکارە راستەقینەکان و شێوازی چارەسەرکردنی دەستنیشانی ورد و زانستیانە بکرێ.

حاڵەتێکی دیکەی نابەرپرسیارێتی بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوەیە هەندێ جار بە ناوی کەسێکەوە دروستکراوە، بەبێ ئەوەی کەسەکە بزانێ یان ئەوەی کە لاپەڕەیەکی وەهمییە، هەروەك چۆن پێشتر ئیمێل بە ناوی کەسێکەوە دادەنرا و دواتر کێشەی دەخوڵقاند، بۆ ئەمە چەندین نموونە هەیە بەکارهێنەر هەیە خاوەنی چەندین لاپەڕەی لەوجۆرەیە، کردوویەتی بەکاری هەمیشەیی خۆی، ئەگەر دیاردەکە بەو ئاڕاستەیە درێژەبکێشێ، هەرچی بەهای کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگی هەیە لە بەریەك هەڵدەوەشێنێتەوە.

لەم بەشەدا باس لە مافی تایبەتمەندی دەکەین لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و سەرەکیترین مەترسییەکان و بەرنامە و پرۆگرامە زیانبەخشەکان، ڕێگاکانی فێڵکردن و گۆڕینی کەسێتی، بەکارهێنانی ناو و کەسێتی کەسانی دیکە، لەگەڵ هەندێ لەو

ئامۆژگاری و ڕێنماییانەی یارمەتی بەکارهێنەر دەدەن بۆ ئەوەی پارێزراو بێت لەو مەترسی و هەڕەشانە و سنوری ئەو زانیارییانەی ئاساییە بەکارهێنەر لەو تۆڕانە بڵاویبکاتەوە، تا مامەڵەیەکی هۆشیارانە بکات لەگەڵ لایەنی ئەرێنی و نەرێنی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.

## گرنگترین مەترسییەکان بۆ سەر مافی تایبەتمەندی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

١- پرۆگرامە زیانبەخشەکان

ڤایرۆسە ئەلیکترۆنییەکان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان یەکێکە لەو هەڕەشانە، یەکێکە لەسەرەکیترین کرمەکانی کۆمپیوتەر، ناسراوترین کرمیش "کووبفەیس"ە (koobface) زۆرترین ژمارەی کۆمپیوتەری دامەزراندووە بۆ مەبەستی تێکدەرانە لە نەوەی دووەمی وێبدا.

کرمی"کووبفەیس" لە لاپەڕەی بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی وەك فەیسوك، مای سپەیس بڵاودەبێتەوە و دەچێتە ناو لیستی هاوڕێیانی بەکارهێنەر، بێ ئاگاداری و ویستی ئەو بەکارهێنەرە هەواڵ و کۆمێنت بۆ ئەو هاوڕێیانەی دەنێرێت لینکی لاپەڕەیەکی وەهمی ماڵپەڕی یوتیوب لەخۆیدەگرێ، داواشیان لێدەکات بۆ کردنەوەی لینکەکە بەرنامەی بەکارهێنەری مەلتیمیدیای "فلاش پلایە" دابەزێنێت، ئەوکات لە بری دابەزینی بەرنامەی "فلاش پلایەر" کرمی"کووبفەیس" دادەبەزێت بۆ سەر کۆمپیوتەری هاوڕێکانت و، لەوێشەوە دووبارە دەستدەکاتەوە بەهێرشکردنە سەر لیستی ناوی هاوڕێیانی ئەو بەکارهێنەرەی کۆمپیوتەرەکەی تووشی ئەو ڤایرۆسە هاتووە.

**٢- نامە ئەلیکترۆنییەکان**

لە نێویشیاندا ئەو نامە ئەلیکترۆنییانەی ئاڕاستەی بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەکرێ و تێیدا داوای لێ دەکرێت سەردانی ماڵپەڕێکی ساختە و وەهمی بکات، لەو نموونانەش نامەی "FB Action " لەتۆڕی فەیسبووك کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد لە نووسینگەی لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەمریکییە (FBI)،

کارەکە بەوە کۆتایی هات کە کۆمپیوتەری ژمارەیەك بەکارهێنەری فەیسبووك تووشی ئەم ڤایرۆسە بوو، بەڵام کاردانەوەی تۆڕەکە خێرابوو بەوەی ناوی ئەو ماڵپەڕەی خستە نێو لیستی ڕەشەوە" black list"، وەلێ بووە سەرەتا و پێشینەیەکی خراپ بۆ دواتر کە چەند هەوڵێکی هاوشێوەی ئەو نامەیە لە فەیسبووك چەند جارێك دووبارە بوەتەوە.

**٣- ئەسپی تەڕوادە**

بریتییە لە کۆدێکی بچووك لەناو یەکێك لەو پرۆگرامانە هەڵدەگیرێت بە شێوەیەکی بەرفرەوان بەکاردەهێنرێت، ئەو کۆدە بەچەند ئەرکێکی شاراوە هەڵدەستی بە تایبەتی کاردەکات لەسەر لاوازکردنی سیستەمی بەرگری لە کۆمپیوتەری بەکارهێنەر، بە ئامانجی چوونە نێو داتا و زانیارییەکانی نێو کۆمپیوتەرەکە و دزینی ئەو زانیارییانە، لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، ئەو بەرنامە زیانبەخشە بۆ مەبەستی خراپ لەجاران زیاتر سوودی لێوەردەگیرێت بۆ دزینی داتا و زانیارییەکان، دزینی حیسابی بانکی، دۆسییە هەستیارەکان لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، ئەمە بەهۆی ناسین و شارەزایی کەسی تێکدەر بە شوناسی ئەو کەسانەی دەیانکاتە ئامانج.

**٤- لینکە ئەلیکترۆنییە کورتەکان**

ئەم کێشەیەش زیاتر لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە دەردەکەوێ بەهۆی ڕێگەنەدانی بە بەکارهێنانی ڕەهای وشە، بۆ نموونە "تویتەر" لەبەرئەوە بەکارهێنەر ناچاردەبێت خزمەتگوزارییە کورتکراوەکان بەکاربێنێت بۆ ناونیشانی ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکان وەك (tinyurl) بە مەبەستی چڕکردنەوەی ناونیشانە درێژەکان لە پانتاییەکی کەمدا، بۆیە ئەو دز و چەتە ئەلیکترۆنییانە تەواوی تواناکانییان بەگەر دەخەن بۆ ئەوەی بەکارهێنەری ئاسایی لینکە ڤایرۆساویەکە نەناسێتەوە و جیاینەکاتەوە لە لینکە ڕاستەقینەکان، بەکارهێنەر هەر ئەوەندە دەزانێ کلیکی لەسەر پرۆگرامێکی تێکدەرانە کردوە، ئەم لینکە کورتانە بەکارهێنانی ئاسانە و لە هەموو شوێنێك بەردەستە، زۆرێك لە بەکارهێنەرانی "تویتەر" بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هەڵدەستن بە**کورتکردنەوەی** لینکەکان و ئەوانیتر هەڵدەستن بە کلیککردن لەسەری وبینینی ناوەڕۆکەکەی.

**٥- دزەکردنی زانیارییە کەسییەکان و بەڵگەنامە نهێنییەکان**

بەهۆی ئەو هۆگری و متمانەیەی لە نێوان بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دروستبووە، لەبەرئەوە لە هەندێ حاڵەتدا دەبینین ئەو هاوڕێیەتی و هاوبەشییە زیاتر لە پێویست تێکەڵاوی دروستکردوە، ئەوەی پەیوەندی هەیە بەکاروبارە کەسییەکان، یان ئەوەی پەیوەندی بەشوێنی کارکردن و لایەنی دارایی و داهاتی کەسەکە و ئەو ئابڕووچوون و گۆڕانکارییانەی لە فەرمانگە و دامەزراوەکەی ڕوودەدەن، ئەمە کێشەی زۆری لێدەکەوێتەوە چ لە ڕووی گرفتی کۆمەڵایەتیی یاخود بەدواداچوونی یاسایی، بۆ نموونە تەنها بەنووسینێك لەسەر دیوارەکەت لە فەیسبوك بەوەی هەفتەی داهاتوو مۆڵەتەکەت لە تورکیا بەسەردەبەیت ئەوا ماڵەکەت ڕووبەڕووی دزیکردن دەکەیتەوە.

**٦- نواندنی کەسێتی کەسانی دیکە**

لە ڕێگەی بەکارهێنانی ساختەی ناو پێگەی هەندێ لە کەسایەتیە ئایینی و سیاسییە بەناوبانگەکان کە سەدان و هەزاران شوێنکەوتوویان هەیە، توانراوە لاپەڕەی تایبەتی ئەو کەسایەتییانە تێکبدات، ئەو کەسایەتییانە تووشی شەرمەزاری و شەرمئاوەری زۆر بکات بەهۆی بڵاوکردنەوەی نووسین و ناوەڕۆکی نەشیاو بە پێگە و کەسێتی ئەوان.

ئەوەی تێبینی دەکرێ خاڵی هاوبەش لە نێوان هەموو ئەو مەترسی و هەڕەشانە بریتییە لەو متمانە کوێرانەی بەکارهێنەر هەیەتی لە بەکارهێنانە کۆمەڵایەتییەکانیدا لە تۆڕی ئینتەرنێتدا وەك پۆستی ئەلیکترۆنی و بەرنامەکانی چات لە بەردەستی هەمولایەکە، زۆربەمان بە متمانەوە کلیکدەکەین لەسەر ئەو لینك و وێنە و ڤیدیۆیانەی لەلایەن هاوڕێکانمانەوە بۆمان ڕەوانەدەکرێن.

## چۆن پارێزگاری لە تایبەتمەندییەکانت دەکەی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان؟

بۆ ئەوەی پارێزگاری لە زانیارییەکانت بکەی لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا پێویستە ئەم خاڵانە بەهەند وەربگری:

- بە وریاییەوە مامەڵە بکە

هیچ شتێك مەنووسە لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان یان هەر شێوەیەکی بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی لە ئینتەرنێت" کە ڕووبەڕووی مەترسی دزینی ناسنامە و زانیارییە کەسییەکانت بکاتەوە، بە وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ نووسینی زانیارییە

تایبەتییەکانت بکە لەوانەی پەیوەندی هەیە بە ناوی کەسی، بازرگانی، ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆن و مۆبایل و پۆستە زانستی و ئیدارییەکان و ڕێکەوتی لەدایکبوون، هەروەها خشتەی کارنامەی ڕۆژانەی خۆت و ئەو زانیارییانەی پەیوەستن بەخێزانەکەتەوە، بۆیە باشتر وایە ئەم زانیارییانە لای خۆت پارێزگاری لێبکەی نەوەك دواتر لە دژی خۆت بەکاربهێنرێتەوە.

- بەگومان بە

ڕاستە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان پریەتی لە زانیارییە بازرگانی و بێبەرانبەرە بە سوودەکان، لە هەمان کاتدا بڕیکی زۆری لە زانیاری ساختە وهەڵگری پرۆگرام و ڤایرۆسە زیانبەخشەکان، بۆیە بە بیرێکی ورد و واقیعیانە سەیری ئەو شتانە بکە لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و ئینتەرنێت دەتەوێ بیخوێنیتەوە، ئەگەر ئامۆژگاری بێت بۆ خاوەن پشکەکان یان هەواڵی بەپەلە یاخود ئابڕووچوونی سیاسی و پڕوپاگەندە و واتەوات بوو، لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان زۆرن ئەوانەی درۆدەکەن بۆ بەدەستهێنانی بەرژوەندی تایبەتی خۆیان، هەندێك لە بەکارهێنەرانیش وەك تووتی وان تەنها شتەکان دەڵێنەوە بێئەوەی دڵنیابن لە ڕاست ودروستی ئەو زانیارییانە.

- خاوەن بیرکردنەوەی قوڵ بە

کەس نیە لە ئێمە حەز بەو کەسانە بکات زۆر دەڵێن یان باس لە شتێك دەکات شارەزایی لێنیە یاخود بانگەشەی هەبوونی شتێك دەکات لە واقیعدا نیەتی، لە ئینتەرنێتدا بە تایبەتی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان خەڵکانێك هەن لەپەنای ناوی خوازراوەوە دەستدەکات بە بڵاوکردنەوەی درۆ و شتی زیانبەخش بە بەها و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە یاخود بەبێ بەڵگە و بنەمای ڕاست بە جنێو و ناوزڕاندن و خراپەدانەپاڵ هێرش دەکاتە سەر هەندێ کەس و لایەن، لێرەدا دەبێت بەکارهێنەر دوو جار بیربکاتەوە بەرلەوەی بۆچوونی خۆی لەوبارەوە بنووسێ، دواتر بیخاتە خانەی هەندێ کێشە و گرفت کە ئەو لێی بێنیاز بوو.

- بە ئەتەکێت و ڕێزەوە مامەڵە بکە

ئەگەر ویستت وێنە یان ڤیدیۆیەك یاخود نامەیەك لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بڵاوبکەیتەوە ئەوا دڵنیابە لەوەی ئەو شتەی بڵاویدەکەیتەوە لە جوانترین شێوە بە

دەردەکەوێ، چونکە ئەو شتانە گوزارشت لە تۆ و بیروبۆچوونەکانت دەکەن، بۆیە لە شێوەی کەسی بێ ڕێز یان گاڵتەجارِ خۆت بەدەر مەخە.

- بە ئاگا و چاوکراوە بە

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان خەڵکانێك بە شێوەیەکی جیاواز بگرە پێچەوانە لەگەڵ واقیعدا خۆیان دەردەخەن، بۆ نموونە ئەگەر لەگەڵ کەسێك چات بکەی بانگەشەی ئەوە دەکات بەڕێوبەری کۆمپانیایەکی گەورەیە، بەڵام ڕەنگە لە واقیعدا منداڵێکی هەرزەکار یان زیندانییەکی حوکمدراو بێت بە زیندانی هەتاهەتایی، لەبەرئەوە هەمیشە لە ناسنامەی کەسەکان دڵنیاببەوە کە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەی، بەدوایاندا بگەڕێ و لەو زانیارییانە بکۆڵەوە بۆتی ڕەوانەدەکەن.

- چاو بخشێنەوە بەسیاسەت و ڕێنماییەکانی تایبەتمەندیی

هەموو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کۆمەڵێك بنەما و ڕێسایان دیاریکردوە بۆ ڕێگەدان بەو زانیارییانەی تێیدا بڵاودەکرێنەوە، ڕەنگە ئەو بنەمایانە بە گونجاو ببینی یانیش بەدڵت نەبێت، بۆیە کاتی تەواو تەرخانبکە بۆ خوێندنەوەی ئەو بنەما و ڕێسایانە، چونکە بە ڕوونی باس لەو زانیارییانە دەکات لەبارەی تۆ ئاشکرادەکرێت یان دەفرۆشرێتەوە بەلایەنی دیکە، هەموو ئەو شتانە بە ڕوونی دیاریبکە کامەت بەدڵە و کامەشت بەدڵ نیە و لەسەر ئەو بنەمایەش مامەڵە لەگەڵ تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بکە.

## ئالوودەبوون بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

لایەنێکی دیکەی بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بریتییە لە ڕەهەندە دەروونییەکانی و ئەو دەرهاویشتە نەرێنیانەی لە وابەستەبوونی زیاد لە پێویست بە ئینتەرنێت دەکەوێتەوە بە شێوەیەکی گشتی و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە تایبەتی لە ڕووە زانستییەکەیەوە بە (ئالوودەبوون) ناودەبرێت، میدیای نوێ و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان هۆکارێکی تەکنەلۆژیایی نوێیە وەك هیچ هۆکارێکی دیکە نیە لەوەو پێشتر بینیبێتمان، چونکە ئاست و جۆری زانیارییەکانی بە شێوەیەکی زۆر **سەرنجڕاکێش** بەرزکردۆتەوە، بۆیە ئەو نیشانانە لەسەر تاك دەردەکەون کە ناونراوە ئالوودەبوونی ئینتەرنێت. ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمجار بۆ ئەو پزیشکە دەگەڕێتەوە ناوی (ئیفان جولد بیرج) بوو وەك گاڵتەیەك لەسەر چات کاتێك گفتوگۆی لە ڕێگەی تۆڕە

کۆمەڵایەتییەکانەوە دەکرد، لێکچوونێکی بینی لە نێوان ئالوودەبوون و پشتبەستن بە مادده هۆشبەرەکان و لەگەڵ رەفتاری **پەیوەستبوون** بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە، ناوینا (ئالوودەبوونی ئینتەرنێت یاخود تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان).

## نیشانەکانی ئالوودەبوون

ئەم ئالوودەبوون بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەوە پێناسە دەکرێت بەکارهێنانێکی ناهاوسەنگ و ناتەندروستانەی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانە و دەبێتە دروست بوونی شڵەژانی دەروونی و کۆمەڵایەتیی، زیاتر لەم ڕواڵەتانەی خوارەوە دەردەکەوێت:

١- زیادەڕۆیی: بەکارهێنەر بەردەوام ئارەزوو دەکات بۆ کاتێکی زیاتر بەدیار ئینتەرنێتەوە بێت بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی کە جاران بەکاتێکی کەمتر دەگەیشتە حاڵەتی تێربوون.

٢- وابەستەبوون: لەئەنجامی زیادەڕۆیی کردن لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت، وابەستەبوونێکی نائاسایی لە نێوان بەکارهێنەر و ئینتەرنێتەوە دروستدەبێت، بە ڕادەیەك هەر دابڕان و دووركەوتنەوەیەك لە ئینتەرنێت ئەگەر بۆ ماوەیەكی کەمیش بێت بارێکی دەروونی و جەستەیی نالەباری بۆ دروستدەکات، تووشی دڵەڕاوکی و شڵەژانی دەکات، خۆ ئەگەر ماوەی دووركەوتنەوەکە درێژەبکێشێت ئەوا لایەنە دەروونیەکەی دەگاتە ئاستی خەمۆکی و دڵتەنگی لە ڕادەبەدەر.

٣- گۆشەگیری: ئالوودەبوون وادەکات لە کەسی توشبوو دەستبەرداری ئەرکە خێزانی و کۆمەڵایەتیی و وەزیفییەکانی ببێت.

٤- ئارەزووی بەردەوامبوون لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت سەرباری ئەو کێشە و گرفتانەی بۆی دروستبووە وەك تێکچوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان یان دواکەوتن لە چوونە سەرکار.

٥- کەمبوونەوەی ماوەی خەو و زۆربوونی حاڵەتی خەوتن بە دانیشتنەوە و بەئاگاهاتنی لە ناکاو و کردنەوەی ئینتەرنێت وسەیرکردنی پۆستی ئەلیکترۆنی و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان تا بزانی کێ پەیوەندیکردووە.

٦- کەسی ئالوودەبوو بەردەوام قسە لەبارەی ئینتەرنێت دەکات و ئارەزووی ئەوە دەکات ئەو شتانەی بینیویەتی و سەرنجی ڕاکێشاوە بۆ دەوروبەرەکەی باسی بکات.

## هۆكارەكانی ئاڵوودەبوون

ئاڵوودەبوون بە شێوەیەكی گشتی كۆمەڵێك هۆكاری خودی وبابەتی هەیە كە دەكرێ بۆ ئاڵوودەبوون بە ئینتەرنێت و تۆڕە كۆمەڵایەتییەكانیش ڕاست بێت لەوانەش:

١- دەستبەتاڵی و بەسەربردنی كاتێكی زۆر بەبێ ئەنجامدانی كارێك ئەو كەسە تووشی بێزاری و وەڕسبوون دەكات و بەدوای شتێك دەگەڕێت ئەوكاتە زۆرەی بۆ پڕبكاتەوە.

٢- تەنیایی و نەبوونی هاوڕێ یان دەستڕانەگەیشتن بە هاوڕێكان یاخود حەزنەكردن بەهاوڕێیەتی و دروستكردنی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان.

٣- بوونی كێشە و گرفتی ئابووری وەك بێكاری و هەژاری ڕووبەڕووی فشاری دەروونی زۆری دەكات و ناچاردەبێت بەهەر شێوەیەك بێت لە ڕێگەی بەكارهێنانی ئینتەرنێتەوە خۆی لەو كێشە و فشارنە بدزێتەوە.

٤- هۆكارێكی دیكەی ئاڵوودەبوون بریتییە لەو خزمەتگوزارییە **سەرنجڕاكێش** و بێ شومارانەی ئینتەرنێت و تۆڕە كۆمەڵایەتییەكان بەردەستیانكردوە بۆ بەكارهێنەران.

٥- هەندێ نەخۆشی دەروونی و ناتەواوی جەستەیی پاڵنەرن بۆ ئەوەی بەكارهێنەری ئینتەرنێت ئەو خەم و مەینەتیانەی بەو هۆیەوە تووشی بووە ئەگەر بە شێوەیەكی كاتیش بێت لەبیریان بكات.

## كاریگەرییە نەرێنییەكانی ئاڵوودەبوون

### لەلایەنی تەندروستییەوە:

١- كەمبوونەوەی ماوەی خەوتن و بەردەوام هەستكردن بە ماندوویەتی و داهێزران و خەواڵویی.

٢- زیانگەیشتن بە لایەنی جەستەیی وەك دەست بەهۆی زۆر نووسین وبەكارهێنانی ماوس، چاو بەهۆی ئەو تیشكە زیانبەخشانەی لە شاشەی كۆمپیوتەرەوە دەردەچێت، بڕبڕەی پشت بەهۆی زۆری ماوەی دانیشتن و جووڵەنەكردن.

٣- ئاڵوودەبوونی ئینتەرنێت کەسی توشبوو ڕووبەڕووی ئەگەری قەڵەوبوون دەکاتەوە لەگەڵ ئەو نەخۆشیانەش بەو هۆیەوە تووشیان دەبێت.

**لەلایەنی دەروونییەوە:**

١- چوونە نێو ئەو جیهانە وەهمی و گریمانەییەی تۆڕی ئینتەرنێت پێشکەشی دەکات، کەسی ئاڵوودەبوو بە ڕادەیەك دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەکانی، ناتوانێ ئەو جیهانە وەهمیە لەجیهانی واقیعی لەیەك جیابکاتەوە.

٢- لاوازبوونی تواناکانی تاك بۆ دروستکردنی کەسێتییەکی دەروونی دروست، بتوانێ بە شێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ کۆمەڵگە و واقیعدا کارلێك بکات.

**لەلایەنی کۆمەلایەتییەوە:**

١- ئاستی کارلێکی کۆمەڵایەتیی تاك بەرەو کەمبوونەوە دەچێت و زیاتر حەز بە گۆشەگیری دەکات.

٢- کەمبوونەوەی ئاستی چاوەدێری خێزانی بەسەر منداڵ

٣- زیادبوونی ڕێژەی لە یەك هەڵوەشانەوە وپچڕانی شیرازەی کۆمەڵایەتیی و خێزانی.

٤- دزەکردنی ئەو بەها کۆمەڵایەتییە خراپانەی تاك لە ڕێگەی ئینتەرنێت و کارلێکردن لەگەڵ جیهانی دەرەوە وەریدەگرێت، بەمەش بەها و دیاردەی ئەوتۆ بڵاودەبنەوە بە کۆمەڵگە نامۆ و نەگونجاوە.

بەڵام یەکەم کەس وەك چەمکێکی زانستی کاری لەسەر چەمکی ئاڵوودەبوونی ئینتەرنێت (internet addiction) کرد زانای دەروونناسی ئەمریکی د.کیمبرلی یۆنگ (Kimberly Young) بوو لە ساڵی(١٩٩٤) توێژینەوەی لەسەر ئەم دیاردەیە لە وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەستپێکرد، یۆنگ بەمشێوەیە پێناسەی ئەم چەمکەی کردوە " بریتییە لە بەکارهێنانی ئینتەرتێت بۆ ماوەی زیاتر لە (٣٨) کاتژمێر لە هەفتەیەکدا" هەروەها سەنتەرێکی چارەسەرکردن و توێژینەوەی تایبەت بەم دیاردەیەی دامەزراند.

لە دەستنیشانکردنی واتای ئالّوودەبوون لە بواری ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەلاّیەتییەکاندا بۆچوونی جیاواز هەیە هەندێك لە زاناکان دەلّێن ئالّوودەبوون ئاماژەیە بۆ ئەو ماددانەی مرۆڤ وەریاندەگرێت، پاشان ناتوانێت وازیان لێبهێنێت، بەلاّم هەندێکی دیکەیان لەگەلّ ئەم بۆچوونەدا نین وایدەبینن ئالّوودەبوون نەتوانینی مرۆڤە بۆ وازهێنان لە شتێك بەو مەرجەی زیاتر پێویستی بەو ماددەیە ببێت و بە بەردەوامی، هەندێکی دیکە دەلّێن بەکارهێنانی زۆری تۆڕە کۆمەلاّیەتییەکان ئەو خولیایە بەرگری لێناکرێت. زاناکان دوو جۆر ئالّوودەبوون دەستنیشان دەکەن:

یەکەم: ئالّوودەبوونی فسیۆلۆژی: تێیدا خانەکانی مرۆڤ لە کارکردن دەوەستێت ئەگەر ئەو ماددە هۆشبەرە وەرنەگرێت، لەم باردەدا نەخۆش جۆرەها نیشانەی بە ئازار و نارەحەتی دەبێت.

دووەم: ئالّوودەبوونی سایکۆلۆژی: ئەمە بریتییە لە خوویەکی بەهێز دەست بەسەر مرۆڤدا دەگرێت و بێ ئیرادە و لاواز و بێ دەسەلاّتی دەکات لە بەردەم خولیایەکی توند بۆ تێربوونی ئەو خووە بەهەر ڕێگەیەك بێت، مەترسییەکانی ئالّوودەبوونی سایکۆلۆژی هیچی کەمتر نییە لە مەترسییەکانی ئالّوودەبوونی فسیۆلۆژی، لە هەردووکیاندا مرۆڤ دەبێتە کۆیلەی بێ دەسەلاّتی خوویەك. کەواتە بەپێی ئەم ڕاڤەکردنانە بێت ئەوا ئالّوودەبوونی تۆڕە کۆمەلاّیەتییەکان جۆرێکە لە ئالّوودەبوونی سایکۆلۆژی. خراپ بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەلاّیەتییەکان پشتبەستنی دەروونی بۆ ئینتەرنێت دروستدەکات، ئەمجۆرە وا لە تاك دەکات ئالّوودەبوونی ڕەفتارێك یان هەستێك بێت کامەرانییەکی کاتی پێببەخشێت، ئەم کامەرانییە کاتیە ڕایدەکێشێت بۆ دووبارەکردنەوە و چالاکی ئاسایی ڕۆژانە ئەگەر زۆر دووبارەبووەوە دەبێت بە خویەك، وەك زۆر خواردن، سەیرکردنی تەلەفزیۆن، کەواتە لەوانەیە ئالّوودەبوون لەسەر چالاکییە پێویستەکانی ڕۆژانەش دروستببێت، پێیدەوترێ پشووی ئالّوودەبوون. بەڕای سمیس (Simith) ئەوە فاکتەرە دەرەکییەکان نین تاکەکان تووشی ئالّوودەبوون دەکەن، بەلّکو کەسی ئالّوودەبوو هەیە (Addictiv) Personalities) ئەوانەی لە ژیانی واقیعی ڕادەکەن، ئەو کەسانەن زیاتر دەبنە ئامانج بۆ زووتر تووشبوون بە ئالّوودەبوون. بەلاّم کیلی (Kelly) دەلّێت دیزاینی بەرنامەکانی تۆڕە کۆمەلاّیەتییەکان وەك پرۆگرامی یاریەکان ئەوەندە بە شێوەیەکی **سەرنجڕاکێش** دروستدەکرێن ئەوە دەبێتە هۆکاری وروژاندنی خەیالّ و تێربوونی وەهمی و

چێژوەرگرتن و بەدیهێنانی خود، ئەو کەسەی بەکاریدەهێنێت هەست بە بەهێزی دەکات و وادەزانێت خۆی شەڕدەکات و توانای سەرکێشیکردنی هەیە، هەر کەسێك بەپێی پێویستییەکانی و قەرەبووکردنەوەی نوشستییەکانی، هەست بە پلەوپایە و گرنگی خۆی لە ڕێی ئەمجۆرە پرۆگرامانە دەکات، ئەمەیە وایکردوە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان خۆی ببێتە ئەو ماددەیەی ئەگەری ئاڵوودەبوونی هەیە.

لە ڕوانگەی ئەم دوو بۆ چوونەی سەرەوە پرسیارێك دێتەپێشەوە: ئایا ئەوە سروشتی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان خۆیەتی ئاڵوودەبوون دروستدەکات ؟ یان ئێمە خۆمان تاکەکان (کەسێتی ئاڵوودەبوو یان ئامانج لێگیراو) ئاڵوودە بە بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەبین؟ زۆر توێژینەوە ئەنجامدراوە لە ڕوانگەی بۆچوونی دووەمیانەوە (کەسێتی بە ئامانج لێگیراو) بۆ شلەژانی ئاڵوودەبووی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و ڕاکردن لە واقیعەکە دەگەڕێتەوە وەك توێژینەوەی (موریسۆن و ئەوانی دی(٢٠١٠) ئاماژەی بەوەکردوە پەیوەندی هەیە لە نێوان خەمۆکی و ئاڵوودەبوونی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا، هەروەها توێژینەوەیەکی دیکە لە پەیمانگای توێژینەوەی شێوازی ژیان و ئاڵوودەبوون لە هۆڵەندە لە ناوچەی ڕۆتردام ئەنجامدراوە لەسەر (٥١٢) کەس لە نێوان تەمەنی(١٥-١٤) ساڵدا، ئەم توێژینەوەیە بەوەگەیشت بەکارهێنانی زۆر و بە ناچاری بۆ تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان نیشانەیە بۆ ئاستی بەرزی خەمۆکی. هەروەها توێژینەوەی یونگ و ڕۆجەرز (Young & Rojers1998) ئامانجی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان خەمۆکی و ئاڵوودەبوونی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بوو، ئەم توێژینەوەیە هەستا بە کۆکردنەوەی پرۆفایلی (٢٥٩) کەسی ئاڵوودەبووی ئینتەرنێت ناوەندی تەمەنیان (٣٢) ساڵ بوو، بەو ئەنجامە گەیشت خەمۆکی کلینیکی بە شێوەیەکی دیاریکراو بەندە بە زیادبوونی ئاستی بەکارهێنانی کەسەکەوە بۆ تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، توێژینەوەیەکی دیکەش ئەنجامدراوە جەخت لە سروشتی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان خۆی دەکاتەوە بۆ ئاڵوودەبوون، جیهانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بۆ خۆی فاکتەرێکی یاریدەدەرە بۆ ئاڵوودەبوون، بەهۆی سروشتە تایبەتەکەیەوە.

وەك توێژینەوەی برگەر (Berger) ئامانجی زانینی ئەوە بوو چۆن خوێندکارە بەهرەمەندەکانی قۆناغی ئامادەیی دەگەڕێن بە ناو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا وەك هاندەر و پاڵپشتێك بۆ بە دەستهێنانی پێشکەوتن لە بابەتی بیرکاری و زانستدا.

توێژینەوەی لیرنك و ڕیتر (Ritter & Lernk) ئەم توێژینەوەیە لای خوێندکارانی زانکۆ حەوت پرەنسیپی بۆ باش بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان هەڵسەنگاندووە، وەك چۆنیەتی پەیوەندیی خوێندکار بە زانکۆکانیانەوە، دروستکردنی پەیوەندی نێوان خوێندکاران خۆیان... هتد. (د.ناسان شابیر) پسپۆڕی نەخۆشییە دەروونییەکانە لە ئەمەریکا باوەڕی وایە زۆر بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بە بەردەوامی شلەژانیە لە خۆ کۆنترۆڵکردندا نەك ئاڵوودەبوون وەك خولیای دزیکردن، هەڵەیە ئەم بارە ئاڵوودەبوونە پۆلێن بکەین هێشتا وەك شلەژانی نەخۆشی نەناسراوە، ئاڵوودەبوونیش بۆ خۆی نیشانەیەکە لە نیشانەکانی شڵەژانە دەروونی و میزاجیەکان، ناوبراو پێشنیاری کردوە ئەم بارە ناو بنرێت (ئەنتەرنتوما) یان(ئیتۆمانیا) واتە هەرەسی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە جیاتی ئاڵوودەبوون، ئاماژەی بەوەشکردوە کلیلی چارەسەری ئەم بارە گەڕانە بە دوای دیاردەی دیکەی شلەژانی ئەقڵی لە نەخۆشەکەدا و چارەسەرکردنی بە تایبەت لە کاتێکدا ئەم حاڵەتە لە ئەنجامی شلەژانیەکی دیاریکراوەوە تووشی دەبێت و هانی دەدات بۆ زیاد بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان. بە پشتبەستن بەو ڕاپۆرتەی (دزیۆنگ) پێشکەش بە کۆنگرەی کۆمەڵەی ئەمەریکی بۆ پزیشکی دەروونی کراوە لە ساڵی (١٩٩٦) دا لە توێژینەوەیەکدا بە ناوی دەرکەوتنی شلەژانی کلینیکی نوێ یان ئاڵوودەبوونی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کۆمەڵەی ناوبراو لە ڕێنمایی دەستنیشان کردندا ئەم نیشانانەی کورتکردۆتەوە، ئاڵوودەبوونی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەستنیشان دەکرێت ئەگەر سێ یان زیاتر لەم نیشانانە هەبن لەکەسەکەدا بۆ ماوەی (١١) مانگ بە لایەنیکەمەوە پێویستی بە کاتێکی زۆرتر بێت بۆ مانەوە لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان تا هەست بە حەوانەوە، بکات، بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان خۆ خەریککردن بێت بۆ خاڵیکردنەوەی دەروونی یان خۆدوورخستەوە بێت لە نیشانەکانی دوورەپەرێزی زۆر زیاتر لەو کاتە بمێنێتەوە لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان کەسەکە دایناوە بۆ خۆی بەهۆی زۆر بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە وازبهێنێت لە چالاکیە خۆشەکانی دیکە وەك چالاکی پیشەیی یان کۆمەڵایەتیی گرنگ، زیانپێکەوتنی پەیوەندییەکان لە کاردا یان لە خوێندندا یان لە بواری پیشەییدا بە هۆی زۆر بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە و هەبوونی دوو یان زیاتر لە نیشانەکانی دوورەپەرێزی (Withdrawal symptoms) لە ماوەی ڕۆژێك تا مانگێکدا دروستبووبێت وەك

غەمباری (distress) یان زیانپێکەوتنی کۆمەڵایەتیی یان کەسی یان پیشەیی کە وروژان و لەرزین وەهم و خەون بینین بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە و جوڵەی ناچاری لە پەنجەکاندا دروستکردبێت.

میخائیل فینخل (Fenichel) دەڵێت: باشترین ڕێگەی کلینیکی بۆ دەستنیشانکردنی زۆر بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەیە کە بەراوردبکەی بە نیشانەکانی دیکەی ئاڵوودەبوو، لەو نیشانانەی لە ڕێنمایی (DSM-4) نووسراوە بۆ نەخۆشی قومار دەبینیت زۆر نزیکە لە نیشانەکانی ئاڵوودەبوون لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بریتییە لە شلەژان لە کۆنترۆڵکردنی پاڵنەرەکاندا، مەرج نیە ئاڵوودەبوون تەنیا لەسەر مادده هۆشبەرەکان بێت. بۆ دیاریکردنی نیشانەکانی شلەژانی قومار ڕاپرسیەك دارێژراوە لە هەشت پرسیار پێکهاتووە، هەمان ئەم پرسیارانە هەندێك گۆڕانی تێداکراوە لەوانەی لە ڕێنمایی (DSM-4) دا هاتوون بۆ ئەوەی وەك هۆکارێك بەکاربێت بۆ جیاکردنەوەی ئەو کەسانەی زۆر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەکاردەهێنن لەوانەی زۆر بەکاری ناهێنن، پرسیارەکانیش ئەمانەی لای خوارەوەن:

١. ئایا زۆر بیر لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەکەیتەوە، وەك بیرکردنەوە لەوەی چیت کردوە کاتێك بەکارتهێناوە، یان ئەگەر بچیتەوە سەری ئەمجارە دەبێت چی بکەیت؟

٢. ئایا هیچ جار هەوڵتداوە کە واز لە بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بێنیت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوویت؟

٣. ئایا هەست دەکەیت پێویستت بە کاتێکی زۆرتر هەیە بۆ بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان تا ڕازی بیت ولێی تێرببێت؟

٤. ئایا هەست بە نائارامی و شڵەژانی میزاج و توڕەیی دەکەیت کاتێك دەتەوێت بنووسیت لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان؟

٥. ئایا زیاتر لەو کاتەی بۆ خۆتت داناوە لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەمێنیتەوە؟

٦. ئایا تۆ پەیوەندییە گرنگەکانت یان کارەکەت یان خوێندنەکەت خەریکە لە دەست بدەیت یان لە دەستداوە بەهۆی بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە؟

٧. ئایا تۆ لەگەڵ دایك و باوکت یان لەگەڵ هاوسەرەکان درۆدەکەیت و ماوەی دانیشتنت لەسەر تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەشاریتەوە؟

٨. ئایا تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وەك ڕێگایەك بۆ ڕاکردن لە کێشەکان یان بۆ **کەمکردنەوەی** هەستی تورەیی و دڵەڕاوکێ و تاوان و خەمۆکی بەکاردەهێنیت ؟

ئەو کەسەی پێنج خاڵی ئەم پرسیارانە بە بەڵێ وەڵامبداتەوە ئەوە بە کەسێکی ئاڵوودەبووی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندادەنرێت. بەپێی ئەو بۆچوون و ئەنجامانەی باسکران، دیاردەی ئاڵوودەبوونی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وەك زۆربەی دیاردەکانی دیکە زۆر بۆچوونی جیاوازی لەسەر هەیە، هەندێك لەگەڵ ئەوەدان وەك جۆرە شلەژانییەك دابنرێت کە نزیکە لە نەخۆشی قومار یان هەر جۆرە ئاڵوودەبوونێکی دیکە، هەندێکیش ناڕازین لەسەر ناونانی بە ئاڵوودەبوونی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، واتە توێژینەوەکان نەگەیشتونەتە ڕێکەوتنێك لەمبارەیەوە، ئەمە **وادەکات** ببێتە بابەتێك شایەنی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە بێت.

## ماڵپەڕی فەیسبووك

ماڵپەڕی فەیسبووك چیە ؟

لاپەڕەی فەیسبووك لاپەڕەیەکی جیاوازە، دەکرێ گۆڕانکاری تێیدا ئەنجام بدرێت، ڕێگا بۆ بەکارهێنەر خۆشدەکات لەگەڵ بەکارهێنەرەکانی دیکە چالاکییەکان بە ڕێگایەکی نوێ ئەنجام بدرێن، لە ڕێگای لاپەڕەی فەیسبووك دەتوانرێت کاری بازرگانی لە نێوان بازرگان و بەکارهێنەرانی فەیسبووك بە نیشانەی بازرگانییەوە ئەنجام بدرێت. بەکارهێنەر لە فەیسبووکدا دەتوانێ هەواڵ و جموجوڵەکان لە ڕێگای کەناڵی تەکنەلۆژیاوە بگوازێتەوە، بەم هۆیەشەوە دەتوانیت فەیسبووکەکەت تایبەتمەند بکەیت بە بابەتی تایبەت بەخۆت و نیشانە و لۆگۆی پێشتر دابەزێندراو وەك فلاش پلەیەر، وێنەدانان و چەندین هەڵسەنگاندنی دیکە.

## چۆن بەکارهێنەر مامەڵە لەگەڵ فەیسبووك دەکات؟

بەکارهێنەرانی فەیسبووك بە ڕێگای جۆراوجۆر مامەڵە لەگەڵ لاپەڕەی فەیسبووکەکەی تۆدا دەکەن بۆ نموونە دەبنە هەواداری لاپەڕەی بزنس یان سەیرکردنی ڤیدیۆ یان بینەری بەرهەمەکەت یان وێنەی نێردراو و بەکارهێنانی داواکاریەکان

و...هتد. هەموو ئەو جموجوڵانە زانیاری و هەواڵ بە هاوڕێیانی بەکارهێنەر دەبەخشێ و هەر لەوێوە نوێترین کەمپەینی کڕین و فرۆشتن بڵاودەکرێتەوە. پرۆفایلی بەکارهێنەران ڕاستەقینەن و پەیوەندییان لەگەڵ بەکارهێنەرانی دیکە لەسەر بنەمای ڕاستیە بۆیە هێزی ئامۆژگاری و دۆزینەوە و پشتبەستن بە لۆگۆ و بەرهەمە تازەکان لە ڕێگای هاوڕێوە بە گەورەکراوی دەبینرێت.

کۆمپانیاو خاوەن لۆگۆ بازرگانییەکان ئەو دەرفەتەیان لەبەردەستە بەشداربووی زیاتر لە لاپەڕەکانیان کۆبکەنەوە و یارمەتیان بدەن لە بڵاوکردنەوەی کار و چالاکیەکانیان لە ڕێگای فەیسبووك، لەگەڵ زیادبوونی بەشداربووان لە لاپەڕەیەك هێندە زانیاری کۆمەڵایەتیی کۆمپانیاکان و خاوەن لۆگۆ بازرگانییەکان زیاد دەبێت و ڕاگەیاندن و پێگەی کۆمەڵایەتییشیان بەرەو هەڵکشان دەچێت.

## بەکارهێنەر چۆن لاپەڕەی فەیسبووك دەدۆزێتەوە

بەکارهێنەر دەتوانێ لاپەڕەی فەیسبووك بدۆزێتەوە لە ڕێگای ڕێبەری گەڕان و ڕاگەیەنراوی کۆمەڵایەتیی، ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتیی جۆرێکی هاندانی فەیسبووکە سێ شێوەی هەیە وەك ئەو چیرۆکانەی بە سپۆنسەری دارایی لایەنێکە، چیرۆکی پاڵپشتیکراوی دارایی کۆمەڵایەتیی، چیرۆکی کۆمەڵایەتیی، هەموو ئەمانە وەك هەواڵ دەردەکەون. چیرۆکە کۆمەڵایەتییەکان دروستکراون ئەوکاتەی هاوڕێکانی بەکارهێنەر چالاکیەك ئەنجامدەدەن لەسەر لاپەڕەی فەیسبووك. لاپەڕەکانی فەیسبووك ناوەڕۆکی گرنگ و دەرفەتی ئاوێتەبووی تێیدایە ئەوپەڕی توانای دروستکردنی دەرفەتی بڵاوکردنەوەی ڤایرۆسی لە کاتی بڵاوکردنەوەی ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتیی هەیە.

لە فەیسبووکدا هەواڵی خەوارزمیەی ئاڵۆز بەکاردەهێنرێت بۆ دیاریکردنی زۆرترین چیرۆکی پەیوەندیداری هەر بەکارهێنەرێك و دیاریکردنی ئەو هاوڕێیانەی بە کار و چالاکیەکانیەوە کاریگەربوون. ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتیی هەواڵی ئامادەکراوی لە ئەنجامی چالاکی بەکارهێنەر زیاددەکات بەهۆی وەرگرتنی نیشانەی بازرگانی.

**سوودی سەرەكی فەیسبووك چیە؟**

- زانیاری زیاتری بەكارهێنەر وەك وۆڵ پۆست و ئەپلۆدكردنی وێنە لە فەیسبووك و دروستكردنی (چیرۆكی كۆمەڵایەتیی ئەندامی) دەتوانرێت **بەكاربهێنرێت** بۆ دروستكردنی زانیاری كۆمەڵایەتیی.
- ناردنی نامە بۆ هاواداران لە كاتی پێویست.
- ئاسانی بەكارهێنانی لە بواری شیكاری و ئامرازی ڕاپۆرتكردن.
- لاپەڕەكانی فەیسبووك زانیاری و دیكۆمێنتی بە سوودی تێدا دانراوە، گونجاوە لەگەڵ تایبەتمەندییەكانی تۆدا.

**ئەوانەی خوارەوە داواكاری ئامادەكراون بە ئاسانی دەتوانرێت لە لاپەڕەی فەیسبووك لاببرێت**

چالاكی دانانی **چیرۆكەهەواڵ**، چالاكیەكانی دانانی خۆراكی چیرۆكی سادە.

كۆمەڵەی ئەرێنی دەبنە هەوادار زیادكردنی فلاشی داخوازینامە لەلایەن سەرپەرشتیار (ئەدمین).

وۆڵ پۆست لەلایەن بەكارهێنەر هاوبەشی و ناردنی لاپەڕە لەلایەن سەرپەرشتیار (ئەدمین).

چاوپێخشاندنەوە لەلایەن بەكارهێنەر ناردنی هەواڵ و لێدوان لەلایەن سەرپەرشتیار.

ئەبلۆد كردنی وێنە لەلایەن بەكارهێنەر تێبینیەكانی سەرپەرشتیار.

ئەبلۆد كردنی ڤیدیۆ لەلایەن بەكارهینەرەوە، چاككردنی زانیاری پڕۆفایل لەلایەن ئەدمین.

كارلێكردن لەگەڵ داخوازینامەكان.

**خەسڵەت و ڕەگەزەكانی فەیسبووك**

خەسڵەتی لاپەڕەی فەیسبووك نەرمونیانە بە ئاسانی لەلایەن بەڕێوەبەر دەتوانرێت لە ڕێگای هەڵگرتن و دانان (دڕاگ، درۆپ) چوارگۆشەكان بەگوێرەی ئارەزوو دابنرێن و چەندین بواری تێدا لە پێناو تەنسیقی بەكارهینەران جێگیركراوە وەك وێنەی بزنس و هەواداران و مینی فید.

## بەشە بەردەستەکان

أ- وێنەی بزنس گەورەترین قەبارەی پانیەکەی (٣٩٦) و بەرزیەکەیشی (X٣) پانی.

ب- زانیاری سەرەکی (زانیاری زیاد دەربارەی نیشانەی بازرگانی، جێگاکان پۆلینی تایبەتن بۆ ستونەکەت و دەتوانرێت بە بەتاڵی بەجێبهێلرێت.

ت- لە وۆڵدا بە کارهێنەران دەتوانن نامەت بۆ بنێرن.

پ- ئەنجومەنی گفتوگۆ: بەشداربووان دەتوانن تاوتوێی بەرهەمی تازە و خزمەتگوزاری و پلەی بەرزی ژیان بکەن.

ج- پەیوەندی: کلیك لەسەر (edit) بکە یان تواناکانی ئەدمین.

ح- هەوادار: ئەو بەکارهێنەرانە پیشاندەدات کە هەواداری بزنسێکن.

خ- ڤیدیۆ: ئەدمین دەتوانێ ئەبلۆدی بکات بۆ هاوبەشیکردن.

د- وێنە: ئەدمین دەتوانێ وێنە ئەبلۆدبکات و بەکارهێنەریش دەتوانێ بیسرێتەوە لە ڕێگای (تاگ).

ژ- ڕووداوەکان: کاتێك ڕووداوێك دادەبەزێنرێت لە تۆماری بەکارهێنەرەکە هەڵدەگیرێت.

## داخوازینامەی FBML

- ڕێگایەیکی ڕووناك لە بەردەمدایە بۆ برەودان بە داخوازینامەکانت وەك زانینی ڕای خەڵك، یاریەکان و پێشبڕکێ و گەڕانی بەرهەم و نەخشەو هتد..

- پشتیوانیکردنی (HTML) و فلاش و (CSS).

- پانیەکەی بەلایەنی زۆری (٣٩٦) پێکسل بۆ کۆلەگەی ڕاست و (٢٠٠) پێکسڵ بۆ چەپ و بەرزیکەشی تەنها دەبێت (x٣) پانی بێت.

- ئەوشێوەیەی ئێستا لەبەردەستە پاڵپشتی (جاڤاسکریپت و چوارچێوەی ئای ناکات هەرچەندە لەوانەیە شێوە بەرهەمهاتووەکانی هێندە ئەو پاڵپشتیە بکەن. (FBJS) برەوپێدەرەکان بەهێزتر دەکات و بە هەمان فەرمانی جاڤاسکریپت پاڵپشتی دەکات.

**چۆن دەست پێدەکەیت؟**

بنووسە www.facebook.com

١- دەستبکە بە دروستکردنی لاپەڕەکەت بە کلیککردن لەسەر edit page.

٢- وێنەیەك بۆ پڕۆفایلەکە ئەبلۆدکە، ئینجا وێنەیەکی بچووك لە بۆکسی هەوادارانی بەکارهێنەر و لاپەڕەکانی دیکە هەروەك لە ئەنجامی گەڕان دەردەکەوێت.

٣- پڕکردنەوەی گۆشەی زانیارییەکان، نووسراوی ئەو چوارگۆشانە لەسەر ڕووی لاپەڕە دەردەکەوێ کاتێ بەکارهێنەر لە وشەی سەرەکی دەگەڕێت.لەمە گرنگتر نووسراوەکە لە سەرەوەی لاپەڕە دەردەکەوێت **وادەکات** بەکارهینەر بە چاوتروکانێك بزانێت نیشانە بازرگانییەکە یان بەرهەمەکە کامەیە.

٤- ئەبلۆدکردنی وێنەو ڤیدیۆ بۆ ئەوەی دەستبکرێت بە گفتوگۆ، هەروەها ئەم کارە ڕەنگ و جوانی بە لاپەڕەکە دەدات.

٥- چەند ۆڵ پۆست و بابەتێکی گفتوگۆ دروستبکە بۆ ئەوەی یارمەتی بەکارهێنەران بدات هەست بەئاسوودەیی بکەن کاتێ سەرنجێکت بۆ دەنێرن.

٦- دانانی فلاش پلەیەر و بۆکسی جێگیری FBML لە بۆشایی لاپەڕەی داخوازینامەی پاڵپشتیکراو، ئەو داخوازینامەیە یارمەتیدەر دەبێت بۆ هەڵگرتنی داهێنراوەکان بۆ لاپەڕەکە.

٧- بەگەڕخستنی کەمپەینی ڕاگەیاندن بۆ برەودان بە لاپەڕەکە و بەرگریکردن لە نیشانەی بازرگانی و بوون بە هەوادار.

**ڕێنمایی و تایبەتمەندییەکانی بەرهەم**

- ستونی لای چەپ دانراوە بۆ دۆزینەوەی ئاڕاستە
- ستونی ناوەڕاست ئەوپەڕی قەبارەی (٣٩٦ )پێکسڵە
- ستونی لای ڕاست ئەوپەڕی قەبارەی (٢٠٠) پێکسڵە

**ڤیدیۆ /دەنگ**

- دەبێت بەکارهێنەر دەستپێشخەر بێت.
- ڤیدیۆی ئەپلۆد دەبێت لە خوارەوەی (١٠) مێگابایت بێت.

- ڤیدیۆی فەیسبووك و داخوازینامەی میوزیك پلەیەری دەخرێنەسەر ناوەڕۆك، بەشی داخوازینامەی (rd3) دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ خستنەسەر ناوەڕۆکی شوێنی دیکە.
- یاریدەدەری فۆڕماتی ڤیدیۆ بریتییە لە کویك تایم و ویندۆز میدیا و فلاش و (MPEG) و (MPEG-4) و (AVI) و ژمارەیەك فۆڕماتی دیکە.

**فلاش**

- دەبێت بەکارهێنەر دەستپێشخەری بکات
- نوسخەی جۆری ٨ بەسەندکراوە
- بەبێ چوارچێوەی ئای و بەبێ جاڤا سکریپت

**بڕۆوسەر**

- دەبێت بە چاکی کار بکات
- IE V6 and V7
- فایەر فۆکس V1.5 and V2.0
- سارفەری V2
- گۆگل کرۆم

**نامە ناردن**

- هیچ سنورێك نیە کە چەند نامە بۆ هەوادارانت دەنێریت.
- ئامۆژگاریت دەکەین زیاتر لە دوو ئایتم (ئامراز) لە مانگێکدا نەنێریت.
- بەیەکلکاندن (ئەتاچمێنت)ی فرەمیدیایی وەك ڤیدیۆ یان لینکی وێنەیی و ڤیدیۆیی و وێبسایت دەلکێنرێت، جۆری ئەو میدیایەی کە دەتەوێت ئەتاچی بکەیت بەندە لەسەر ئەو داخوازینامەیەی لەسەر لاپەڕەکەت داتمەزراندووە.

**ڕێنمایی گشتی**

- هەر ئەلقەیەکی فەیسبووك دەبێت سەرەتای کردنەوەی پەنجەرەیەکی نوێ بێت
- دەرکەوتن و وونبوونی لە ناکاو نابێ
- خەسڵەتەکانی لاپەڕە فرە جموجوڵە بەڵام تەنسیقی بەکارهێنەران لەم بڕگانە قفڵدراون: وێنەی بزنسی، مینی فید و هەواداران.

## **تویتەر**Twitter

لە ماوەی نێوان کۆتایی ساڵی (٢٠٠٧) و سەرەتای ساڵی (٢٠٠٨) خزمەتگوزارییەکی نوێی ئاڵوگۆڕکردنی میدیای کۆمەڵایەتیی سەریهەڵدا لە نێو **پێشوازی** پڕ لە جۆش و خرۆشی ڕێبەران و لایەنگرانی میدیای کۆمەڵایەتیی، لەو کاتەوە گروپە چالاکەکان لەسەرانسەری جیهان دەستیانکرد بە بەکارهینانی تویتەر (www.Twitter.com) لەم نووسینەدا پێناسەیەکی ئەم ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییە دەکەین لەگەڵ ڕوونکردنەوەی ئەو خزمەتگوزاریانەی پێشکەشی بەکارهێنەرانی دەکات.

## **تویتەر چیە؟**

تویتەر خزمەتگوزاری نووسینی بچووك و سنورداره، بەکارهێنەر تێیدا دەتوانێت بە درێژایی (١٤٠) وشە نامە بڵاوبکاتەوە، لە چالاکیەکی هەواڵنێری کەسیدا دەتوانێت زانیارییە بڵاوکراوەکان نویٚ بکاتەوە ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی ماڵپەڕی تویتەر، هەروەك دەتوانێت سوود لەلایەنە پراکتیکیە مەکتەبیەکان یان مۆبایل وەربگریٚ لە نێویشیاندا نامەناردن.

بۆ گەیشتن بەم چالاکی و ناوەڕۆکە هەواڵیانە دەکریٚ ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی لاپەڕەی بەکارهێنەری تویتەر، هەر لە ڕێگەی ئەو ماڵپەڕەوە بەکارهێنەر دەتوانیٚ سوودمەندبێت لە نوێکردنەوەی ناوەڕۆکە هەواڵیەکان لە ڕێگەی مۆبایل یان هەر شێوازێکی دیکەی خزمەتگوزاری بەکارهێنەر هەڵیدەبژێرێت، ئەم پرۆسەیەش لە بڵاوکردنەوەدا بە (بەدواداچوون) ناودەبرێت بۆ نموونە ئەگەر بەکارهێنەر بەدوای چالاکی بڵاوکردنەوەی هەواڵی کەسێکی دیکەدا چوو ئەوا دەتوانیٚ بە بەردەوامی ئاگای لە نوێکردنەوەی چالاکی ئەو کەسە بێت لە ڕێگەی لاپەڕەی تایبەت بە خۆی یان هەر لایەن و خزمەتگوزارییەکی مەکتەبی یان مۆبایل بەکارهێنەر هەڵیدەبژێرێت، ئەو کەسە دانیشتوی ئەمەریکا یان کەنەدا یان هیندستان بێت دەتوانیٚ لە خزمەتگوزاری کورتە نامە سوود وەرگرێت لەم سەردەمەدا بووەتە ئامرازێکی کاریگەری پەیوەندیکردن و بڵاوکردنەوەی زانیاری.

سەرباری ئەم لایەنەش تویتەر روخسارێکی کۆمەڵایەتییشی هەیە بەوەی لەپاڵ بڵاوکردنەوەی چالاکی هەواڵنێری بەکارهێنەردا، چالاکی هەواڵنێری کەسانی دیکە و ئەوانەش بەدواداچوون دەکەن بۆ ئەو چالاکیە هەواڵنێریە بڵاودەکاتەوە، ئەمە دەرفەت دەرەخسێنێ لە بەردەم بەکارهێنەراندا بەدوای هەواڵی ئەو کەسانەدا بچن هاوخولیان و گرنگی بە هەمان بواری ئەو دەدەن.

لە سەرەتادا تویتەر هەوڵێك بوو بۆ **وەڵامدانەوەی** ئەو پرسیارەی (ئێستا چی دەکەیت؟) لە ڕێگەی **وەڵامدانەوەی** پرسیارەکەش هاوڕێیە بەکارهێنەرەکانی تویتەر دەرفەتی ئەوەیان هەبێت هەواڵە جۆربەجۆرەکانی خۆیان بڵاوبکەنەوە و هاوڕێیەکانیان ئاگادار بکەنەوە.

تا ئیستاش ئەو خزمەتگوزارییە بایەخی خۆی لە دەستنەداوە، یەکێکە لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی ماڵپەڕی تویتەر و بڵاوبوونەوەی بەو خێراییە لە هەموو جیهاندا.

هەروەك تویتەر ئەوەشی دەرخست هەر سیستەم و پرۆگرامێك هەرچەندە سادە و بچووکیش بێت ڕەنگە بەکارهێنەر بە ئاراستەیەکی چاوەروان نەکراوی دیکە بەکاریبهێنێت، بۆ نموونە تویتەر بۆ چەندین مەبەستی جیاجیا بەکارهینراوە لە بنەرەتدا بۆ ئەو کارە دروستنەکراوە، بەڵام بەکارهێنەر توانیویەتی سوود لە تواناو خزمەتگوزارییەکانی وەربگرێ لەو لایەنەدا، ئەو نمونانەی خوارەوە لایەنەکانی سوودوەرگرتن لە خزمەتگوزارییەکانی تویتەر **ڕووندەکەنەوە**.

## زاراوەکانی تویتەر

* نامەی تویتەر ١٤٠ وشە لەخۆیدەگرێت.

* چالاکی هەواڵنێری لەو ڕێگەیەوە بەکارهێنەر هەواڵەکانی خۆی بڵاودەکاتەوە.

* بەکارهێنەری تویتەر هەرکەسێکە تویتەر بەکاربێنێت.

* بەدواداچوون لە ڕێگەیەوە دەتوانێ بە دوای چالاکی و هەواڵی بەکارهێنەری تویتەردا بچیت.

* بەدواداچوو ئەوانەن کە بڕیاریانداوە بە دوای چالاکی و هەواڵە بڵاوکراوەکانی تۆدا بچن.

* هێمای هاوبەش یان لێکدراو ئەگەر بە دوای هیمای # کەوتی، ئەوا ئەو وشە کلیلیە دەرفەت دەرەخسێنێ لە بەردەم بەکارهێنەردا نامەکانی لە چوارچێوەیەکی فرەوانتر بڵاوبکاتەوە و یارمەتی تەواوی بەکارهێنەرانیش دەدات ئەوانەی گرنگی دەدەن بە بابەتێکی دیاریکراو یان وشەیەکی کلیلی دیاریکراو لەوەی ناوەڕۆکە هاوبەش و پەیوەستەکان بدۆزنەوە.

* چالاکی هەواڵنوسی: چالاکی هەواڵنوسی کۆمەڵێك نامەی نوێیە، نامەکان لە نوێوە بەرەو کۆنتر بەدەردەکەون، ئەو نامانە لە ڕێگەی سیستەمی (RSS) و لاپەڕەیەکی تایبەتی ئینتەرنێت بەدیواری دابەشدەکرێ.

* فەزای تویتەر ئەو پانتاییەیە کە بەکارهێنەرەکان هەواڵی تێیدا بڵاودەکەنەوە و لەگەڵ بەکارهێنەرەکانی دیکە بەیەکدەگەن.

**بەکارهێنانی ١: بڵاوکردنەوەی وشە**

یەکێك لە بەربەستە گەورەکانی بەردەم سیاسەتمەدارانی ئەم سەردەمە ئەوەیە پێویستە هەواڵی تایبەت بەو پرس و بابەتانەی داکۆکی لێدەکەن بە شیوازێکی جیاواز لە ئامرازە کۆنەکانی میدیا **بڵاوبکەنەوە**.

زۆر کات هەیە میدیا بایەخی ئەوتۆ نادات بەو چیرۆکانەی سیاسەتمەداران دەیانەوێ **بڵاویبکەنەوە**، بەڵام تویتەر دەرفەتێکی ڕاستەقینەی لە بەردەم ئەوانەدا رەخساند بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو چیرۆك و هەواڵانە لەسەرانسەری جیهاندا تەنانەت ئەگەر هەواڵەکە لە قۆناغەکانی سەرەتاییدابێت.

لە کانونی یەکەمی (٢٠٠٧) بەنازیر بۆتۆ ئەوکات سەرۆکایەتی پارتی گەلی پاکستانی بەرهەڵستکاری حکومەتی دەکرد لە نێو گەرمەی خۆپیشاندانێکی جەماوەریدا تیرۆرکرا، ئەم ڕووداوە هەر بەتەنها لە بلۆگەکان بایەخی پێنەدرا، بەڵکو لە ڕێگەی بەدواداچوونە هەواڵیەکانی تویتەریش تیشك خرایە سەر ڕووداوەکە و بەکارهێنەرە پاکستانیەکانی ماڵپەڕ لەوانەش د.ئەواب ئەلفی و دینا مهتا راویژکاری میدیای کۆمەڵایەتیی دەستیانکرد بە چاوەدێریکردنی سەرچاوە ڕۆژنامەوانیە ناوخۆیی و نێودەوڵەتیەکان و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و لێدوانەکانیان لە نامەکانی تویتەر و بلۆگەکانیاندا، هەروەها هەندێ بەکارهێنەری ناسراوی وەك (دەیڤ ونیەر)(لۆرا فینتۆن)(دینیس هاوڵت) لە لاپەڕەی تایبەت بە خۆیان لە تویتەر چەندین گرتەی

ڤیدیۆیی و دەنگیان بڵاوکردەوە لەسەرچاوە هەواڵیە جیاوازەکان وەریانگرتبوو بەمەش تویتەر پێینایە قۆناغێکی نوێی بەکارهێنان لە چۆنیەتی ڕووماڵکردنی دوایین ڕووداوەکانی شاری ڕەواڵبەندی و دەرەنجامە پێشبینیکراوەکانی تیرۆرکردنی بۆتۆ.

### بەکارهێنانی ٢: هەڵمەتەکانی میدیای کۆمەڵایەتیی

پرسی راپۆرتی دەنگدانی تویتەر و هەڵمەتی دژ بە موترین (ئەمەریکا)

یەکێك لە کێشە بەردەوامەکانی چالاکوان و ڕێکخراوە ناحکومیەکان بریتییە لە ڕووکردنە میدیا کۆمەڵایەتییەکان کاتێك میدیای کلاسیکی چالاکی و هەواڵەکانیان فەرامۆش دەکات، چۆن دەتوانی فشار دروستبکەی لەسەر حکومەت و کۆمپانیاکان؟ هەندێ گروپ لە ڕابردوویەکی نزیکدا ئەزمونێکی سەرکەوتوویان هەبوو لە چۆنیەتی سوودوەرگرتن لە تویتەر بە شێوەیەکی سەرکەوتوو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان و بۆ ئەوەی چیرۆك و هەواڵەکانیان ڕەهەندیکی فرەوانتر وەربگرێ.

یەکێك لەو نموونانەش لەوبارەوە راپۆرتی دەنگدانەکەی تویتەر بوو دەرفەتی رەخساند لە بەردەم ژمارەیەکی زۆری خۆبەخشە ناحیزبییەکان ماڵپەڕی تویتەر بەکاربێنن بۆ دەنگدان لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتیەکانی ئەمەریکای ساڵی(٢٠٠٨)، هەروەها چاوەدێریکردنی میکانیزمی دەنگدان لەو هەڵبژاردنە، ئەمە لەو کاتەدا دەستیپێکرد هەریەك لە (نانسی سکۆلا) و (ئەلیسۆن فاین) بیرۆکەیەکیان لە تویتەر خستەڕوو بۆ ئەگەری بەکارهێنانی ماڵپەڕەکە بە سوودوەرگرتن لە (خزمەتگوزاری هێما هاوبەشەکان) بۆ چاوەدێریکردنی پرۆسەی دەنگدان لەو هەڵبژاردنەدا، لێرەوە هەندێ لە خۆبەخش و شارەزایانی ئینتەرنێت پرۆگرامێکیان دروستکرد بۆ کۆکردنەوەو هەڵگرتنی نامە هاوبەشەکانی دەنگدان لە ڕۆژی هەڵبژاردندا، دواتر ناونرا بە (راپۆرتی تویتەر بۆ دەنگدان)، ئەو چالاکیەش دەنگدانەوەیەکی فرەوانی هەبو لەلایەن ڕۆژنامەو میدیاکانی ئەمەریکا لە پێناو فەراهەمکردنی دەرفەتی یەکسان لە بەردەم دەنگدەراندا لەهەر کوێیەکدابن.

## بەکارهێنانی ٣: هەماهەنگی لە کاری بەکۆمەڵدا

پرسی ئاگرکەوتنەوەکانی شاری سان دیگۆ لە (ئەمەریکا)

لەهەر کارێکی دەستەجەمعیدا بەردەوام ڕێکخەرەکان ڕووبەڕووی زەحمەتی و بەربەست دەبنەوە تەنانەت لە کاتی پەرەسەندنی ڕووداوەکاندا.

کێ دەبێ چی بکات و لە کوێ چی ڕوویدا و چۆن ئەنجامی پلانەکە گۆڕانی بەسەرداهات؟ لەوبارەوە تویتەر چارەسەرێکی گونجاو سەبارەت بەو کێشەیە پێشکەشدەکات.

لە مانگی تشرینی یەکەمی (٢٠٠٧) شاری سان دیگۆ بووە قوربانی ئاگرکەوتنەوەیەکی گەورە، هەڕەشەیەکی گەورەی لەسەر دانیشتوانی شارەکە دروستکرد، ناچاربوون پشتببەستن بە هەواڵ و زانیارییە هەنوکەییەکان بۆ ئاگاداربوون لە گۆڕانی ئاڕاستەی ئاگرەکە، دوایین ڕێوشوێنەکانی تیمە فریگوزاریەکان، بەڵام ئەو سەرچاوانەی دەزگا ڕۆژنامەوانیە تەقلیدیەکان ئەو پێویستیەی دانیشتوانیان پرنەدەکردەوە بۆ بە دواداچوونی زانیارییە بە پەلەکان، ئەوەبوو دوو کەس لە دانیشتوانی شارەکە ئەوانیش نایت ریتەر ودان تانتلەر دەستیانکرد بە بڵاوکردنەوەی نوێترین زانیاری سەبارەت بە ئاڕاستەی ئاگرەکە و هەنگاوەکانی فریاگوزاری لەسەر لاپەڕەی تایبەت بە خۆیان لە تویتەر، ئەو دووکەسە سوودیان لە تەواوی ئەو زانیارییانە وەرگرت ڕاستەوخۆ لە دراوسێ و هاوڕێکانیان وەردەگرت کە لەسەر شەقام و شوێنە بەرزەکان چاوەدێری ڕەوشی ئاگرکەوتنەوەکەیان دەکرد، بەمەش تویتەر لە ساتەوەختی کارەساتێکی مەترسیدار بووە کۆڵەگەیەکی سەرەکی دەستخستنی زانیاری.

## بەکارهێنانی ٤: کۆکردنەوەی زانیاری لە جەماوەر

پرسی بزوێنەری بە دواداگەرانی تویتەری لۆمۆر (فرنسا)

زۆر نووسراوە سەبارەت بە توانا شاراوەکانی میدیای کۆمەڵایەتیی و لەم کتیبەشدا هەڵوەستە لەسەر ئەم لایەنە کراوە، بە جۆرێك میدیای کۆمەڵایەتیی دەرفەت برەخسێنێ لە بەردەم بەکارهێنەران بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان لە ڕێگەی کۆکردنەوەی زانیاری

له جه‌ماوه‌رو وه‌رگرتنی ئامۆژگاری و زانیاری به‌ سوود له‌لایه‌ن که‌سانی خۆبه‌خش و ئه‌وانه‌ی باس له‌ ئه‌زمونی خۆیان ده‌که‌ن سه‌باره‌ت به‌ کێشه‌ی پرسیاری له‌ باره‌وه‌ کراوه‌.

له‌ **٢٧**ی کانونی یه‌که‌می (٢٠٠٨) بلۆگه‌رو بازرگانی ناسراوی فه‌ره‌نسی (لویك لۆمۆر) به‌ ده‌نگێکی به‌رز گوزارشتی له‌ بۆچوون و بیرۆکه‌کانی کرد له‌ لاپه‌ڕه‌ی تایبه‌تی خۆی له‌ تویته‌ر و له‌ بلۆگی تایبه‌ت به‌ خۆی سه‌باره‌ت به‌وه‌ی تا چه‌ند ده‌کرێ خزمه‌تگوزاری به‌دواداگه‌ران له‌ ناوه‌ڕۆکی تویته‌ر پێشکه‌شی به‌کارهێنه‌رانی **بکرێ**، دوای ئه‌مه‌ ڕاسته‌وخۆ به‌ ماوه‌یه‌کی که‌م له‌ به‌شی کۆمێنت له‌ بلۆگه‌که‌ی لۆمۆر گفتوگۆیه‌کی تێروته‌سه‌ل له‌وباره‌وه‌ دروستبوو، تێیدا بلۆگه‌ره‌کانی دیکه‌ له‌ بلۆگه‌کانی خۆیان و لاپه‌ڕه‌کانیان له‌ تویته‌ر وه‌ڵامی بیرۆکه‌ و پێشنیاره‌کانی لۆمۆریان دایه‌وه‌، دوای که‌متر له‌ ١٢ کاتژمێر که‌سێك به‌ ناوی (گۆس ویتلی)، یه‌کێك له‌و به‌کارهێنه‌رانه‌ی بلۆگه‌که‌ی لۆمۆری خوێندبووه‌وه‌ ده‌ستیکرد به‌ دروستکردنی پرۆگرامێکی سه‌ره‌تایی بزوێنه‌ری به‌دواداگه‌ران له‌ تویته‌ر بخاته‌ به‌رده‌ست به‌کارهێنه‌ران.

ئه‌گه‌رچی ئه‌م پڕۆژه‌یه‌ ڕووبه‌ڕووی ره‌خنه‌ی زۆر بووه‌وه‌، به‌ڵام له‌لایه‌کی تره‌وه‌ توانای تویته‌ر ده‌رده‌خات له‌ بوار ره‌خساندن بۆ ده‌رخستنی ئه‌زمون و شاره‌زایی جه‌ماوه‌ر، له‌ ماوه‌ی ته‌نها١٢ کاتژمێر بابه‌تێك ده‌خرێته‌ ژێر باس و تاوتوێکردن له‌ جیهانی تویته‌ر و (فه‌زای بلۆگه‌کان) دا، سه‌ره‌نجام به‌ هاوبه‌شی و به‌شداری تاکه‌کانی ئه‌و کۆمه‌ڵگه‌یه‌ هه‌ریه‌که‌یان به‌ رێز و شیاوی سه‌یری ڕۆڵی خۆی ده‌کرد توانرا مۆدێلێکی سه‌ره‌تایی ئه‌و بزوێنه‌ره‌ گه‌ڵاڵه‌**بکرێ**.

### به‌کارهێنانی ٥: ئاسایشی تاکه‌که‌سی

پرسی ده‌ستگیرکردنی ڕۆژنامه‌وانان و ڕاگه‌یاندنی له‌ تویته‌ر(میسر)

یه‌کێك له‌ به‌ربه‌سته‌کانی به‌رده‌م چالاکوانه‌ سیاسییه‌کان بریتییه‌ له‌ ئاگاداربوونی ته‌واو و به‌رده‌وام سه‌باره‌ت به‌ ڕه‌وشی کۆمه‌ڵگه‌که‌یان به‌ تایبه‌تی له‌و کۆمه‌ڵگه‌یانه‌ی سیسته‌مه‌ سیاسییه‌کانیان نادیموکراتی و سته‌مکارن، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر خۆشیان ڕووبه‌ڕووی بارودۆخی ناهه‌موار هاتن ناتوانن گروپ و هاورێ و خێزانه‌کانیان ئاگاداربکه‌نه‌وه‌، لێره‌دا تویته‌ر به‌شێك له‌و تواناو خزمه‌تگوزارییه‌ی خسته‌به‌رده‌ستی به‌کارهێنه‌رانی.

له نیسانی ساڵی (٢٠٠٨) له میانەی خۆپیشاندانی نارەزایی له دژی حکومەتی میسر، پۆلیسی میسر ڕۆژنامەوانێکی ئەمریکی به ناوی (جایمز کارل باك) و وەرگێڕەکەی (محمد مرعی) دەستگیرکرد، (باك) توانی له ڕێگەی بەکارهێنانی مۆبایلەکەی کورتەنامەیەك بنێرێ و له لاپەڕەی خۆی لەسەر تویتەر هەواڵی تایبەت به خۆی بلاوبکاتەوه تەنها به دوو وشه "دەستگیرکرام" هاوڕێکانی (کارل) به دوای نامه هەواڵیەکانی (باك) دا چوون له تویتەر و توانیان له ماوەی چەند کاتژمێرێکدا هاوڕێکەیان له زیندان ئازادبکەن ئەگەرچی هەزاران کیلۆمەتر لێی دوور بوون.

به هەمان شێوه وائل عەباسی چالاکوانی میسری له ڕێگەی تویتەرەوه باسی له کردەی دەستگیرکردنی خۆی کرد به وردەکاری زیاتر له ڕێگەی نوێکردنەوەی ئەو نامانەی بلاویدەکردەوە.

دەکرێ چالاکوانه سیاسییەکان به سوودوەرگرتن له خزمەتگوزارییەکانی تویتەر ئاگاداری چالاکیەکانی یەکدی بن بەبێ ئەوەی پێویست بکات هەموویان له یەك شوێن ئامادەبن و له نزیکی یەکدی بن.

## هێماکانی تویتەر

- D ئەگەر بەکارهێنەر نامەیەکی تایبەتی بۆ بەکارهێنەرێکی دیکه نارد، نامەکەی به پیتی (d) دەستی پێکردبوو ناوی بەکارهێنەرەکه به شێوەیەکی گونجاو به دوایدا دێت، نموونه: (d mehta)
- # ئەگەر بەکارهێنەر ویستی وشەیەکی کلیلی بۆ نامەکەی دابنێت پێش وشه کلیلیەکه ئەو هێمایه دادەنێت، بۆ نموونه (#Twitter-for activists).
- Rt کورتکراوەی دەستەواژەی (re-twit)، ئەگەر بەکارهێنەرێك نامەیەکی سەرنجڕاکێشی خوێندەوه و ویستی بۆ بەکارهێنەرانی دیکه بنێری بەدوای نامه و نووسینەکانیدا دەچن، بەر له نامەکه (@Rt) و ناوی ئەو بەکارهێنەره دادەنێ نامەکەی نوسیوه نموونه: RT@Mehta
- H/t کورتکراوەی دەستەواژەی (hat tip) ئەگەر بەکارهێنەرێك ویستی ڕۆڵ و بەشداری بەکارهێنەرێکی دیکه پیشانبدات سەبارەت به بیرۆکه و پێشنیارێك ئەم هێمایه (@H/t) له پێش ناوی بەکارهێنەرەکه دادەنێت.

## هەنگاوەكانی ڕێكخستنی هەڵمەتێكی كارا و سەركەوتوو لە تویتەر

### هەنگاوی یەكەم / ئامانجەكانت دیاری بكە

بەر لەهەر هەنگاوێك لە بەكارهێنانی تویتەردا پێویستە مەبەستەكانت ڕوون و دیاریكراو بێت، ئایا دەتەوێت لە ڕێگەی تویتەرەوە نامەیەك بگەیەنیت، یان كاریگەریت زیاتر بكەیت یان لەگەڵ گروپ و كۆمەڵگەكەت لە پەیوەندی بەردەوام و هەماهەنگیدابیت، هەریەك لەو ئامانجانەت لە تویتەر ئەنجام و دەرهاویشتەی جیای لێدەكەوێتەوە، ڕێگەی ڕاست و هەڵە نیە لە بەكارهێنانی تویتەر، بەڵام تاكە ڕێگە بۆ هەڵسەنگاندنی كار و چالاكیەكانت لە فەزای تویتەر بریتییە لە ڕوونی ئامانجەكەت بەر لە دەستنیشانكردن.

### هەنگاوی دووەم: لاپەڕەیەك لە تویتەر بكەرەوە

دەستبكە بە بەدواداچوون ڕێگەیەك لەوە باشتر نیە بۆ ناسینی تویتەر جگە لە بەكارهێنانی نەبێت، بۆیە باشتر وایە سەردانی بكەی و تێیدا بەشداربیت، بۆ ئەوەش بزانیت چۆن تویتەر بەكاردەهێنرێ دەستبكە بە بەدواداچوونی كەسانی دیكە و گروپەكانی ناو ماڵپەڕەكە جێگەی بایەخی تۆیە.

### هەنگاوی سێیەم: دەستبكە بە نووسینی نامە

ئەو لاپەڕە سپیە ترست لا دروست نەكات و دەستبكە بە نووسینی یەكەم نامەی تویتەر، ئێستا خەریكی چیت؟ كتێبێك دەخوێنیتەوە ؟ ڕەنگە بتەوێ هەندێ لایەنی كەسێتی خۆت دەربخەیت، ئەگەر حەز لە چێشت لێنان دەكەیت ئەوا باس لەوە بكە لە لاپەڕە و نامەكەت، ئەگەر كتێبێكی **سەرنجڕاكێشت** خوێندووەتەوە لە نامەیەكی تویتەر باسی بكە، ئەگەر دەتەوێ خزمەت بە ئامانجێكی ڕوونبكەیت لە ڕێگەی تویتەرەوە، لەوە وردبەوە ئەوانەی بە دوای نامەكانت دەچن چ شتێك سەرنجیان ڕادەكێشیت، ئەگەر وتارێكی **سەرنجڕاكێشت** كەوتە بەرچاو بە نامەیەك لە تویتەر پێگەكەی بخە بەردەستیان، ئایا بەكارهێنەرێكی دیكەی تویتەرت بەرچاوكەوتوە ڕەنگە سەرنجیان وەك تۆ رابكێشیت ؟ لەوە ئاگاداریان بكەوە.

## هەنگاوی چوارەم: نامەکانت لە تویتەر پشت ئەستور بکە بە ماڵپەڕێکی دەرەکی تایبەت بە خۆت.

تایبەتمەندیی تویتەر لەوەدایە دەتوانیٚ لە ڕێگەیەوە سوود لە نامەکان وەربگریٚ لە پرۆگرام و سیستەمی دیکە، دەکریٚ سوودی لێوەرگرین بۆ نوێکردنەوەی ناوەڕۆکی لاپەڕەکەت لە فەیسبووك، هەروەك دەتوانیٚ ڕاستەوخۆ لە بلۆگەکەتدا بڵاوی بکەیتەوە، بەشێك لە کاتت تەرخانبکە بۆ ئەوەی بزانی ئاخۆ دەتەویٚ لاپەڕەکەت لە تویتەر ببەستیتەوە لە چالاکی و ئامادەگیت لەسەر ئینتەرنێت.

ئەگەر لەگەڵ گروپێك کاردەکەی لێیان بپرسە تویتەر بەکاردێنن یان نا، هەوڵبدە سوود لە نامە و چالاکیە هەواڵیەکان وەربگریٚ لە ماڵپەڕی تایبەت بە خۆت.

## هەنگاوی پێنجەم: پەیوەندی بکە بە چالاکوانی دیکە لە تویتەر

لە تویتەر بە ژمارەیەکی زۆر لە بەکارهێنەر دەگەیت، پەیوەندییان پێوە بکەو بەدوای چالاکیە هەواڵی و نامەکانیان بکەوە.

## هەنگاوی شەشەم: وشەکلیلیەکان بەکاربێنە بۆ یارمەتیدانی ئەوانەی وەك تۆ بیردەکەنەوە

دەرفەت برەخسێنە بۆ بەکارهێنەرانی تویتەر چالاکی و ناوەڕۆکی نامەکانت بە ئاسانی بدۆزنەوە بە تایبەتی ئەوانەی وەك تۆ هاوخولیان و بە گرنگیەوە دەروانننە ئەو بابەتە بە بەکارهێنانی وشەی کلیلی بە شێوەیەکی چڕوپڕ.

## هەنگاوی حەفتەم: سوود لە تویتەر وەربگرە بۆ گەیاندنی دەنگت.

تویتەر بەکاربێنە بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵی تایبەت بە چالاکیەکانت، ئایا بلۆگێکی تازەت نوسیوە یان بڵاوکراوەیەکی تازەت دەرکردوە ؟ ئایا دەتەویٚ کاتی چالاکی و ڕووداوێکی دیاریکراو بڵاو بکەیەوە، تویتەر بە کاربێنە بۆ گەیاندنی هەواڵ و

ئاگادارکردنەوەی ئەو گروپ و کۆمەڵگەیەی هاو خولیاو هاوبەشتە لە بیرکردنەوەو گرنگی پێدان دا.

## هەنگاوی هەشتەم: کۆڵنەدان و هەوڵی بەردەوام بۆ فێربوون

هیچ شتێك لە خۆڕا و بەیەك هەنگاو ڕوونادات، هەوڵبدە بەردەوام خۆت فێربکە، ڕەنگە لە سەرەتادا هەست بە گۆڕانکاریەکان نەکەیت، ئامانجت لە چالاکی نواندن لەسەر تویتەر بە ڕوونی دیاریبکە، ژمارەی ئەو کەسانە چەندە دەتەوێ لە ڕێگەی تویتەرەوە پێیانبگەی؟ ژمارەی ئەو بەدواداچوونە چەندە دەتەوێ بەشداریان پێبکەی لە پرسێکدا؟ ژمارەی ئەو کەسانەی دەتەوێ چالاکیان بکەی لە پڕۆژە و هەڵمەتێکدا لە ڕێگەی تویتەر سوود لەو پرسیارانە وەربگرە و کار لەسەر وەڵامەکان بکە.

## ئامۆژگاری بۆ بەکارهێنەرانی تویتەر

- هەر لە سەرەتاوە بەدوای ئەو کەسانەدا بڕۆ جێگەی سەرنجن، نامەیان بۆ بنێرە و ئاگاداریان بکەوە لەوەی چۆن ئەوانت دۆزیەوە و دەتەوێ بە دوای چالاکی و نامەکانیاندا بڕۆی، بەمەش سەرەتای گفتوگۆکانت لەگەڵیاندا دەستپێکرد و وردە وردە شتی تازە لە بەکارهێنانی تویتەر فێردەبی لە ڕێگەی کارلێکردن لەگەڵ بەکارهێنەرانی دیکەی تویتەر.
- هەڕەمەکیانە بە دوای نامەو چالاکیەکانی کەسانی دیکە مەچۆ.
- ئەگەر بەدوای کەسێکدا چوویت لە تویتەر بزانە بۆچی ئەو کارە دەکەیت، ئایا ئەو کارەی ئەوان دەیکەن بەلای تۆوە گرنگە، تەنها وەك خولیا و خۆشی ئەو کارە مەکە، چونکە ئەوکات کەسێتی تویتەرت لەدەست دەدەیت و زوو بێزار دەبێت و دەست هەڵدەگریت.
- نامەی **سەرنجڕاکێش** بنووسە سەبارەت بەوەی خەریکی چیت یان گوێت لە چی بووە، نامەیەك بنووسە ئەگەر شتێکی **سەرنجڕاکێشت** خوێندوەتەوە، پشت بە (Re-Twitt) ببەستە ئەگەر نامەی بەکارهێنەرێکی دیکەت کەوتەبەرچاو بەلاتەوە جوان و

**سەرنجڕاکێش** بوو، ئەگەر دەتەوێ کەسانی دیکەش لێی ئاگاداربن، ڕەنگە بەشدارانی کۆمەڵگەکەی تۆ لەسەر تویتەر یەکتر نەناسن و ئاشنای یەکتر نەبن.

- تویتەر بە تەنها بەکارمەهێنە بۆ ئاگادارکردنەوەی کەسانی دیکە لە ناوەڕۆکی بلۆگ و ماڵپەڕە کەسیەکەت، ڕەنگە بتەوێ سوود لە تویتەر وەربگرێ بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکەیەوە لەوەی لە ئێستادا چیت بڵاوکردوەتەوە لە بلۆگەکەت، بەڵام ئەم کارە بە سوود ناگەرێتەوە بۆ لاپەڕەکەت لە تویتەر لەبەرئەوەی تویتەر تەنها چالاکیەکی هەواڵ و بڵاوکردنەوە نیە بەڵکو مەودایەکە بۆ دروستکردنی کارلێك و گفتوگۆ لە نێوان بەکارهێنەران، لەوانە بپرسە بەدوای نامەو چالاکیەکانت دەچن ئەوان چاوەڕێی دەکەن لەو نامەو چالاکیانە، هەوڵبدە بەشداریان بکەی لە گفتوگۆیەکی کراوە.
- بە بەردەوامی نامەبنێرە، ڕەنگە لە سەرەتادا نەتوانی ببی بە بەکارهێنەرێکی شارەزا بەڵام لە ڕێگەی دووبارە نامەنووسین و سوودوەرگرتن لە بەکارهێنانی تویتەر، هەروەها دیاریکردنی ئەو شتانەی پێویستی تۆ پڕدەکەنەوە، ئەزمونکردنی بەردەوامی تویتەر یارمەتیت دەدات لەوەی هەڵەکانت کەمبکەیتەوە و توانای سوودوەرگرتنی تەواوت هەبێت لەو ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییە.
- ڕێگەمەدە ماوەیەکی زۆر تێپەڕێت بە سەرتدا بەبێ ئەنجامدانی چالاکی لەسەر تویتەر.
- ئاگاداری ئامێربوون بە: لە تویتەر هەندێ لە سکریت خراوەتە بەردەستی بەکارهێنەر یارمەتیدەرە بۆ ئەنجامدانی لەخۆوەی (تلقائی) بەشێك لە بەکارهێنانەکان وەك بەدواداچوونی لەخۆوەی نامەی بەکارهێنەران یان بەدواداچوونی لەخۆوەی ئەوان بۆ نامەو چالاکیەکانت، ئەم کارە سەرباری لایەنە ئەرێنیەکەی ڕەنگدانەوەی نەرێنی هەیە لەوەی جێپەنجەی کەس بەسەر هەندێ لە بەکارهێنانەکان نایەڵێت کە دەکرێ بوترێ ڕەهەندی کەسیبوون لە گرنگترین خەسڵەتەکانی تویتەرە، بۆیە پشتبەستن بەو سکریتانە لەگەڵ ئەوەی کاتێکی باشت بۆ دەگەرێنێتەوە بەڵام ڕەنگە جەماوەرت لێ دووربخاتەوە.
- نامەی ڕاستەوخۆی لەخۆوە مەنووسە، دیزاینی سکریتە لەخۆوەییەکانت هەرچۆنێك بێت، ڕەنگە هیچ کام لە بەکارهێنەران و بەدواداچوونی چالاکیەکانت سوودی لێنەبینن بەم کارەت هەمان هەڵەی ئەوانە دووبارە دەکەیتەوە ڕێکلام بۆ شتێك دەکەن یان ئەوانەی لە هەرەمی کۆمپانیا و دامەزراوەکان نامە بۆ خوارەوەی خۆیان دەنێرن.

### ماڵپەڕی You Tube

گومانی تێدا نیە جیهانی ئینتەرنێت لە ئەمڕۆدا گەیشتۆتە ئەوپەڕی پێشکەوتن، تۆڕەکە بە ڕادەیەك لەسەر ئاستی جیهانی فرەوانبووە سەرکەوتن و مانەوە و ڕکابەری تێیدا هەروا ئاسان نیە، یوتیوب ناوێکە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە ئاسمانی تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی درەوشایەوە و بۆتە یەکێك لە گەورەترین ئەو ماڵپەڕانەی گرتە ڤیدیۆییەکان بلاّودەکاتەوە،زۆربەی ئەو گرتە ڤیدیۆییانەش لەسەر ئاستی **تاکەکەسی** بەرهەمهێنراوە، یوتیوب بۆتە یەکێك لە کۆمپانیا تەکنیکیە گەورەکانی جیهانی ئینتەرنێت.

### سەرهەڵدانی (You Tube)

یوتیوب وەك ماڵپەڕێکی سەربەخۆ لە (٢٠٠٥/٢/١٤) لە ڕێگەی سێ فەرمانبەر دامەزرا ئەوانیش (چاد هیرلی-ئەمریکی)، (چین- تایوانی)، (جاو کریم-بەنگالی) کە کاریان لە کۆمپانیای (Pay pal) ی تایبەتمەند لە بواری بازرگانی ئەلیکترۆنی دەکرد، (جاو کریم) هاوڕێکانی بە جێهیشت بۆ بەدەستهێنانی بڕوانامەی زانستی لە کۆلیژی ستانفۆرد، بەمەش هەریەك لە (چاد هیرلی و چین) توانییان ماڵپەڕەکە بگەیەننە ئەو ئاستەی ئێستا پێیگەیشتوە و ببێتە یەکێك لە گەورەترین ڕووگەی بەکارهێنەرانی تۆڕی زانیاری، سەرەتای دەستپێکردنی ماڵپەڕەکەش لە شاری (Menlo Park) بوو لە ویلایەتی کالیفۆرنیا لە ئەمەریکا و لە مانگی ئایاری هەمان ساڵ خزمەتگوزارییەکانی ماڵپەڕەکە خرایە بەردەستی تەواوی بەکارهێنەران، دوای ئەوە دامەزراندنی کۆمپانیاکەی بەدواداهات، لە مانگی کانونی یەکەمی هەمان ساڵ خزمەتگوزارییەکانی خرایە بەردەستی بەکارهێنەران.

لە ساڵی (٢٠٠٦) ماڵپەڕەکە لە ریزبەندی پێنجەم هات لەسەر ئاستی جیهان لە ڕووی ژمارەی بەکارهێنەرانی، دوای ئەو سەرکەوتنانەش لە تشرینی دووەمی (٢٠٠٦) کۆمپانیای گوگڵ ماڵپەڕەکە دەکڕێتەوە بە بڕی (٦.١) ملیار دۆلاری ئەمریکی، بووە دووەم گەورەترین گرێبەست گوگڵ ئەنجامی بدات و یوتیوبیش بووە کۆمپانیایەك گوگڵ خاوەن و کارگێڕەکەیەتی.

## تایبەتمەندی و خزمەتگوزارییەکانی (You Tube)

سەرەرای ئەرکە سەرەکیەکەی لە **پێشوازیکردن** و بڵاوکردنەوەی ڤیدیۆی ژمارەیی بۆ ئەوانەی ئارەزووی بەشداریکردن دەکەن لە رێگەی ئینتەرنێت، یوتیوب کۆمەڵێك تایبەتمەندی و خزمەتگوزاری خستۆتە بەردەستی بەکارهێنەرانی لە پێناو کێبڕکێکردن لەگەڵ ئەو ماڵپەڕانەی هاوشێوەی یوتیوب هاتوونەتە سەر هێڵ، یوتیوب خزمەتگوزارییەکانی بە خۆڕایی پێشکەشدەکات سەرچاوەکانی داهاتیشی بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە رێکلام و سپۆنسەرەکان و پڕوپاگاندە و رێکلامە نووسراوەکان دەبەستێت، لە ئێستاشدا رێکلامی ڤیدۆیی وەك بوارێکی نوێ و کردەیی لە رێکلامی ژمارەییدا پانتاییەکی فرەوانی داگیرکردوە و ڕۆژ بە ڕۆژ داواکاری لەسەری زیاد دەبێت.

ئەم ماڵپەڕە ڤیدیۆییە گەیشتوەتە ئاستێکی بەرفرەوانی جەماوەری لە جیهان و دەرفەتی رەخساند بۆ هەر کەسێك بیەوێ پارچە ڤیدیۆیەکی تایبەت بە خۆی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بەبێ بەرامبەر دابەزێنی سەرباری ئەوەی بەکارهێنەر دەتوانێ هەر پارچە ڤیدیۆیەك لە کۆڕ و سیمینار و فیلم و شانۆ و گفتوگۆ وەربگرێ، بیخاتەسەر کۆمپیوتەرەکەی لە رێگەی سوودوەرگرتن لە بەرنامەی (Adob Flash)، بەگوێرەی ماڵپەڕی (Alexa) بۆ ئامارەکانی ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکان، ماڵپەڕی یوتیوب بە سێیەم ماڵپەڕی جەماوەری دێت دوای هەریەك لە ((Yahoo،Google)) بەرپرسانی ماڵپەڕەکە دەڵێن رۆژانە نزیکەی (١٠٠) ملیۆن کەس لە رێگەی ئەو ماڵپەڕە سەیری فیلم دەکەن، لە مانگی کانونی دووەمی ساڵی (٢٠٠٨)، (٧٩) ملیۆن بەکارهێنەر سەیری (٣) ملیار فیلمیان کردوە لەسەر ماڵپەڕی ناوبراو.

لە مانگی ئابی (٢٠٠٦) رۆژنامەی (The Wall Street Journal) کە تایبەتمەندە لە بواری بازرگانی و دارایی باسی لەوەکردوە ماڵپەڕی یوتیوب **پێشوازی** لە شەش ملیۆن و سەد هەزار تراکی ڤیدیۆیی کردوە قەبارەکەیان (٦٠٠) تیرابایت (٦٠٠٠٠٠) گێگابایت بووە.

لە ساڵی (٢٠٠٧) ماڵپەڕەکە بریکی زۆر لە بڵاوبوونەوەی داتا بە خەرجداوە بە ئەندازەی بەکارهێنانی هەموو جیهان بۆ سەرجەم ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت لەهەر خولەکێکدا نزیکەی (١٣) کاتژمێر لە فایلی ڤیدیۆیی لە ماڵپەڕەکە داونلۆد دەکرێ، لە ساڵی (٢٠٠٨) تێچووی رۆژانەی ماڵپەڕی (YouTube) بە نزیکەی یەك ملیۆن دۆلار خەملێندراوە.

**مەرجەکانی خزمەتگوزاری (YouTube)**

- نابێت ئەو ڤیدیۆ و فیلمانەی لە ماڵپەڕەکە بڵاودەکرێنەوە مافی بڵاوکردنەوەیان پارێزراوبێت بۆ کەس و لایەنێك.
- ماڵپەڕەکە ڕێگە بە بڵاوکردنەوەی فیلمی ڕووت نادات.
- ڕێگە بە بڵاوکردنەوەی ئەو فیلمانە نادات زیان بە کەسایەتیەکی دیاریکراو دەگەیەنێت، هەروەها فیلمی ئابڕووبەر یان ڕێکلامی بازرگانی.
- ڕێگە نادرێ بە بڵاوکردنەوەی ئەو فیلمانەی هانی تاوان دەدەن.
- ڤیدیۆ بڵاوکراوەکان زۆربەیان لە دە خولەك کەمتر نین و لە یەك گێگابایت (١٠٢٤) مێگابایت زیاتر نەبێت.
- ماڵپەڕەکە ڕێگە بە هەندێ فایل دەدات لە دەنگ و ڤیدیۆیی.

تائێستا ئەم ماڵپەڕە لە چەند وڵاتێك قەدەغەکراوە بە هۆی بڵاوکردنەوەی ئەو شتانەی لەگەڵ سیستەمی ئەخلاقی نەگونجاوە یان بە هۆی زیانگەیاندن بە کەسایەتیە دیارەکانی حکومەت لەو وڵاتانە.

لەبەرئەوە دەبینین چالاکیەکانی ماڵپەڕەکە لە هەموو شوێنێك بە ئیجابیەوە **پێشوازی** لێنەکرا، لە ئێران ماڵپەڕەکە بلۆککراوە، لە (٣) ی کانونی دووەمی (٢٠٠٦) بە پاساوی ڕێگریکردن لەو فیلم و ڤیدیۆیانەی بە ڕوخێنەر وەسفیکردوە، هەروەك لە (٣) ی نیسانی (٢٠٠٧) لە تایلاند بلۆککراوە بە پاساوی بڵاوکردنەوەی پارچە ڤیدیۆیی ئەوتۆ لە کەسایەتی پاشای وڵاتی کەمکردۆتەوە و وەزیری گەیاندنی تایلاندی ڕایگەیاند بلۆککردنەکە لەسەر ماڵپەڕەکە لاناچێت تاوەکو ئەو پارچە ڤیدیۆییانە لانەبرێن بێڕێزی بە پاشای وڵات دەکەن.

لە مەغریب لە ئایاری (٢٠٠٧) لەلایەن کۆمپانیای (Morocco Telecom) ماڵپەڕەکە بلۆککرا بەبێ ڕاگەیاندنی هیچ هۆکارێك بەڵام بەگوێرەی هەندێ بۆچوون ئاماژە بەوە دەکەن لە ماڵپەڕەکە هەندێ تراکی ڤیدیۆیی بڵاوکراوەتەوە لایەنگیری بەرەی پۆلیساریۆی کردوە و هەندێکی دیکەش بێڕێزییان کردوە بە خودی شای مەغریب، بە هەمان شێوە تورکیا ماڵپەڕەکەی بلۆککرد بە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەو فیلمانەی

سوکایەتی بە تورك و کەماڵ ئەتاتورك دەکەن و لەلایەن یۆنانیەکان دانراوە بە هۆی ناکۆکی نێوان یۆنان و تورکیا لەسەر دوورگەی قوبرس.

## بلۆگی ئەلیکترۆنی

ڕۆژگاری ئەمڕۆ پێشکەوتنێکی خێرا لە بواری پەیوەندیکردندا بەخۆوەدەبینێت بە شێوەیەکی بەرچاو لە مەیدانی میدیا بە گشتی و ڕۆژنامەوانیی نووسراو بە تایبەتی ڕەنگیداوەتەوە، ئەمڕۆ سیستەمی ژمارەیی توانیویەتی تەکنەلۆژیای زانیاری و تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن بەیەکەوە ببەستێتەوە، ئەمە بۆتە هەوێنی سەرهەڵدانی بازارێکی ڕاستەقینەی مەلتیمیدیا، ڕێگادەدات لە یەك پەیامی ڕۆژنامەوانیدا چەندین رەگەز ئاوێتەی یەکتر **بکرێن** بۆ ئەوەی مەلتیمیدیا کارلێکیەکان لە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش وجوان بخرێتە بەردەستی بەکارهێنەر، جاران بەکارهێنانی ئەم تەکنەلۆژیایە کورتهەڵاتبوو لە میدیای کۆن، توێژی گەنج دەستپێشخەربوون لەم تەکنەلۆژیا نوێیە، ئامادەییەکی زیاتریان تێدا بوو بۆ کارلێکردن لەگەڵ ئەم شۆڕشە نوێیەی لە بواری میدیای نوێ هاتەئاراوە لە پێشەوەی هەمووشیان میدیای ئەلیکترۆنی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

هەر لەمبارەیەوە دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای میدیای نوێ بوو بەدەرفەت و کەرەستەیەکی کاریگەر بۆ بەدیهێنانی ئازادیی ڕۆژنامەوانی و ئازادیی ڕادەربرین، تائێستا لە زۆر لە وڵاتانی تازەپێشکەوتوو نەبوونی ئازادییەکان بۆتە کۆسپ لە بەردەم میدیا، سەرباری هەموو ئەو پەیماننامە و بڕیارە دەوڵەتیانەی بوونی ئەم ئازادییانە بەمافی تاکەکانی کۆمەڵگە دادەنێن، بەڵام ئەزمونی سیاسی ئەو وڵاتانە دەریخست یاسا و بڕیارەکان بەس نین بۆ پارێزگاریکردن لە مافی مرۆڤ و ئازادییەکان لە بواری میدیادا.

سەرەتای هەزارەی سێهەم سەرهەڵدان و پێشکەوتنێکی خێرای بەخۆوەبینی لە دەرهاویشتە مەعریفی و تەکنەلۆژیەکانەوە، کردنەوەی سنورە داخراوەکان و زەمینەسازکردن بۆ ڕادەربڕینی ئازاد، ئەمە کۆتایی بە شێوە کۆنەکانی پەیوەندیکردن لەلایەنی مرۆڤەوە هێنا، لەو ڕوانگەیەوە پەیوەندی نێوان کۆمەڵگە و میدیاکان

پەیوەندییەکی جەدەلیە و پێشووەچوونی هەر کامێکیان سەر دەکێشێت بۆ پێشووەچوونی ئەوی دیکە.

ئەمڕۆ دەربڕینی ڕای ئازاد بووە بە یەکێك لە پێداویستیەکانی هەر باسوخواسێك لەبارەی ئێستا و ئایندەی کۆمەڵگەکان بە تایبەتی ئەوانەی عەیامێکی دوور ودرێژە گرفتارن بەدەست تاکڕەوی و ستەمکاریەوە.

زۆرێك لە سەرکردەی وڵاتە دیکتاتۆڕەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن وڵاتەکانیان بە هەشتی ئازادیی ڕادەربڕینە، بەڵام هەر زوو پڕوپوچی ئەو بانگەشەیە دەردەکەوێت کاتێك لە چوارچێوەی وتوێژێکی ئازاد و ڕاستەقینەدا بە بەکارهێنانی کەرەستەی پێوانەکردنی سەرەتایی، ڕادەربڕینی ئازاد و ڕادەربڕینی نائازاد لە یەك جیادەبنەوە.

کۆمەڵگەی مەعریفە لەو کاتەوە دروستدەبێت بەرهەمێنان و بڵاوکردنەوەی زانیاری و مەعریفە و دابەشکردنی دوور لە سانسۆر و سنوردارکردن ئەنجامدەدرێت بۆ بەکارهێنان و سوود لێوەرگرتنی لە هەموو بوارەکانی چالاکی مرۆیی، بەوپێیەی بڵاوکردنەوەی مەعریفە ڕێگای گەیشتنە بە ئامانجە باڵا و بەها ئینسانیەکانی وەك ئازادیی، دادپەروەری، یەکسانی، شکۆی مرۆڤ و هتد، بنیاتنانی کۆمەڵگەی مەعریفەش کارێکی ئەستەمە بێ واڵاکردنی دەرگاکانی داهێنان و ئافراندن لە بەردەم تاکەکانی کۆمەڵگە.

کاریگەرییەکانی تەکنەلۆژیایی نوێ گەیشتە بواری بەرهەمهێنان و نووسین، بە لەدایکبوونی (بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی) کۆمەڵێك چەمکی تازە لەدایکبوون، گۆڕانێکی گەورەی بەسەر پێوەرە تەکنیکی و کردەییەکانی میدیادا هێنا، لەو نێوەندەشدا زۆرترین مشتومڕ لەبارەی ئینتەرنێت و کاریگەری و دەرهاویشتە هەمەچەشنەکانی کرا، ئینتەرنێت لەگەڵ خۆی دا چەندین ڕواڵەتی گۆڕانکاری سەرسوڕهێنەری هێنا لە بواری میدیای کۆن دا، ئەمە وایکرد نەوەی نوێ لە **نووسەر** و ڕۆژنامەوانان باوەش بۆ ئەم تەکنەلۆژیایانەی زانیاری بکەنەوە، بچنە نێو ئەزمونێکی نوێ ئازادیی نووسین و بڵاوکردنەوە پێشتر ڕۆشنبیر و ڕۆژنامەوانانی پێش خۆی ئاشنای نەبوون، سەرەتا چەند ماڵپەرێکی سادە هاتنە گۆڕەپانەکە و زەمینە و پاڵنەرێکی بەهێزبوون بۆ **نووسەر**ەکان تا لە قاوغە تەقلیدیەکانی میدیا و ڕۆژنامەوانی بێنەدەرەوە، خزمەتگوزاری زانیاری باشتر و ئاسانتر لە ڕێگەی تۆڕی ئینەرنێتەوە بخەنە بەردەستی خوێنەرانەوە بە کەمترین تێچوو هەر لە پۆستی و بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی تا دەگاتە ماڵپەڕەکانی بەدواداگەڕان، هەموو ئەمانە شۆڕشێکیان بەرپاکرد

لەمێژووی میدیا دا، ئەگەر جاران دیوارەکانی میدیا بەرزبوون و تەنها تایبەت بوو بە نوخبەی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەوانان ئەوەی دەیانەوێ بە جەماوەری بگەیەنن، هەرچی میدیای نوێیە بە میدیای جێگرەوە ناودەبرێ، سێ خەسڵەتی سەرەکی هەیە ئەوانیش: رزگاربوونی لە دەسەڵاتی سیاسی و دەرچوونی لەژێر دەسەڵاتی ئابووری و لە سەرووی ئەم دوو خەسڵەتەش هاووڵاتی ئاسایی وەك ڕۆژنامەوان هاتە گۆڕەپانەکە، ئیدی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی پەیامی ڕۆژنامەوانی تەنها لە ڕۆژنامەوان کورت نەبۆتەوە، ئەم میدیایە دەرگای والاکردوە بۆ هەمووان ئەوەی ئارەزووی دەکەن بینووسن لە دیموکراتییەتێکی میدیایی ناوازە دا، زۆرێك لە خوێنەران بەهۆی ئالوودەبوون لەسەر نووسین لەو ماڵپەڕانە توانیویانە زیاتر لەهەر ڕۆژنامەوانێکی دیکە کاریگەری دروستبکەن، یەکێك لەو خزمەتگوزاریانەش لە ڕێگەی میدیای نوێ پێشکەش دەکرێت بریتییە لە بلۆگی ئەلیکترۆنی.

بلۆگی ئەلیکترۆنی لای زۆرێك لە پسپۆڕان و شارەزایانی ئەو بوارە بە میدیای جێگرەوە ناودەبرێت بەهۆی ئەو ئازادییە ڕەهایەی بەدیدەکرێت لە تۆڕی ئینتەرنێتدا، لەکاتێکدا زۆرێك لە ئامرازەکانی میدیا لەو وڵاتانەی سنوری ئازادییەکان بەرتەسك دەکەنەوە میدیا بە شێوەیەکی گشتی و میدیای ڕەسمی بە تایبەتی کەمتر متمانە هەیە لای وەرگر، ئازادییە **تاکەکەسییەکان** بە شێوەیەکی بەرنامەدارێژڕاو سنوردارکراوە.

وشەی (Blog) بە مانای نووسین و (Bloggers) بە مانای **نووسەر** دێت ئەم وەرگێڕانەش زیاتر وەسفیە نەك وەرگێڕانێکی حەرفی، چونکە وشەی (Blog) کورتکراوەی وشەی (Weblog)، پیتی (We) لادراوە و (B) لکێندراوە بە (log) و بووە بە (Blog)، لە هەندێ سەرچاوەی دیکە بە ماڵپەڕی کەسی یان ڕۆژنامەی کەسیی ناویدەبەن.

## پێناسەی بلۆگی ئەلیکترۆنی

بلۆگ یەکێکە لە پراکتیکە نوێیەکانی تۆڕی ئینتەرنێت، (Web Blog) بە مانای تۆماری تۆڕەکە دێت، دەرفەتی گەیشتن بە وێنەیەکی سادەی لاپەڕەکانی وێب بۆ بەکارهێنەران دەرەخسێنێت، ئەو وتارانە بڵاودەکرێنەوە ناودەبرێن بە بلۆگ، ریزبەندکردنیان لەسەر بنەمای کاتی بڵاوکردنەوە دەبێت، بەڵام ئەو پێناسەیە هەندێ لە خەسڵەتەکانی بلۆگی فەرامۆشکردوە ئەو خزمەتگوزاریانەشی لە بەرچاونەگرتووە وێب بلۆگ دەیخانە بەردەستی بەکارهێنەرانی.

له ڕووی زاراوەیی بە مانای تۆماری تۆڕی ئینتەرنێت دێت لە بنەرەتدا گوزارشتێکی خودی و **تاکەکەسییە** لەمەڕ ڕووداو و بابەتەکانی دەوروبەر، هەوڵدانە بۆ خۆناساندن و دەرخستنی توانا و کارامەییەکان، هەڵاتنە لە فشار و گەمارۆی سیاسی و سەرقاڵیە کۆمەڵایەتیی و ئابووریەکانی ژیانی ڕۆژانە، بلۆگ هەوڵدانە بۆ بازدان لەسەر سنور و شتە حەرامکراوەکان، نووسینی بلۆگ دەبێتە جێگرەوەیەکی ئەرێنی بۆ گۆشەگیربوون و نەرێنیبوونی خود و بێباکی و بێدەنگبوون لە ئاست ڕووداو و گۆڕانکاریە گرنگەکانی کۆمەڵگە، بە تایبەت کۆمەڵگە دواکەوتووەکان لە ئاستی سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئابووری گیرۆدەی چەندین گرفتی بوونیادین، تاك ئەو بوارەی لە بەردەم واڵانەکراوە لە ئاستی دەربرین و کردەییدا ڕۆڵی شایستە ببینێت لە هەمبەر ڕووداوەکاندا.

پێناسەی وێب بلۆگ بەوە دەکرێت ڕۆژنامەوانی نوێی وێبە یان ڕۆژنامەی ئارەزوومەندانە (Amateur Reporting) لە ڕێگەی دانان و بڵاوکردنەوەی وتار و بابەت لەسەر وێبدا، هەزاران کەس سوودیان لەو پڕاکتیکەی تۆڕی ئینتەرنێت وەرگرتووە، ئەزموون و بیروبۆچوونی خۆیان لە کۆربەندە ئەلیکترۆنییەکان ( Online Forums) کە ڕێخۆشکەرە بۆ ئەوەی بگاتە ژمارەیەکی زۆری بەکارهێنەر.

١. بلۆگ یان لاپەڕەکە کەسییەکان پراکتیکێکە لە پراکتیەکەکانی ئینتەرنێت، کاردەکات لە سیستەمی ناوەڕۆك، ئەمە لە سادەترین وێنەدا بریتییە لە لاپەڕەیەکی وێب، کۆمەڵێك نووسین و بابەتی تێدا بە دەردەکەوێت لەسەر بنەمای ڕێکەوتی بڵاوکردنەوەی ریزبەند و ئەرشیف دەکرێ، لەسەر چەند دەروازە و ناونیشانێکی جێگیر دابەشدەکرێن.

٢. بلۆگ یادەوەری کەسییە، یان پانتاییەکە بۆ گوزارشتکردن لە بۆچوونی سیاسی و ئاینی و کۆمەڵایەتیی، هەروەك لە هەندێ وێب بلۆگدا کۆمەڵەیەکی گریمانەیی دروستدەبێت بە کۆکردنەوەی ژمارەیەك ئارەزوومەند لە بواریکی تایبەتمەند یان سەبارەت پرۆژەیەکی ئەکادیمی یان توێژینەوەیەکی زانستی.

٣. ئەو روخسارەیە تێیدا گوزارشت لە خود دەکرێت بەهەردوو ڕووە باش و خراپەکەی، بەو مانایەی بلۆگ چەکێکی دووسەرە وەك هەر ئامرازێکی دی هەوڵدەدات ڕەواج بە ئایدیایەکی ڕۆشنگەرانە یان تاریك بدات.

٤. بلۆگ جۆرێکی جیاوازی ڕۆژنامەیە و بە فرەوانی پانتایی ئازادیی و هەمەڕەنگبوونی ناوەڕۆکەکەی دەناسرێتەوە، هەروەك دەکرێ بگوترێ ڕۆژنامەیەکی ژمارەییە و بەوە دەناسرێتەوە توانای بەدواداچوونی بەردەوامی هەواڵ و ڕووداوەکانی هەیە، ڕووداوەکان لەساتی ڕوودانیدا بڵاودەکرێتەوە و ڕووماڵدەکرێن، خوێنەران دەرفەت و ئازادیی تەواویان هەیە بۆ دروستکردن،پشتڕاستکردنەوەی یان بەدرۆخستنەوەی هەواڵەکە، نووسینی کۆمێنت، گفتوگۆی ئاشکرا لە نێوان خوێنەران لە جیاکەرەوەکانی ئەم ڕۆژنامانەیە. لە بلۆگدا بە شێوەیەکی ئاسان و خێراتر بلۆگەکان راوبۆچوون و هەواڵ بڵاودەکەنەوە، هەریەکەیان ئەو ڕووداوانەی بینیویەتی یان بەشداری تێداکردوە ڕووماڵدەکەن و تاوتوێی ئەو بابەتانە دەکەن و وەڵامی ئەو شتانە دەدەنەوە لە ماڵپەڕەکانی دیکە **بڵاوکراونەتەوە**.

٥. چەشنێکی کۆمەڵایەتییە، گوزارشتە لە ڕۆژمێرێکی ئەلیکترۆنی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، گەنجان بە هەردوو رەگەزەکەوە، ئافرەت و پیاو هەریەکە ئەزموونی تاکەکەسی خۆی بە ئازادیی و دوور لە سانسۆر و ڕاوەدوونان و ڕێگە پێگرتن دەنوسێتەوە لە بوارە کۆمەڵایەتییەتی و ئابووری و سیاسییەکاندا، بواریش لە بەردەم جەماوەر و هاوڕێیانی بلۆگەرەکە کراوەیە تێبینی خۆیان سەبارەت بە ناوەڕۆکە بڵاوکراوەکان بنووسن، زۆرجار بەزمانی قسەکردنی ڕۆژانەی ناو خەڵك دەنووسرێ بە شێوەیەکی **سەرنجڕاکێش** و هەندێ جاریش تەنزئامێز و گاڵتەجاڕ.

٦. بلۆگ داهێنانێکی نوێی پەیوەندیکردنە بە سوودوەرگرتن لە تەکنەلۆژیای ژمارەیی، **وادەکات** زانیارییەکان دابەش بێت بەسەر ژمارەیەکی زیاتری خەڵك و لەدەستی چەند کەس و گروپ و دەزگایەك نەمێنێتەوە، کۆمەڵگەیەکی ناوەخۆیی گریمانەیی دروست ببێت.

لێرەوە پێویست دەکات وا بڕوانینە بلۆگ چەمکێکە رەگێکی قوڵ و شاراوەی فەلسەفی هەیە، ئەو ڕوانگەیەش هاندەرە بۆ زیادبوون و فرەوانبوونی بلۆگ، بە تایبەت ئەوانەی ڕەهەندیکی ئەرێنیان هەیە و بەردەوام کار لەسەر پەرەپێدانی ئاست و شێوازی نووسینی بلۆگەکان و پەیوەندیکردندا دەکەن لە گفتوگۆ و ڕادەربڕینی ڕاستگۆیانە و بوار رەخساندنی کارلێکردن جۆرێك لە ریز و متمانەی **دوولایەنە** دروستدەکات، بۆیە بلۆگ تەنها سادەترین و خێراترین ڕێگا نیە بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری

جەماوەر لە شوێنە جیاجیاکانی جیهان بڵاوبوونەتەوە، بەڵکو لە هەموو شتێکدا سادە و خێرایە و تۆڕێك لە بلۆگەکان بابەتی نووسراو و وێنە و ڤیدیۆ و دەنگ لەیەك بابەتدا ئاوێنەی یەکتر دەکرێن، بەمەش زانیاری و کارلێکردن تێکەڵ بەیەك دەبن و ئاستێکی کارای پەیوەندیکردن دروستدەبێت.

لەم پێناسانەی سەرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت بلۆگی ئەلیکترۆنی بریتییە لە ماڵپەڕێکی ئەلیکترۆنی بۆ نووسین، تێیدا چەندین چەشنی نووسین وەك ژیاننامەی بلۆگەر و هەواڵ و زانیاری و ڕاوبۆچوون بە شێوەیەکی جیاجیا **بڵاوکراونەتەوە**، لێرەدا پاڵنەرە خودی و سیاسییەکانی بلۆگەرەکان کاریگەری لەسەر ئاڕاستە و ناوەڕۆکی ئەو ماڵپەڕانە دەبێت، ئەم فەزا ئازادەی لە نەوەدەکانی سەدەی بیست دروستبووە، لە ناواخنیدا ئەو رەگەزانەی تێیدا بەدیدەکرێ ببێتە میدیایەکی جێگرەوە بۆ میدیای کۆن، کە هێشتا لە ڕووی هەژموون و جەماوەرەوە پلە یەکە و پێشەنگی بەرنەداوە، بەڵام لە سایەی ئەو فشارە سیاسی و ماددەیەی میدیای کۆن ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بەهۆی پێویستی تاك بە فەزایەك گوزارشت لەخۆی بکات، خواست و پێویستیەکانی پڕ بکاتەوە، سەرباری ئەم دوو هۆکارەش، لە بلۆگ و میدیای نوێ بە شێوەیەکی گشتی چەندین شێوەی نوێ لە مومارەسەکردنی کاری ڕۆژنامەوانی فەراهەمکردوە، هەموو ئەوانە وادەکەن لە ئایندەیەکی نزیکدا ئەمجۆرەی میدیایە توانای ڕکابەری میدیا کۆنەکەی هەبێت، **سەرنجڕاکێش** و کردەییتر بێتەبەرچاو.

بڵاوبوونەوەی بلۆگە ئەلیکترۆنییەکان لە چەند ساڵی کەمی ڕابردوودا لەسەر ئاستی سیاسی و میدیاییدا بۆتە دیاردەیەکی بەربڵاوی کارا، بەهۆی ئەو کاریگەرییەی بلۆگەکانە دروستیانکردوە لەسەر ڕووداوەکان و گەیاندنی ئەو زانیاری و بۆچوونانەی دەبنە هەوێنی دروستبوون و بزواندن و ڕێکخستنی رای گشتی ناوەخۆیی لە کۆمەڵگەیەکدا سەبارەت بە ڕووداو و بابەتە هاوبەش و بایەخدارەکان.

ئەو بلۆگانە لەو وڵاتە دواکەوتوانەی پانتایی ئازادیی تێیدا سنوردارە یان هەر نیە، زیاتر سیمایەکی سیاسی وەرگرتووە و بۆتە سەرچاوەیەکی سەرئێشە و نیگەرانی دەسەڵاتداران، دەزگا تەناهی و هەواڵگریەکان لەوە دەترسن ئەم بلۆکانە هانی ژمارەیەکی زیاتری خەڵك بدەن ڕای خۆیان لەم ڕێگەیەوە دەرببڕن، هەنگاو و کارە نایاسایی و شاراوەکانی بەرپرسان ریسوابکەن، ئەم بلۆگەرانە بوونە ڕۆشنکەرەوەی

ڕێگایەکی نوێ بۆ ئەوانەی دەیانەوێ لەم ڕێگەیەوە دوور لە سانسۆر و ڕاوەدوونان باس لە پرسە تایبەتی و کێشەکان بکەن، سەیریش نیە ئەگەر بڵێین ئەو بلۆگانە کاریگەری بەرچاویان هەبوو لە هەڵگیرساندنی زۆرێك لە شۆڕشەکانی وڵاتانی عەرەبی دواتر بە بەهاری عەرەبی ناوبرا، تێیدا بلۆگ و بلۆگەرەکان پێشەنگ بوون لە هاندان و رێبەرایەتیکردنی ئەو جموجۆڵە جەماوەریانەی بۆ نارەزایی دەربرین لەسەر خراپی ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتیی و ئابووری کۆمەڵگە رژانە سەر شەقام، لەگەڵ شکاندنی بەربەستە دەرونیەکان و دیوارەکانی ترس لەلایەن خۆپیشاندەران ئەو جموجۆڵە جەماوەریانە پەرەیسەند لە شێوەی شۆڕش و ڕاپەڕینی جەماوەری دەرکەوتن، کۆتاییان هێنا بە سەرسەختترین رژێمە تاکرەوکانی رژێمی زین العابدين بن علي لە تونس ومحمد حسنى مبارك لە میسر و موعەمەر قەزافی لە لیبیا، بەڵام خاڵی جیاکەرەوەی ئەو شۆڕشانە ئەوە بوو لەلایەن ئەو گەنجانەی هەواداری میدیای نوێن پێشەنگی دەکرا لە جیهانی گریمانەیی ئینتەرنێت بەیەکگەیشتن، لەوێوە بیرۆکەی هەڵگیرساندنی شۆڕش و رژانە سەرشەقام گەڵاڵەبوو، هەر لەوێ سەعاتی سفری شۆڕشەکەیان دانا و بوونە هەوێنی یەکێك لەسەرسامترین گۆڕانکاریەکان لە مێژووی هاوچەرخدا.

## قۆناغەکانی سەرهەڵدانی بلۆگی ئەلیکترۆنی

دەکرێ قۆناغەکانی سەرهەڵدانی بلۆگی ئەلیکترۆنی دابەش**بکرێ** بۆ سێ قۆناغ ئەمانەن:

قۆناغی یەکەم: بریتییە لە ناوەڕاستی نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، لەگەڵ بلۆگەری ئەمریکی (جۆرج بار) ساڵی (١٩٩٤) لەگەڵ ماڵپەڕی (دراهگ ریپۆرت) هەر ئەویش بوو لە دوای ئابڕووچوونەکەی (مۆنیکا لونیسکی) سکرتێری تایبەتی سەرۆکی پێشووی (بیل کلینتۆن) لە ساڵی (١٩٩٤).دەرگای والآکرد بەڕووی فرەوانترین مشتومڕ و ڕا و ڕای جیاواز لەوبارەوە.

قۆناغی دووەم: ڕێکەوتی لە دایکبوونی ڕاستەقینەی بلۆگە تایبەتیەکان بوو دوای ڕووداوەکانی یازدەی ئەیلولی ٢٠٠١، لەم قۆناغە دا زۆرێك لە ڕۆژنامەوانان هاتنە مەیدانی بلۆگ نووسین، ئیدی ڕۆژ بە ڕۆژ بلۆگی ئەلیکترۆنی کاریگەری و ڕۆڵی زیاتر دەبوو، بە تایبەتی دوای بڕیاری ئیدارەی ئەمەریکا بە شەڕ دژی عیراق لە ساڵی

(٢٠٠٣)، هۆکارێکی دیکە بوو، ئەوسا بلۆگەکان ناویاننا لە شەڕەکە شەڕی ڕەگەزپەرستی، لەو کاتەوە بلۆگ زیاتر بڵاوبۆوە و بوو بە ئامرازێکی پەیوەندیکردنی جەماوەری کاریگەر، لە بەرامبەریشدا بلۆگی ئەلیکترۆنی ئەوتۆش پەیدابوو لایەنگری لە شەڕ دەکرد وەك بلۆگی (ئاتستا بۆندن).

لە ساڵی (٢٠٠٣) بلۆگ بووە ئامرازێکی پەیوەندیکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵك لە خۆرئاوا بۆ دژایەتیکردنی شەڕ و گوزارشتکردن لە بۆچوونە سیاسییەکانیان، لە نێویاندا کەورە سیاسەتمەدارەکانی ئەمەریکا لەوانە (هەواردین) بوو، بەردەوام گۆڤارە بەناوبانگەکانی وەك (فۆریس) ئەو وتار و بابەتانەی هەواردی دووبارە بڵاودەکردەوە، هەروەك بەکارهێنانی بلۆگ لەلایەن پەیمانگەی (ئادەم سمیپ)ی بەریتانی ڕۆڵی هەبوو لە زیاتر بڵاوبوونەوە و لەسەر پیوەستانی بلۆگی ئەلیکترۆنی.

قۆناغی سێیەم: قۆناغی پێگەیشتن و کامڵبوونە، سەرەتاکانی ئەم قۆناغە لە نیوەی دووەمی ساڵی (٢٠٠٤) دەستیپێکرد، کاتێك بلۆگ بوو بە دیاردەیەکی جیهانی، سەرەتای تەقینەوە و بڵاوبوونەوەی سەرەتای ساڵی (٢٠٠٥) بوو ئەوکاتەی کۆمەڵێك ماڵپەڕی ئینتەرنێت پەیدابوون جیاوازبوون لە ماڵپەڕە کلاسیکیەکان و ماڵپەڕەکانی چاتکردن و ماڵپەڕە کەسییەکانی دیکە، ئەم ماڵپەڕە نوێیانە لینکی هاوبەشی زۆری لە خۆگرتبوو، بە شێوەیەك خێرا بڵاوبۆوە و زیادیکرد، بە ڕادەیەك لە تشرینی دووەمی ساڵی (٢٠٠٠) ژمارەی بلۆگی ئەلیکترۆنی (١، ٢) ملیۆن بلۆگ بوو بەگوێرەی ئاماری ماڵپەڕی تایبەت بەبلۆگەکان، ئەم ماڵپەڕە گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی ڕێژەی گەشە و زیادبوونی ئەو ماڵپەڕانە زۆر زیاتربوون لەگەشەی ماڵپەڕەکانی دیکەی ئینتەرنێت، ئامارەکانی ساڵی (٢٠٠٦) ئاماژە بەوەدەکەن زیاتر لە (٥٠) ملیۆن بلۆگ لە جیهاندا هەن.

بەگوێرەی ماڵپەڕی (zdnet)ی ئەڵمانی ژمارەی ئەو ماڵپەڕە کەسییانە لەسەرئاستی جیهان زۆر بەخێرایی زیاددەکات، دوایین ئامارەکان باس لەوەدەکەن نزیکەی (٢٧) ملیۆن بلۆگی کەسی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت لە جیهان هەبن، زۆربەیان لە شێوەی یاداوەری ڕۆژانە و ڕۆژمێری تاکەکەسین ژمارەیەکی خوێنەر بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت.

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانی بلۆگی ئەلیکترۆنی

### ١- جیهانگەری میدیا:

پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای زانیاری و پەیوەندیکردن وایکرد ڕۆڵی هاووڵاتی و وتاك زیاتر بێت لەو بوارە و ئەوەی پێیدەگوترا پەیوەندیکردنی جەماوەری کە سەرەتاکانی پیشەسازی میدیا بوو پاشەکشەبکات.میدیای جەماوەری سەرباری ڕووە گەش و ئەرێنیەکەی، لە زۆر شوێن و کاتدا وەك ئامرازێکی چەواشەکردن و کوشتنی عەقڵ و ئازادییەکان بەکاردەهێنرا، ئەگەر لە ڕوانگەیەکی فرەوانتر لەمە سەیری پیشەسازی ڕۆشنبیری بکەین لە دونیای سەرمایەداری ڕۆژئاوادا ئەوا لەلایەن چەند کۆمپانیا و سەرمایەدارێکەوە قۆرخکراوە، بەهۆی بەرژەوەندییە ئابووری و سیاسییەکان، ڕەنگاڵەیی و فرەئاڕاستەیی لەو بوارەدا لە سنورێکی بەرتەسك هێشتۆتەوە، بە ڕادەیەك بەکارهێنەر ناتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان بەرنامە لەیەکچوەکان، بەوپێیەی یەك کۆمپانیای گەورەی فرەڕەگەز خاوەنی چەندین دامەزراوەی میدیایە و هەموویان لە سیاسەتی نووسیندا لەسەر یەك هێڵی گشتی دەڕۆن، لە ساڵی (١٩٩٩) نزیکەی (٥٠) کۆمپانیا خاوەنی(٦٠٪) کەرتی ئینتەرنێت بوون، بەڵام بەهۆی ئەو قۆرخکاریە لە ساڵی (٢٠٠١) بوو بە (١٤) کۆمپانیا، ئەم سەنترالبوون و جەمسەرگرتنە ڕێگرن لە بەردەم توانای دامەزراوەکانی میدیا ناوەڕۆکیکی هەمەڕەنگ و جیاواز لەیەکدی پێشکەشبکەن بەهۆی نەبوونی فرەیی لە خاوەندارێتی ئەو دامەزراوانە، لێرەوە سەرهەڵدانی بلۆگ هەوڵێك بوو بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەی ئەم قورخ کاریە دروستی کردوە، بلۆگەرێك پێیوایە "بلۆگ" داهێنانێکی سەرسوڕهێنەر بوو، بەهۆیەوە تاك دەتوانێت بەبێ هیچ ئامرازێك کارلێکبکات لەگەڵ ڕووداو و کەسەکان، بەمە بلۆگ ئامرازێکی مرۆییانەی ئازادە، ئاماژەیەکە بۆ ئاوابوونی خۆری ئیمپراتۆریەتی پەیوەندیکردن و میدیای جەماوەری کۆن، لە وڵاتە دواکەوتووەکان میدیا و سەرچاوەکانی هەواڵ بە تەواوەتی دەستی بەسەرداگیراوە.

### ٢- کەمبوونەوەی متمانە بە ڕۆژنامەوانی تەقلیدی

دابەزینی ئاستی متمانەی جەماوەری بە میدیای کۆن دەرەنجامێکی سروشتی دیاردەی جیهانگەرایی میدیا و سەرهەڵدانی چەندین جەمسەری میدیای نێودەوڵەتیە

لەلایەن کۆمپانیا زەبەلاحەکان بەڕێوەدەبرێ لەسەر بنەمای بەرژەوەندیە سیاسی و داراییەکان ئەستەمە ڕووکارەکانی وەکو خۆی بخرێتەڕوو.

بلۆگ ڕەنگە هەنگاوێکی هەرەمەکی هۆشیارانە بووبێت لە سەرەتادا بەهۆی نەمانی زەمینەی ئامادەیی تاك لەو پرسانەی پەیوەستن بە بەرژەوەندی و چاکەی گشتی، لە هەمان کاتدا ئاماژەیەکە بۆ ئەو گومان و بێمتمانەییە لە ئاست ڕۆژنامەوانی تەقلیدی دروستبووە، بە تایبەت لەلایەن نەوەی نوێی بەکارهێنەری ئینتەرنێت و میدیای نوێ، بلۆگ توانی ڕکابەری ئەو زانیارییە فەرمیانە بکات میدیای کۆن بڵاویدەکاتەوە، نووسین و بڵاوکردنەوە لە ڕێگەی بلۆگەوە ئاسانترە لە ڕووی سایکۆلۆژیەوە وەك لەوەی لە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و ئێزگە بێت، چونکە نووسەر یان بلۆگەر لە حوکمە پێشوەختەکان ناترسێ بە تایبەت ئەگەر ئامانج لێی پەیوەندیکردن بێت بە کەسانی دیکە، بۆیە وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد بلۆگ ئامرازێکی ئاسان و خێراترە بۆ پەیوەندیکردن لە نێوان ئاڕاستەکانی شەقام و سیاسەت و ڕیکلامدا، لەوەتەی مرۆڤایەتیشە ئامرازێکی لەم چەشنە ئاسان نەکەوتۆتە بەردەستی مرۆڤ بۆ گوزارشتکردن لەخۆیی و گواستنەوەی ڕووداوەکان لە ڕوانگەی خۆیەوە، بەبێ بوونی هیچ فشار و کاریگەرییەکی دەرەکی لەسەری، دوور لەچاو و مقەسی چاوەدێر و سانسۆر.

هاووڵاتی وای لێهاتووە متمانەنەکات بە میدیای کۆن، **چونکە هەر میدیایە دەبێتە یەکێك لە ئامراز و چەکەکانی هەڵمەتەکانی هەڵبژاردن، هەر ئەوە بە دوای قازانج و داهات** دەگەڕێت لەسەر حیسابی بەرژەوەندیی گشتی، لە بەرامبەر کەمبوونەوەی متمانەی هاووڵاتیان و لاوازبوونی مسداقیەتی میدیادا، ڕۆژنامەوانی بلۆگ بۆ ئاشکراکردنی ڕاستیەکان کاردەکات، ئەو شتانە بڵاودەکاتەوە ڕۆژنامەی تەقلیدی ئامادەنیە یان ناتوانێت بڵاویبکاتەوە، بەهۆی وابەستەبوونی بەرەهەند و جەمسەرگیریە سیاسی و ئابووریەکان، ڕۆژنامەوانی بلۆگ پێویستی بە تێچووی ماددی نیە، زۆربەی کات بەرژەوەندی خودیی و هەوڵدان بۆ گەیشتن بە پۆستی سیاسی لە پشتیەوە نیە یان بیەوێ بەرگری لێبکات، نە سەرمایەی هەیە لەوە بترسێت لە دەستیبدات لە بازاڕی پشکەکاندا، ڕۆژنامەوانی بلۆگ بریتییە لە ڕۆژنامەوانی تاك وەك هاووڵاتیەك هاتۆتەگۆ دوای ئەوەی کەس نەبوو گوێی بۆ بگرێ، بواری نەبووە دەنگ و بۆچوونەکانی لە ڕێگەی میدیای کۆنەوە بگەیەنێتە کەسانی دیکە.

## ٣- ڕۆڵی گەنجان:

دیاردەی بلۆگ لەنێو توێژی گەنجدا بڵاوە، ئەوان پاڵنەر و کارەکتەری سەرەکی بڵاوبوونەوەی ئەم چەشنەی پەیوەندیکردن بوون لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، ئەگەر نەڵێین بەکارهێنانی بلۆگ بە تەنها لەوان پێکهاتووە، بە ڕادەیەك ئەم دیاردەیە یاریدەدەرێکی باش بوو بۆ دیاریکردن و گەڵاڵەبوونی دیمۆگرافیای ئینتەرنێت بە تایبەتی لە بەرامبەر ئەو پرسیارە ئاڵۆز و کۆنەی دەڵێت: کام توێژ زیاتر ئینتەرنێت بەکاردەهێنێت کە فەزایەکی گریمانەییە و هەڵسەنگاندن و بەدواداچوونی هەروا ئاسان نیە.

بلۆگی ئەلیکترۆنی گەنجانی سەر ئینتەرنێتی وەك **نووسەرێکی** کارا پیشاندا باس لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیان دەکەن لە هەڵوێست و بۆچوون و چیرۆك، داوا لە خەڵك دەکات هاوبەشی بکەن لە دەربرین و بڵاوکردنەوەی وردەکاریەکاندا، بلۆگ گوزارشتێکی نوێبوو لە دیموکراتییەتی نووسین، جاران و ئێستاشی لەگەڵدا بێت ماڵ بوو بەسەر خاوەن بڕوانامە بەرزەکان، بەوپێیەی نووسین چالاکیەکە تاپۆکراوە بەسەر نوخبەی ڕۆشنبیر، بۆیە بلۆگ بوو بە نیشانەیەك بۆ دیموکراتییەتی نووسین دوای بەرپابوونی دیموکراتییەتی خوێندنەوە بە تایبەت لە وڵاتانی ڕۆژئاوا، لەبەرئەوەی گەلانی ڕۆژئاوا بە بەراورد لەگەڵ وڵاتانی جیهانی سێ زیاتر دەخوێننەوە، بەگوێرەی ئامارێك لەوبارەوە ساڵی (٢٠١١) بڵاوکرایەوە، تاکی ڕۆژئاوایی لە ساڵێکدا بە تێکڕا دووسەد کاتژمێر بەدیار کتێب خوێندنەوە بەسەر دەبات، لە بەرامبەردا تاك لەوڵاتانی جیهانی سێدا لە ساڵێکدا تەنها شەش خولەك دەخوێنێتەوە، هەربۆیەش خوێندنەوە هەوێنی سەرهەڵدانی ڕەفتار و فۆڕمی نوێی نووسینە، کاتێکیش ئینتەرنێت ئەو دەرفەتەی بۆ گەنج ڕەخساند بێنە نێو دونیای نووسین و گوزارشتکردن لە پرسە گشتی و تایبەتیەکان، پەیامێکیان ئاڕاستەکرد بریتیبوو لەوەی: ببورن لە بلۆگ زیاتر ئامرازێکی دیکە بەدیناکەین گوزارشت لە خۆمان بکەین، بلۆگ یەکەم دەرفەت و دوا دەرفەتی بەردەمانە.

## ٤- پاڵنەری قازانج و بازاڕگێڕی

دەستەبەرکردنی خزمەتگوزاری بلۆگ پاڵنەری قازانج و بازاڕگێڕیی لە پشتەوەیە، کۆمپانیاکانی پەیوەندیکردن و ئینتەرنێت دەیانەوێ لەو ڕێگەیەوە بەدیبهێنین، بلۆگ سەرباری ئەوەی بەکارهێنان و دروستکردنی بەخۆڕاییە، بۆتە هۆکارێك بۆ ئەوەی خەڵك زیاتر ئینتەرنێت بەکاربهێنێ و بە دوایی زانیاری و هەواڵ بگەڕێت لەبوارە جیاجیاکان

دا، هەروەك بلۆگ بوار لە بەردەم ئەو کۆمپانیایانە دەرەخسێنێت ڕیکلامی ئاڕاستەکراو بۆ بلۆگەرەکان دابنێن، ئاشکراشە زۆربەی وەبەرهێنانەکانی سەدەی نوێ لە بواری زانیارییەکان و تەکنەلۆژیای زانیاریدایە، ئەم وەبەرهێنان و ڕکابەریە ڕێگە خۆشدەکات بۆ داهێنان و ڕەنگالەیی زیاتر لە خزمەتگوزارییەکانی ئینتەرنێت تاوەکو قازانج و داهاتی زیاتر ڕابکێشێت، بۆیە بلۆگ باکگراوندێکی بازاڕگێڕی هەیە و یەکێکە لە بوارەکانی ئابووری ئینتەرنێت.

**٥- کارەسات و قەیرانەکان**

یەکێك لەهۆکارە ناڕاستەوخۆکان لەخێراکردنی بڵاوبوونەوەی دیاردەی بلۆگ، دەکرێ باس لە شەڕی دژ بە عێراق **بکرێ** سەرنج و بایەخی بلۆگەرەکانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەلای خۆیدا ڕاکێشا، کاتێك یەکێك لە سەربازانی سوپای ئەمریکی (جاسون) لە ڕێگەی بلۆگەوە یادەوەریەکانی خۆی لەو شەڕەدا بڵاودەکردەوە و لەپاڵ ئەمەدا کۆمەڵێك وێنەی لەو بلۆگە دانابوو دیوی مەرگەسات و وێرانکاری ئەو شەڕەی دەخستەڕوو، ئەو سەربازە توانی لەو بلۆگە مەینەتی و هیواکانی لەو ڕێگەیەوە بگوازێتەوە و سەرکەوتوو بوو لە پێشکەشکردن و گەیاندنی ئەو ڕاستیانەی میدیای ئەمریکی بەلایدا نەچووبوو، ئەویش گرنگیدان بوو بە بۆچوونی هاووڵاتیانی عێراقی و مەینەتی و مەرگەساتەکانیان لەکاتی شەڕەکەدا.

بەر لە هەڵگیرسانی شەڕ ژمارەیەك بلۆگ دانران پشتگیریان دەکرد لەو ڕێکخراوانەی بەرهەڵستیان لە شەڕ دەکرد و داکۆکیان لە مافەکانی مرۆڤ دەکرد بە تایبەتی ئەوانەی وەك قەڵغانی مرۆیی لەو شەڕەدا بەکاردەهێنران، یادەوەری و کۆمێنتی ئەو بلۆگەرانە سەبارەت بەنوێترین ڕووداو و پێشهاتەکانی شەڕ لە عێراق دەگەیشتە هەموو جیهان و **پێشوازییەکی** زۆری لێکرا، ئیدی وایلێهات لەو بلۆگانە هەواڵی شەڕ بە شێوەیەکی سەربەخۆ و جیا لە ئامرازەکانی میدیای کلاسیکی بڵاودەکرایەوە، تەنها لە هەفتەی یەکەمی شەڕ دژ بە عێراق ماڵپەڕەکانی بلۆگ باشترین ئەو ماڵپەڕانە بوون ڕووماڵێکی **سەرنجڕاکێشی** شەڕیان پێشکەشکرد، بە بەراورد لەگەڵ ئەو لایەن و ماڵپەڕە میدیایانەی دیکە، هەندێك لەو بلۆگانە تۆمارێکی مێژوویيان پێشکەشدەکرد بۆ شەڕەکە بە شێوەیەکی ڕۆژانە بە پشتبەستن بە یادەوەری و زانیاری شایەتحاڵ و بەشداربووانی ناو ڕووداوەکان.

**سەرنجڕاكێشی** و كاریگەری بلۆگ لە كارەساتەكەی تسۆنامی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ئەوكاتەی نووسەرانی بلۆگ توانیان ڕووماڵی قۆناغەكانی ئەو كارەساتە بكەن لە ڕێگەی وێنە و زانیاری سەبارەت بەو وێرانكاریەی لەو كارەساتە كەوتۆتەوە، تەنانەت زۆرێك لەكەناڵە تەلەفزیۆنەكان بەشێك لە زانیاری وردەكاریەكانی تایبەت بە ڕووداوەكەیان لەو بلۆگانە دەگواستەوە، جگە لەمە بلۆگەكان ڕۆڵێكی مرۆڤدۆستانەیان ببینی لە هاندانی خەڵك بە بەخشین و یارمەتیدانی لێقەوماوان، ئەو جۆش و خرۆش و كێبڕكێیەی بلۆگەكان وایكرد لە حكومەتی بەریتانیا ئاستی یارمەتیەكانی بۆ لێقەوماوان بەرزبكاتەوە، ئەم پێشدەستی ڕۆژنامەوانییەی بلۆگەكان لە میانەی زریانی (كاترینا) دووبارەبۆوە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكای گرتەوە، بەمشێوەیە بلۆگەكان بە شێوەیەكی **سەرنجڕاكێش** و داهێنەرانە بەرجەستەبوونێكی هەستی مرۆڤایەتییان پێشكەشدەكرد، بوو بە نموونەیەكی پراكتیكی بۆ چۆنیەتی سوودوەرگرتن لە تەكنەلۆژیای پەیوەندیكردنی نوێ وەك ئامرازێك بۆ یارمەتیدانی ڕای گشتی بە شێوەیەكی كارا و **سەرنجڕاكێش،** لە ڕێگەی گوزارشتكردنی لە هەست و بۆچوونەكانی سەبارەت بە شەڕ و كارەسات و پرسە مرۆییەكانی دیكە.

ئەم هۆكارە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیانە وایانكرد بلۆگ وەك ڕۆژنامەیەكی ئەلیكترۆنی دەربكەوێ، ئەم دیاردەیە نوێیە شوناسی ئینتەرنێتی بۆ دەرخستین، بە جۆرێك لەو تۆڕەدا ئەو شتانە زیاتر دەردەكەون و بڵاودەكرێتەوە كە نهێنی و چەپێنراو و پەراوێزخراو و دژە لەگەڵ ڕای زۆرینە یان نوخبەی دەسەڵاتدار، بەشێك لەكاریگەری بلۆگ لەوەدایە وەڵامدەرەوەی خواست و پێویستیەكانی بەشێكی بەرفرەوانی بەكارهێنەرانیەتی.

## جۆرەكانی بلۆگی ئەلیكترۆنی

بلۆگ تەنها لەیەك جۆر و شێوەدا كورت نەبۆتەوە، بەڵكو جۆر و شێوەی جیاجیای هەیە، لە ڕووی ناوەڕۆكەوە بلۆگی ئابووری، هەواڵی، وەرزشی، ئایینی، چێژبەخشین، سیاسی، هونەریی و تەكنەلۆژیی هەیە، بە ناوبانگترین ئەو جۆرانەش سیاسیی و وەرزشییە بە پلەی سێیەم بلۆگی تەكنەلۆژیی دێت، بۆیە ژمارەكی زۆری بلۆگەكان لە جیهاندا باس لە پرسە سیاسییەكان دەكات، زۆربەیان بۆچوونی نووسەرەكانیەتی، نەوەك

هەواڵ و زانیاری، هەندێ لە بلۆگەکان باس لە هەموو شت دەکەن و پەیوەستنین بە ئاراستە و بابەتێکی دیاریکراو بە جۆرێك لەوانەیە لەبلۆگێکدا هەواڵێکی سیاسی بلاوکراوەتەوە لە تەنیشت هەواڵەکەش لینك و بابەتێك دانرابێت باس لە یادەوەریە ڕۆژانەکانی بلۆگەرەکە بکات، لینك و بابەتێکی تری دانابێت باس لە ئەندازیاری دەروونی دەکات، نموونەش لەوبارەوە یەکجار زۆرن، هۆکاری ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ناپسپۆڕی بلۆگەرەکە لە یەکێك لەو بوارانەدا، نەبوونی تواناو شارەزایی تەواو بۆ ئەوەی گرینگی تەنها بەیەك لەو بوارانەدا بدات و تیشکی بخاتەسەر، بۆیە بلۆگەر ناچاردەبێت قسە لەسەر هەموو شت بکات و ماڵپەڕەکەی پڕبکاتەوە بەو شتانەی خۆی بە گونجاوی دەبینێت، لە ڕووی شێوەشەوە چەند جۆرێکی جیاجیا لە بلۆگ هەیە لەوانە:

١- ئەو بلۆگانەی خزمەتگوزاری لینك فەراهەمدەکەن (link blogs) ئەو بلۆگانە لینکی زانیاری لەخۆیدەگرێ (web link blogs) یەکەم جۆری بلۆگ بوون لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت **بلاوکراونەتەوە**، لێرەوە ناونران بە (web blogs)، ئەم بلۆگانە ژمارەیەکی زۆری لینك لەخۆیدەگرێ سەبارەت بە ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت کە خاوەنەکەی وایدەبینێ شایەنی ئەوەیە بەکارهێنەر سەردانی بکات، ئەمە سەرباری ڕوونکردنەوەیەکی کورتی ئەو ماڵپەڕانە کەلینکەکە ئاماژەی بۆ دەکات.

٢- بلۆگی یادەوەری ڕۆژانە (ondiary blogs)

ئەم بلۆگانە یادەوەری ڕۆژانەی ژیانی خاوەنەکانی لەخۆیدەگرێت، چی کردوە و ئەو ڕۆژە ڕووبەڕووی چی بۆتەوە و کێی بینیوە، مەرجیش نیە ئەو بلۆگانە لینکی ماڵپەڕەکانی دیکەی ئینتەرنێت لەخۆیبگرێت.

٣- بلۆگی وتار (article blogs)

لەم بلۆگانە زیاتر لێدوان و بۆچوون لەمەر هەواڵ و ڕووداوەکان **دەخرێتەڕوو**، کەمتر باس لە ژیانی ڕۆژانەی خاوەنەکەی دەکات.

٤- بلۆگی وێنەیی (photo blogs)

ئەمجۆرە لە بلۆگ گرنگی بە وێنە دەدات وەك وێنەی ئەو ڕۆژە و شتی تریش.

٥- بلۆگی پەخشی ئێزگەیی (pod casts blogs)

دەکرێ پارچەی دەنگی و پەخشی ئێزگەیی (pod casts) بەوە پێناسە بکرێ کە بەرنامەی ئێزگەیی کورتن و تۆمارکراون لە ڕێگەی خاوەنەکەیەوە تۆمار و ئامادەکراوە،

بەکارهێنەر دەتوانێ داونلۆدی بکات، زاراوەی (pod casts) لە ئامێری (I pad) وەرگیراوە بەکاردێت بۆ گوێگرتن لە تراکە دەنگیەکانی لە شێوەی (mp3)، دەتوانێ بەرنامەکانی (pod casts) بەکاربێنێت.

٦- بلۆگی پەخشی ڤیدیۆیی (video casts blogs)

بە هەمان شێوەی جۆری پێشوو، ئەم بلۆگانە زیاتر گرتەی ڤیدیۆیی لەخۆدەگرن، ئەمە نوێترین جۆرەکانی بلۆگە.

٧- بلۆگی هەمەڕەنگ

ئەمە هەموو چەشنەکانی پێشووی بلۆگ تێیدا ڕەنگیداوەتەوە.

٨- بلۆگی بەکۆمەڵ

ئەم بلۆگەش لەلایەن ژمارەیەك **نووسەر** بە هاوبەشی کاری لەسەر دەکرێ ناوەڕۆکەکەی بەرهەمی ئەو **نووسەرانە** دەبێت نەك یەك کەس بەتەنها.

## تایبەتمەندییەکانی بلۆگ

دوای خستنەڕووی تایبەتمەندییە تەکنیکییەکانی بلۆگ، هەوڵدەدەین باس لە تایبەتمەندییەکانی بکەین لە ڕووی پەیوەندیکردن و بەکارهێنانەوە:

-بلۆگ هۆکارێکی کارای پەیوەندیکردنی نێوان تیمی کارکردن و ئەندامانی یەك کۆمپانیایە، بلۆگ ڕێگەدەدات بە ئەندامانی تیمەکە بە دانانی لینك، بابەت و کۆمێنتەکانیان، بلۆگ دەرفەتی ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵی خێزانی نێوان یەك خێزان دەڕەخسێنێت، هەروەك گروپە بچوکەکانیش بۆ پەیوەندیکردن سوود لە بلۆگ وەردەگرن بە شێوەیەکی ئاسان و خێراتر لە پۆستی ئەلکترۆنی یان تەنانەت کۆڕبەندەکانیش.

١. بلۆگ یاریدەدەرە بۆ ئەوەی هەموولا بە بەردەوامی ئاگاداری گۆڕانکاریەکانی پەیوەست بە ڕووداو یان بابەتێك بن، هۆکارێکیشە بۆ بڵاوکردنەوەی کلتوری گروپ و کۆمەڵگەیەك، بوار ڕەخساندن لە بەردەم هەریەکێك لەوان گوزارشت لە ڕاوبۆچوونی خۆیان بکەن.

٢. بەکارهێنانی ئاسانە چ بۆخاوەنی بلۆگ یان بەکارهێنەر، بلۆگەر دەتوانێ بە چەند خولەکێکی کەم بلۆگەکەی دروستبکات، دوای ئەوە پڕۆسەی نووسین پێوستی بە کۆشش و ماندوو بوونی زۆر نیە، هەرچی ئەوکەسانەی سەردانی بلۆگەکە دەکەن بە

ئاسانی دەتوانن سەیری ناوەڕۆکەکەی بکەن لەبەرئەوەی لەسەر بنەمایەکی ڕوون ڕیزبەند و ڕێکخراوە، پرۆسەی کۆمێنت نووسین بەو شێوەیە زەحمەت نیە و زۆربەی جاریش پێویست بە تۆمارکردن و نووسینی ئیمەیڵ و پاسوێرد نیە بۆ ئەوەی بۆچوونی خۆت لەمەر بابەتەکان بنووسیت.

٣. بلۆگ پانتایەکی فرەوان لە بەردەم بلۆگەر واڵادەکات بۆ دەربڕینی بیروبۆچوون و تێگەیشتنەکانی دوور لە مقەس و راوەدوونانی چاوەدێر، ڕەنگە بەکارهێنەر بەو بیروبۆچوونانە ڕازی نەبێت و جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە بۆ ئەو بلۆگە، بواری هەیە لەگەڵ بلۆگەرەکە وتوێژ بکات بەڵام ناتوانی بۆچوونەکانی بەسەر بلۆگەرەکە پسەپێنێت.

٤. بوونی هەموو کار و بەرهەمەکانی بلۆگەر لەیەك شوێندا، لەبری ئەوەی ئەو کار و بەرهەمانە لەچەند ماڵپەڕێك پەرشوبلاو بێتەوە، هەمووی لە بلۆگەکەی دادەنێت.

## لایەنە ئەرێنیەکانی بلۆگ

١. بلۆگ ئامرازێکی گرنگی بلاوکردنەوەیە و لە ڕێگەیەوە پێگەی ئینتەرنێت زیاتر بووە وەك ئامرازێکی ڕادەربرین و پەیوەندیکردن.

٢. ئامرازێکی بلاوکردنەوە، پڕوپاگەندە و رێکلامکردنە بۆ پڕۆژە و هەڵمەتە جیاوازەکان.

٣. ئامرازێکی ئاسان و بەخۆڕاییە، زەمینەیەکی باشە بۆ داهێنان و خۆسەڵماندن و ئافراندن.

٤. ئامرازێکی کایگەری بەزاندنی کۆتوبەندە دروستکراو و چاوەدێرەکانە، بەوپێیەی ئینتەرنێت دیموکراتییەتی زانیاری لەسەر ئاستی جیهان فەراهەمهێناوە.

٥. کەرەستەیەکی گرنگی گوزارشتکردنە لە خەمە تایبەتی و گشتییەکان، بۆیە بلۆگ بۆتە کەرەستەیەك بۆ ئاشکراکردنی ئەو شتانەی داکۆکیکاریان نیە و لە ئاستیاندا بێدەنگی هەیە.

٦. بەرجەستەکردنی ئازادیی ڕادەربرین بە شێوەیەك وشە و پەیڤەکان زیاتر لە خەڵك نزیکن، هەواڵ و زانیارییەکان زۆرجار لەوەی لە میدیای کۆن بڵاودەکرێتەوە ورد و ڕاستگۆترن.

٧. بلۆگ بەراشکاویەکی زۆرەوە باس لە خەمی مرۆڤی شەقام و گەنجێکی ئاسایی دەکات، لە ڕێگەیەوە دەکرێت هەست بە خواست و مەینەتی ئەو توێژە بکرێت.

٨. بلۆگ بەخێرایەکی زۆر لە نێو گەنجاندا بڵاودەبێتەوە، لە ڕێگەیەوە دەکرێ خزمەتگوزاری پێشکەش بە کۆمەڵگە بکرێ لەبەرئەوەی بەزمانێکی سادە و گەنجانە دەدوێ، بلۆگەکان سەرباری ئەوەی سادە و خێران، لینکی بلۆگە هاوشێوەکانی دیکە لەخۆیدەگرێت بۆ یارمەتیدانی بەکارهێنەر سەردانی ئەو بلۆگانە بکات و ئاشنابێت بە ناوەڕۆکەکانیان.

## لایەنە نەرێنییەکانی بلۆگ

١. ئەو ئازادییە بێ سنورەی لە بلۆگ نووسیندا بانگەشەی بۆ دەکرێت، هەندێجار لەسەر حیسابی ئاکار و بەها باڵاکانی کۆمەڵگە دەبێت، ئەگەرچی لەم خاڵەدا کەسێتی و بیرکردنەوەی بلۆگەر و خوێنەر ڕۆڵی خۆی دەبینێت لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ بلۆگ وتەواوی لایەنە پراکتیکیەکانی دیکەی تۆڕی زانیاری جیهانی.

٢. بلۆگ لە ئێستادا بووەتە سەرچاوەیەکی نیگەرانی و بێزاری حکومەتە تاکڕەو ودیکتاتۆرەکان، لەوە دەترسن بلۆگ ببێتە کەرەستەی دەستی هاووڵاتیانی ئاسایی بۆ ڕادەربرین و ڕیسواکردنی کارەکانی حکومەت و دەسەڵاتی سیاسی.

٣. زۆرجار لەو بلۆگانە بلۆگەر بەبێ سڵەمینەوە و ڕەچاوکردنی سنورەکان، دەستەواژەی ئەوتۆ بەکاردەهێنێت زیاتر لە جوێن و بریندارکردن نزیکە لە دژی یەکدی یان لە دژی بەپرسە ڕەسمیەکان.

٤. هەندێ بلۆگ هەیە کار لەسەر چاندنی تۆوی ڕەگەزپەرستی دەمارگیری دەکات، هانی رق و کینە و توندوتیژی دەدات، هەندێ لەو بلۆگانە جگە لە جوێندان شتی دیکەی لێ بەدیناکرێت. بەوپێیەی بلۆگ لە ڕوانگەی خاوەنەکەی تاکە دەرفەتە لە بەردەمی بۆ دەربڕینی ڕای خۆی بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ پێوەر و سنورێك بۆ نووسین.

**بلۆگە کوردیەکان شوناس و بەربەست**

قسەکردن لەبارەی شوناسی بلۆگە کوردیەکان، بە مانای سۆراخکردنی ئەو ڕوالەت و سیمایانە دێت جیایدەکاتەوە لەوانی دیکە، گەڕان و دەستنیشانکردنی جوگرافیای بلۆگ و بلۆگەرە کوردیەکانە، کە هەڵگری ئەم خەسڵەتەن بیکاتە خاوەنی شوناس و تایبەتمەندیی سەربەخۆ.

بە شێوەیەکی گشتی سەبارەت بە بلۆگە کوردیەکان هێشتا وێنەکە تەواو ڕوون نیە، لە ڕووی پاڵنەر و ئامانجەوە تێکەڵاوی و بەیەکداچوون هەیە، ڕەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك: لەوانە:

١-تازەیی و کورتی تەمەنی بڵاوبوونەوەی ئینتەرنێت لە کوردستان و سوودوەرگرتن لەلایەنە پراکتیکیەکانی ئەو ئامرازە لە نێویشیاندا بلۆگ.

٢- ژێرخانی پێویست بۆ دابینکردنی ئەو خزمەتگوزارییە کاری جددی بۆ نەکراوە، بە تایبەتی لەسەر ئاستی ڕەسمی، ئەو هەوڵانەش کە هەن زیاتر هەوڵی **تاکەکەسیی** و کۆمپانیاکانی کەرتی تایبەتە.

- بەهۆی بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتیی، بەشێکی زۆر لە خێزانەکان، درەنگ نوێکردنەوەی سیستەم و پرۆگرامەکانی خوێندن، هێشتا ڕۆشنبیری ئەلیکترۆنی لای تاکەکان لەوانەیە بەوشێوەیە ڕەنگینەداوەتەوە، بۆیە لە ئێستادا ژمارەی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت لە وڵاتە تازەپێگەیشتوەکان بەوشێوەیە نەبێت، ئەگەرچی ئامارەکان ئاماژە بەوەدەکەن ڕێژەی بەکارهێنەران بەهۆی گۆڕانکاریە سیاسییەکان و نەمانی بەشێك لە ڕژێمە دکتاتۆرەکان و باشبوونی ئاستی بژێوی خەڵك، ژمارەی بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت لە قۆناغی داهاتوودا زیاتر دەکات.

- نەبوونی داتا و ئاماری ڕەسمی و باوەڕپێکراو لە هەرێمی کوردستان سەبارەت بە بەکارهێنانی بلۆگ و ڕێژەی بەکارهێنەر و شوناسی بلۆگەر و ناوەڕۆکەکانیان، ئەم گرفتە تەنها پەیوەست نیە بە بلۆگ، بەڵکو بەشێك لە گرفتە گەورەکانی ئەم هەرێمە ئەوەیە سەبارەت زۆر بابەت و بوار و دیاردەی گرنگ ڕووبەروی گرفتی نەبوونی داتا و ئاماری رەسمی پێویست دەبینەوە.

بەهەر حاڵ بلۆگە کوردیەکان بەهۆی ئەو هۆکارانەی سەرەوە وەکو پێوست گەشەی نەکردوە وەك ئەوەی لە دونیای خۆرئاوا ئاماژەمان پێکردوە، بلۆگە کوردیەکان لە قۆناغێکی ڕاگوزەری هەستیار و گۆڕاودا دروستبوون، لە سەرەتادا زیاتر لەو کەسانە کورتبووەوە لە ڕووی تەکنیکەوە توانا و شارەزاییان هەبوو لە بواری کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت، بەڵام دواتر هەندێ لە کەسایەتی سیاسی و ڕۆژنامەوانی و ئاینی و کۆمەڵایەتییەکانیش، ماڵپەڕی کەسیی تایبەت بە خۆیان دانا، لە ڕێگەیەوە ڕاوبۆچوونی خۆیان دەردەبڕی سەبارەت بەو پرس و بابەتانەی بەلایانەوە جێگەی گرنگی بوو، بەهۆی تازەیی دیاردەی بلۆگ زەحمەتە بتوانرێ بە ڕوونی دەستپێك و سەرەتای بلۆگە کوردیەکان دەستنیشان بکرێ، ئەوە جگە لەوەی زۆرێك لەو بلۆگانە لە ڕووی نوێکردنەوەی ناوەڕۆك و شێوازی شیکردنەوە، هەژاری زۆری پێوە دیارە، کە ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ کەمی شارەزایی تەکنیکی خاوەنەکەی لەو بوارە یان ئەوەی بلۆگ و کار لەسەرکردنی لەلایەن خاوەنەکەی وەکو پێویست گرنگی پێنەدراوە، ئەگەرچی لەهەندێ ڕواڵەتدا بلۆگە کوردیەکان جیاوازیەکی ئەوتۆیان نیە لەگەڵ بلۆگە عەرەبی و بیانیەکان، وەلێ ئەوەی لە زۆرینەی بلۆگە کوردیەکان بەدیدەکرێت زاڵبوونی ڕەوتی ڕەخنەگرانەیە لەو دۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتیی وئیداری و ئابووریەی هەرێمی کوردستان، گرنگیدان بە کار و بڕیارە نادیموکراتی و گەندەڵیەکانی کەس و دامەزراوە ڕەسمیەکانی دەسەڵاتی سیاسی و حیزبە فەرمانڕەواکانی هەرێم، بە نەفەسێکی توڕە و هەڵچوو نووسراوە، لە زۆر شوێندا بنەماکانی نووسین، ئیتیکی ڕۆژنامەوانی، گفتوگۆ و ڕەخنەگرتنی بەزاندووە و جوێن و بریندارکردن و ناوزڕاندنی زۆر لەخۆیدەگرێت، ئەمە لە پێشتر وەك یەکێك لەلایەنە نەرێنییەکانی ئینتەرنێت و بلۆگ باسی لێوە کرا.

وەکو باسکرا بەهۆی ئەو دۆخەی لە هەرێم هەیە، هێشتا بەربەستی زۆر هەیە لە بەردەم بەکارهێنانی بلۆگ لەلایەن خاوەنەکانیان بەبێ بوونی ترس و فشار، ڕەنگە بەشێك لە بلۆگەرەکان بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو فشار و ترسانە لەژێر ناوێکی خوازراوەوە بۆچوونەکانی لە بلۆگەکەیدا بڵاوبکاتەوە، یان ئافرەت نەتوانن شوناس و کەسێتی خۆیان ئاشکرابکەن بەهۆی کلتور و ڕێگرە کۆمەڵایەتییەکان، بەڵام ناوەڕۆکی ئەو بلۆگانە گوزارشت لە ڕەوشی ڕاستەقینەی بەشی هەرەزۆری ئەو چین و توێژانە دەکەن کە بلۆگەرەکان نوێنەرایەتی دەکەن.

لەو ڕوانگەیەوە بیرکردنەوە و کلتوری دیموکراتی وەکو پێویست شۆڕنەبۆتەوە بەناو دامەزراوە تەناهییەکانی هەرێمی کوردستان، بۆیە هەندێجار لە دەرەوەی ڕێکارە یاساییەکان مامەڵە لەگەڵ خاوەنی هەندێ لەو بلۆگانە کراوە، لە ڕێگەی هەڕەشە و ترساندن و زیندانیکردن هەوڵدراوە ڕێگە لەو شەپۆلەی دەنگە ناڕازیی و ڕەخنەگرە بگیرێت و بێدەنگ **بکرێت**.

بلۆگە سیاسییەکان زاڵترین جۆری بلۆگە کوردیەکانە، ئەمە دەرهاویشتەیەکی سروشتی ئەو بارودۆخە سیاسیەیە، هەرێمی کوردستانی پێدا گوزەردەکات، پرسە سیاسییەکان بەهۆی گرنگی و **پەیوەستبوونی** بە بەرژەوەندی هەموولایەك و ڕەنگدانەوەی بەسەر هەموو بوارەکانی ژیان، سەرباری ئەو گۆڕانەی لە **کارابوونی** ئۆپۆزسیۆنی سیاسی و میدیای ئەهلی و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دروستبووە، هەموو ئەمانە تەکانێکی زیاتر دەدەن بۆ بەکارهینانی تەکنەلۆژیای زانیاری نویٚ، ئاڕاستەکردنی ڕەخنە و نواندنی فشار و گەیاندنی خواست و داواکاریەکان لەو ڕێگەیەوە. لەم بەینەشدا بەربەستە سیاسی و تەناهی و کلتوری و دواجار تەکنیکیە پەیوەستەکان بەتوانا و شارەزایی کەسەکان بەو بوارە تازەیەی تۆڕی زانیاری هۆکار و ڕێگر دەبن لە **کەمکردنەوەی** ئاستی کارایی و کاریگەری بلۆگ لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا.

## سەرچاوەکانی بەشی دووەم

١. انتصار ابراهيم عبدالرزاق، صفد حسام الساموك، الاعلام الجديد تطور الاداء والوسيلة والوظيفة، جامعة بغداد، ٢٠١١.

٢. د.عبدالرزاق محمد الدلَيمي، الاعلام الجديد والصحافة الالكترونية، الطبعة الاولي، دار وائل للنشر، عمان ٢٠١١.

٣. ملاك بنت عبدالله ابراهيم المرشد، الخصوصية في الشبكات الاجتماعية، مركز التميز لأمن المعلومات، سلسلة المقالات العلمية.

٤. الشبكات الاجتماعية، الموقع العربي لموسوعة ويكيبيديا: http: .ar.wikipedia.org/wiki

٥. زاهي علاوي، المدوونات نافذة للحوار ووسيلة لدفع عجلة الديمقراطية.

6. Source: http: //www.amarji.org/about.ht (accessed 19/04/2008)

٧. عمار بكار، فرص نجاح إعلام بديل من القارئ للقارئ محدوودة، جريدة العرب الاقتصادية، العدد٥٣٣٣..

8. Source: http: //www.mysearch.com/jsp/cfg_redir2.jsp?ido (accessed 18-05-2008)

٩. سامي نصر، تحديات الإعلام البديل...

10. Source: http: //www.kalimatunisie.com/article.php?id=545 (Consulté le12/01/2008)

11. جمالَ الزرن، دراسة بعنوان سلطة التدووين، مجلة الشؤون العربية علي النت، ٣١ يوليو ٢٠٠٧، العدد ١٣٠.

١٢. نازهنين عوسمان محمد، ئالۆودەبوون لەسەر ئینتەرنێت، گۆڤاری زانستی سەردەم، ژمارە(٤٥)

13. Facebok Creating a Facebook Page November 2007.

14. ٧things you should know about Facebook، www.educause.edu/eli ،September 2006.

# بەشی سێیەم

## ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی

### دەستپێك

ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی گوزارشتە لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و پەرەسەندنە خێراکانی هۆکاری پەیوەندیکردن، ئەم ڕۆژنامەوانیە لە پرۆسەی گەیاندنی هەواڵ و زانیاری بە جەماوەر پشت بە هۆکارە ئەلیکترۆنییەکان دەبەستێت.

ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی ئەگەرچی لە ئامانجدا لەگەڵ ڕۆژنامەوانی کاغەزی چاپکراودا هاوبەشە، بەڵام پشت بەستنی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی بە تەکنەلۆژیای نوێ خاڵی جیاکەرەوەیە لە نێوانیان دا، ئەمە وایکردوە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی گۆڕانێکی سەرتاسەری بەسەر پێکهێنەرەکانی پرۆسەی پەیوەندیکردندا بێنێتەئاراوە، بە جۆرێك گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەر هۆکار و پەیام و نێرەر و وەرگر و فیدباك و شێوازەکانی بازارگێڕی و هونەرەکانی ڕێکلامکردن داهێناوە.

ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی کەشوهەوایەکی پەیوەندیکردنی جیاواز لە میدیای کۆنی دەستەبەرکردوە، لە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی هەمەڕەنگیەکی بەرفرەوان لە هۆکار و ناوەڕۆك دا بەدیدەکرێت، ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی پابەند نیە بە قەبارە و پانتاییەکی دیاریکراو، بۆیە لە توانایدایە ئاست و خولیاو بایەخپێدانە جیاوازەکان ڕازی بکات،

لەمجۆرە ڕۆژنامەیەدا مرونەتێکی زۆر لە هەڵبژاردن و نمایشکردن و تێگەیشتن و شیکردنەوەی زانیاری و دیکۆمێنتەکان دەبینری.

## پێناسەی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی

لەبەرئەوەی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو سەریهەڵداوە بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژنامەی کاغەزی تەمەنێکی کەمی هەیە، هەر بۆیە لە ڕووی چەمك و بنەمای تیۆری تایبەت بەخۆیەوە، تێروانینی توێژەران و شارەزایان لەبارەیەوە ڕۆشن نیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی بەردەوام لە ئارادایە چوارچێوەیەکی گشتی و پێناسەی تایبەتی بۆ جیاکردنەوەی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی لە ڕۆژنامەوانی کاغەز بۆ دیاری **بکرێت**.

پێناسەکردنی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی کارێکی هەروا ئاسان نیە، بەهۆی پێشکەوتنە خێراییەکەیی و فرەیی لە جۆری ئەو هۆکارانەش کە لە ڕێگەیەوە ناوەڕۆکە ڕۆژنامەوانییەکان بڵاودەکرێنەوە، لە وەسفکردنیدا چەندین زاراوە و دەستەواژەی جیاجیا بەکاردەهێنرێت لەوانە:

- ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی (Electronic Journalism).
- ڕۆژنامەوانی ئینتەرنێت (Internet Journalism).
- ڕۆژنامەوانی وێب (Web journalism).
- ڕۆژنامەوانی ئۆنلاین (Online journalism).
- ڕۆژنامەوانی کارلێکی (Interactive Journalism)

لەگەڵ چەندین زاراوەی دیکە کە هەموو ئەمانە بە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی ئەژماردەکرێت، بەڵام لە شێواز و هۆکاری بڵاوکردنەوەدا جیاوازی لەگەڵ ڕۆژنامەوانی کاغەزدا هەیە، دەکرێ بڵێین ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی بڵاوکراوەیەکی بێ کاغەزە و لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت و هۆکاری دیکە نمایش دەکرێت کە ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

*چاپی ئەلیکترۆنی ڕۆژنامە کاغەزیەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.
*ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان کە چاپی کاغەزیان نیە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.
*ماڵپەڕی ڕۆژنامە کاغەزیەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.

*ماڵپەڕی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ئاژانسەکانی هەواڵ.
*ماڵپەڕە هەواڵییەکان
*ماڵپەڕی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.

لێرەدا چەند پێناسەیەك دەخەینە ڕوو کە لەلایەن توێژەرەوانەوە بۆ ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی کراوە:

ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان ئەو ڕۆژنامانەن لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت دەردەچن و بڵاودەکرێنەوە و بە شێوەی ڕۆژنامەی چاپکراو لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر دەردەکەون، بابەت و لاپەڕەکانی پێکدێت لە نووسین و وێنەو هێڵکاری و دەنگ و وێنەی جوڵاو.

- ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان ئەو ڕۆژنامانەن کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت و تۆڕەکانی دیکەی زانیاری دەردەچن و بڵاودەکرێنەوە، ئەو ڕۆژنامەیە دەشێت چاپی ئەلیکترۆنی ڕۆژنامەیەکی کاغەزی بێت یان ڕۆژنامەیەکی ئەلیکترۆنی بێ و چاپی کاغەزی نەبێت، ڕۆژنامەیەکی گشتی بێت یان تایبەتی، کۆپیەکی دەقاودەقی ڕۆژنامە کاغەزیەکە بێت یاخود پوختەکراوی بابەتە بڵاوکراوەکانی بێت، مادام بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دەردەچێت مەبەست لەمەشدا ئەوەیە ناوەڕۆکەکەی بەردەوام تازە دەکرێتەوە لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دیکە بەگوێرەی توانا تەکنیکی و مرۆیی و پیشەییەکانی لایەنی پەخشکار.

- ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بریتیین لە ڕۆژنامە ناکاغەزیەکان کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاودەکرێنەوەو خوێنەر هەڵدەستێت بە سەیرکردن و خوێندنەوەی لاپەڕەکانی و گەڕان بە ناویدا، سەرباری هەڵگرتنی ئەو بابەتانەی پێویستیەتی و چاپ کردنی ئەو بابەتانەی کە ئارەزووی چاپ کردنیان دەکات.

دکتۆر عیماد بەشیر بەمشێوەیە پێناسەی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی دەکات "ئەو ڕۆژنامەیەیە سیفەتەکانی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی کاغەزی لێ بەدیدەکرێت لە ڕووی کاتی دەرچوون و هەمەڕەنگی بابەتەکانی و بەکارهێنانی هونەرە ڕۆژنامەوایەکانی وەك هەواڵ، گفتوگۆ، شیکردنەوە، ریپۆرتاژ و وتاری ڕۆژنامەوانی، بەڵام ئەوەی جیای دەکاتەوە لە ڕۆژنامەی کاغەزی بوونی بابەتە ڕۆژنامەوانیەکەیە لە شێوەی دەقێکی ئەلیکترۆنی کە دەکرێ لە ئینتەرنێت لێی بگەڕێین و دووبارە دەستکاری **بکرێ** و دابرێژرێتەوە دوای داواکردن و هەڵگرتنی وەك بابەتێکی ڕۆژنامەوانی نوێ، یەکێکی دیکە لە جیاکەرەوەکان خێرایی گەیشتنە بە بابەتە ڕۆژنامەوانیەکە بە زیاتر لە ڕێگەیەك ".

زایگن لی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بە ڕۆژنامەی ئینتەرنێت ناودەبات ( Internet newspaper) و دەڵێت:"ئەو بڵاوکراوەیە کە لە تۆڕی زانیاری جیهانی دەستدەکەویٚ لە ڕێگەی بەرنامەکانی گەران (Navigation software) دەکریٚ بخوێنریٚتەوەو لاپەڕەکانی هەڵبدرێتەوە، ئەم ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییانەی تایبەت بەو ڕۆژنامانە دروستدەکریٚن لە ڕێگەی بەکارهینانی دانانی کۆد بۆ دەقی پێشکەوتوو ( Hypertext Markup Language HTML) و ئامرازی دیکەی نەخشەسازی کە پشت بە کۆمپیوتەر دەبەستێت و بابەتی ڕۆژنامەوانی لەخۆیدەگرێت لەسەر شاشەکانی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت.

دکتۆر محمد جاسم لە پێناسەکانی سەرەوە دوورتر دەڕوات و سەربەخۆییەکی زیاتر دەداتە ئەو ڕۆژنامانە بەوەی ئەو ڕۆژنامانەن کە تەنها چاپی ئەلیکترۆنین و لەلایەن دامەزراوەیەکی ڕۆژنامەوانیەوە دەردەچن، بۆ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە ڕۆڵ و ئەرکی ڕۆژنامەوانی ببینێت و ئەم خالانەی خوارەوە لە خۆدەگرێت:

١. بوونی هەیکەلێکی کارگێری ڕێکوپێك.

٢. بوونی ڕۆژنامەوانی پیشەگەر.

٣. بایەخ دەدات بە پێشکەشکردنی بابەتی ڕۆژنامەوانی لە قاڵبێکی ڕۆژنامەوانی.

ئەو پێناسەیە بەهەوڵێکی جیدی دادەنرێت و توانیویەتی ڕوونتر سنورەکانی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی دیاری بکات و جیای بکاتەوە لەهەر جۆرێکی دیکەی ڕۆژنامەوانی کلاسیکی.

بەلام لە تێکرای ئەو پێناسانەدا رەگەزێکی گرنگ و جیاکەرەوەی ڕۆژنامە ئەلکترۆنیەکان فەرامۆشکراوە و ئاماژەی پێنەکراوە ئەویش کارلێکردنە (التفاعل Interactive) ئەو خاڵەی کە لە پێناسەی (منار فتحی) بە ڕوونی باسی لێوەکردوە کاتێك لە پێناسەی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان دەڵێت "هەموو بڵاوکراوەیەکی ئەلیکترۆنی ئۆنلاینە کە لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە پەخش دەکرێت، بە هۆی یەکێك لە زمانەکانی هێماسازی دیزاین کراوە، تاوەکو خوێنەر بە بەکارهێنانی بەرنامەکانی گەڕان بیانخوێنێتەوەو لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر کارلێکیان لەگەڵ بکات، ئەم بڵاوکراوانە گرنگی دەدەن بە بەکارهێنانی تەواوی هونەرەکانی ڕۆژنامەوانی و قاڵبە کلاسیك و تازەکانی نووسینی ڕۆژنامەوانی".

لە میانەی ئەم پیناسانەی سەرەوە دەکرێ جەخت لەسەر چەند خاڵێکی سەرەکی بکەینەوە کە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی جیادەکاتەوە لەوانەش:

١. کۆمەڵێك بابەتی ڕۆژنامەوانی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتیی وهونەری و وەرزشی و هتد لەخۆیدەگرێت و لە توانایدایە حەز و خولیا هەمە چەشنەکانی خوێنەرانی لە ئاست و تەمەنە جیاوازەکان تێربکات.

٢. قاڵبە ڕۆژنامەوانیە جۆربە جۆرەکانی وەك هەواڵ، راپۆرت، ریپۆرتاژ، وتار لەخۆیدەگرێت.

٣. لە ڕووی دەرچوونەوە پابەندە بە کاتێکی دیاریکراو.

٤. بە بەردەوامی بابەت و ناوەڕۆکەکەی لە ڕۆژێك بۆ ڕۆژێکی دیکە یان لە کاتێك بۆ کاتێکی دیکە نویێ دەکرێتەوە.

٥. کارلێکردن (Interactive) بوار دەرەخسێنێت لە بەردەم خوێنەران دا ڕاستەوخۆ لێدوان و بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە بابەتە جۆربەجۆرەکان بنێرن و داوا و پیشنیارەکانیان لەوبارەوە بگەیەنن بە ستافی ڕۆژنامەکە.

٦. لەپاڵ نووسین و دەقە نووسراوەکان، وێنەو هێڵکاری و نەخشە و وێنەی جولاویش لەخۆیدەگرێت.

٧. دانانی لینکی زانیاری و بابەتی پەیوەندیدار لەناو جەستەی بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان.

بەلام لە ئێستادا ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بە تایبەتمەندییەکی دیکە دەناسرێن ئەویش قووڵی ئەو زانیارییە زۆر و فرەوانەیە دەیخەنەڕوو لە ڕێگەی دەستەبەرکردنی زۆرترین لینکی زانیاری پەیوەندیدار بەو بابەتانە.

لێرەشەوە دەکرێ پێناسەیەکی گشتگیر بۆ ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی بکەین و بڵێین: هەموو بلاوکراوەیەکە لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە بلاودەکرێتەوەو لە ڕووی کاتی دەرچوون و بلاوکردنەوەی بابەت و قاڵبە ڕۆژنامەوانییەکان لە ڕۆژنامەی کاغەزی دەچێت، بەلام جیاوازە لە دیزاین کردن و زمانی سیمبول سازی (HTML) بەکاردەهێنرێت تا خوێنەر بە ئاسانی سەیری بکات و بیخوێنێتەوە و لەگەڵی کارلێك بکات " لەوەدا جیاوازە کە ڕۆژنامەکە لەپاڵ وێنەو هێڵکاری و نەخشەو وێنەی جولاو

چەندین لینکی زانیاری تایبەت بە کەس و بابەتەکان لە دووتوێی بابەتەکاندا دەخاتەبەردەستی خوێنەر.

## مێژووی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی

لە ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو کۆمەڵێك تویژینەوەی زانستی و مەیدانی ئەنجامدران بە مەبەستی زەمینە خۆشکردن لە بەردەم بلاوکراوەکان (Publisher) و ڕۆژنامەوانان، بۆ سوودوەرگرتن لەو پێشکەوتنە گەورەیەی لە بواری ئینتەرنێت و تۆڕی زانیاری هاتۆتەئارا، ئەوەبوو لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو بەرهەمی ئەو تویێژینەوانە دەرکەوتن و توانرا ڕۆژنامە ڕۆژانەکانی وەك واشینتۆن پۆست و لۆس ئەنجلۆس تایمز لە ڕێگەی خزمەتگوزاری (Online)ەوە بخرێنە بەردەست خوێنەرەکانی.

بەگوێرەی هەندێ سەرچاوەی تر، مێژووی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی لەوە کۆنترە، بۆ زیاتر لە پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە، ئەوکاتەی ڕۆژنامەکان لە ڕێگەی شەپۆلەکانی ڕادیۆوە ڕەوانە دەکران بۆ دەیان هەزار ماڵ لە ڕێگەی ئامێری فاکسەوە، هەر کۆپیەکیش خەرجیەکەی پەنجا تا سەد دۆلاری ئەمریکی بوو، هەروەك هەوڵدرا بۆ ناردنی ڕۆژنامە لە ڕێگەی ڤیدیۆ تێکست Video text لە سەرەتای سالانی هەشتای سەدەی بیست ئەویش بە بەکارهێنانی هێڵەکانی تەلەفۆن **پێشوازی** لە ناوەڕۆکی ئەو ڕۆژنامە کاغەزیانە **بکرێ** و بەشداربووان بتوانن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن یان کۆمپیوتەر لە بەرامبەر ئابوونەیەکی مانگانەدا بیانخوێننەوە، بەلام بە هۆی نارۆشنی وێنەکان وسستی خستنەڕووی بابەتەکان وایکرد خوێندنەوەی ئەو ڕۆژنامانە کارێکی زەحمەت بێت. لەو ماوەیەشدا بوو کۆمپانیایەکی کۆمپیو سیرڤ ( compu serve) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەولێدا بە شێوەیەکی ئەزموونی چاپی ئەلیکترۆنی بۆ ڕۆژنامە نەتەوەییەکان بخاتە بەردەست، بەلام ئەم هەوڵە بە هۆی تێچووە بەرزەکەی و نەبوونی بەشداربووی پێویست سەرکەوتوو نەبوو.

گەشە و بلاوبوونەوەی ئینتەرنێت لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوو دەرگای بە ڕووی سەرهەڵدانی ڕاستەقینەی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی و چاپی ئەلیکترۆنی ڕۆژنامە کاغەزیەکان لەسەر تۆڕی زانیاری جیهانیی والاکرد.

بەگوێرەی توێژینەوەیەکی توێژەری ئەمریکی (ماك دیویز) لەبارەی مێژووی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنیدا، یەکەم ڕۆژنامە لە ئەمەریکا چاپی ئەلیکترۆنی لە ئینتەرنێت بڵاوبکاتەوە ڕۆژنامەی (شیکاغۆ تریبیون) بوو ساڵی(١٩٩٢) لەپاڵ کۆپیە ئەلیکترۆنییەکەی (**شیکاغۆ ئۆنلاین**)، لەوکاتەوە ماڵپەڕی هەواڵی و ڕۆژنامەوانییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت زیادیکرد زۆرێك لەوانە لەلایەن ڕۆژنامە کاغەزی و کەناڵەکانی تەلەفزیۆن و ماڵپەڕە هەواڵیە سەربەخۆکان دەردەچوون، بە بۆچوونی شارەزایان ئەو ماڵپەڕە هەواڵیانە دەکرێ بە کەناڵێکی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی سەربەخۆ لە قەڵەم بدرێن.

لەبارەی دیاریکردنی یەکەمین ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی توێژەران لە نێوان خۆیاندا هاوڕانین، بۆ نمونە بە پێچەوانەی بۆچوونەکانی (دیویز)، (دکتۆر **محمد** علم الدین) وای دەبینی ڕۆژنامەی **"هبلزبنورگ داگبلاد"**ی سویدی یەکەمین ڕۆژنامەیە کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوکراوەتەوە.

ئیدی لێرەوە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی زەنگی سەردەمێکی دیکەی پەیوەندیکردن و ڕاگەیاندنی لێدا، گرنگترین سیماکانی لەوەدا دەرکەوت بەربەست و سنورە جوگرافی و سیاسییەکان لە بەردەم بڵاوبوونەوەی شەپۆلی زانیارییەکان و تارماییەکانی سانسۆری دەوڵەت و حکومەتەکان هەرەسیان هێنا، ئەگەر نەشڵێین نەما ئەوا بە شێوەیەکی بەرچاو کاڵبۆتەوە و ناوەندەکانی بڕیاربەدەستی ناچارکردوە بەجۆرێکی دی بیربکەنەوە و ڕەفتار بکەن لە هەمبەر ئەم میوانە تازە و نەخوازراوە کە هەموو دەرگاکانی لە بەردەم هزر و بیرکردنەوە و گوزارشتکردن لە بیروبۆچوونە جیاوازەکان والاکرد.

سەرهەڵدانی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی و گەشەکردنی لە ماوەیەکی کەمدا وایکرد ببێتە ڕکابەریکی ڕاستەقینەی ڕۆژنامەوانی کاغەز بە تایبەتی لەو کاتەی گۆڤاری نیوزویك (News week)ی ئەمریکی کە لە سەرانسەری جیهاندا خاوەن تیراژو خوینەرێکی زۆرە، لە ڕێگەی ماڵپەڕەکەی بەدواداچوونی ڕۆژنامەوانی بەردەوامی بڵاودەکردەوە لەبارەی ئابڕووچوونەکەی (بیل کلینتۆنی) سەرۆکی پێشووی ئەمەریکا لەگەڵ (مۆنیکا لوینسکی) بەر لە دەرچوونی چاپی کاغەزی گۆڤارەکە کە هەفتانە بوو.

له ساڵی (١٩٩٣)نزیکەی بیست ڕۆژنامەو ژمارەیەکی کەمی گۆڤارەکان چاپی ئەلیکترۆنییان هەبوو، بە تێپەڕبوونی کات لە ناوەڕاستی نەوەدەکان زۆرینەی ڕۆژنامەکان بوون بە خاوەنی ماڵپەڕ لەسەر تۆڕی زانیاری.

له سەرەتای ساڵی (١٩٩٦) نزیکەی(١٥٤) ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی هەبوو. لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی(١٩٩٦)ئەم ژمارەیە گەیشتە(١٥٦٢) ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی و لە ناوەڕاستی ساڵی (١٩٩٧) گەیشتە(٣٦٢٢) ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی و لە کۆتایی ساڵی(١٩٩٧) ژمارەی ڕۆژنامەکان لەسەر ئینتەرنێت گەیشتنە (٤٠٠٠) و لە ساڵی(٢٠٠٢) ژمارەکە بەرزبووەوە بۆ نزیکەی(٥٠٠٠) ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی.

## تایبەتمەندییەکانی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی

ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بەچەند سیماو تایبەتمەندییەك لە هاوشێوە کاغەزیەکەی جیادەکرێتەوە لەوانە:

١. کارلێکردن: ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بەوە جیادەکرێنەوە بوار دەڕەخسێنن لە بەردەم خوێنەرەکانیان ڕاوبۆچوونی خۆیان سەبارەت بە بابەتە بڵاوکراوەکان بۆ ڕۆژنامەکە بنوسن لە ڕێگەی ئەو لینکانەی تەرخان دەکرێن بۆ دەربڕینی لێدوان وسەرنج لەلایەن خوێنەرەوە، بەمەش پرۆسەی پەیوەندیکردن لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی وەك ڕۆژنامەی کاغەزی یەکلایەنە نیە تەنها لە نێرەرەوە بۆ وەرگر، بەڵکو لەمجۆرە ڕۆژنامانە وەرگر بۆی هەیە ڕۆڵی نێرەر ببینێت و نێرەر دەبێتە وەرگر، ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت پرۆسەی پەیوەندیکردن لە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی پرۆسەیەکی دوولایەنەیە لە نێرەرەوە بۆ وەرگر و لەویشەوە بۆ نێرەر کارلێکردن لەم ڕۆژنامانە دوو شیواز وەردەگرێت:

أ. پەیوەندییە کارلێکە ڕاستەوخۆکان: وەك بەشداری خوێنەران لە ژوورەکانی چات کردن (Chatting) و بڵاوکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەم چات کردنانە لەلایەن هەندێ لە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان، هەروەها خزمەتی (Messenger) ڕێگە خۆشدەکات لە بەردەم پەیوەندیکردنی ڕاستەوخۆ لەلایەن بەرپرسانی ڕۆژنامەو **نووسەر**و پەیامنێرەکان.

ب. پەیوەندییە کارلێکژە ناڕاستەوخۆکان: وەك پۆستی ئەلیکترۆنی و ڕاپرسی و سەکۆی دیالۆگ و لینکی لێدوان و سەرنج و پێشنیاری تایبەت بە خوێنەران، لە هەموو

ئەمانەش خوێنەر دەسەڵات و پێگەیەکی زیاتر وەردەگرێت لەوەی کە لە ڕۆژنامەوانی کاغەزی بەدیدەکرێت.

٢. قوڵایی مەعریفی: ئەو خزمەتگوزاریانەی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان پێشکەشی دەکەن بە قوڵی و گشتگیری دەناسرێنەوە، ئەم تایبەتمەندییە لەو پانتاییە فرەوان و دیاریکراوە بەرجەستەدەبێت لە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکاندا هەیە، بۆیە بواری لە بەردەمدایە خزمەتگوزاری زیادە پێشکەش بکات سەبارەت بە باکگراوندی ڕووداوەکان و گرێدانەوەی بە ڕووداوە پەیوەندیدار و هاوشێوەکان لە ڕێگەی:

أ. خستنەڕووی بابەتە پەیوەندیدارەکان بەو بابەتەی خوێنەر دەیخوێنێتەوە.

ب. رەخساندنی دەرفەتی گەرانەوە بۆ ئەرشیفی ڕۆژنامە.

ج. گەیشتن بە سەنتەری زانیاری تایبەت بە ڕۆژنامەکە بۆ وەرگرتنی زانیاری زیاتر.

د. فەراهەمکردنی هەندێ چاپی دیکە کە ڕۆژنامەکە دەریدەکات بۆ نموونە چاپی نێودەوڵەتی.

٣. نوێکردنەوەی بەردەوام: مەبەست لێی خزمەتگوزاری هەواڵی دەستبەجێ و ڕاستەوخۆیە Online بۆ ئەوەی خوێنەری ئەو ڕۆژنامەیە سات بە سات ئاگاداری گۆڕان و پێشهاتەکان بێت لە بوارە جیاجیاکاندا، ئەم تایبەتمەندییەی ڕۆژنامە ئەلکترۆنیەکان لە نوێکردنەوەی بەردەوامی خزمەتگوزارییە هەواڵیەکان لە تایبەتمەندیی ئینتەرنێت سەرچاوەی گرتوە کە ڕاستەوخۆیی و دەستبەجێی بوون لە سیما سەرەکی و گرنگەکانیەتی.

٤. فرەوانی دەسەڵاتی خوێنەر: فرەیی و فرەوانی بوارەکانی بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی دەرفەتی ڕاستەقینەی لە بەردەم کەس و گروپە مرۆییەکان رەخساندووە هەر چەندە ژمارەیان کەم بێت و خولیا و ئارەزووەکانیان سنورداربێت ئەوەی پێویستیانە لەو خزمەتگوزاریانە دەستیان بکەوێ کە هەندێ لەو ڕۆژنامانە دەیخەنە بەردەستی خوێنەرانیان، بەگوێرەی ئەو شتانەی داوای دەکەن، ئەو ڕۆژنامانە پێیاندەگوترێ ڕۆژنامەی داواکراو (Newspaper on Demand)، هەروەك پێیاندەگوترێ ڕۆژنامە گریمانەییەکان (Virtual Newspaper) بەو ڕۆژنامانە دەگوترێ ئەو بابەتانەی بڵاویدەکەنەوە لەسەر بنەمای پێویستی خوێنەرانی دیاری دەکرێ.

٥. ئاسانی دەستخستنی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان: ئاسانی گەیشتن بەو ڕۆژنامانە یەکێکە لە گرنگترین ئەو خەسڵەتانەی پێی جیادەکرێنەوە و یەکێکیشە لەو هۆکارانەی کەوا لە خوێنەر دەکات هۆکارێکی ڕاگەیاندنی پێ باشتر بێت لە یەکێکی دیکە، لەبەرئەوە بەکارهێنانی وەرگر زیاتر دەبێت بۆ ئەو هۆکارانەی ڕاگەیاندن کۆشش و تێچوونی کەمتری پێویستە، زۆربەی ئەو خزمەتگوزاریانەش ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی دەیخاتە بەردەست خوێنەرەکانی مەبەست لێی ئاسانی گەیشتن و بەکارهێنان و سوود لێوەرگرتنیەتی.

٦. ناوەڕۆکی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان: بە درێژایی ٢٤ کاتژمێر لەبەردەستی خوێنەرانیدایە، لە کاتێکدا ڕۆژنامەی کاغەزی دەبێت ڕۆژێکی تەواو خوێنەر چاوەڕێ بکات بۆ دەستخستنی ژمارەیەکی نویی ڕۆژنامەکە.

٧. یەکێکی دیکە لە خەسڵەتەکانی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان ئەوەیە لە ساتەوەختی نووسین و دارشتنیدا دەردەچێت (Real Time)، بە پێچەوانەی ڕۆژنامەی کاغەزی پرۆسەی دەرچوون و گەیشتنی بە خوێنەر کاتێکی زۆری دەوێ لە ڕێگەی کەناڵەکانی دابەشکردن و گەیاندنی ڕۆژنامە.

٨. نەبوونی گرفتی پانتایی: تاوەکو ناچار نەبێت بابەتەکان کورت بکاتەوە و بە ناچاری زانیارییەکان بە پچڕ پچڕی پێشکەش بکات بە پێچەوانەی ڕۆژنامەی کاغەزی ئەو گرفتەی زۆرە.

٩. دانانی کلیل و کۆدی تایبەت: ئەو بابەتە ڕۆژنامەوانیانەی ئامادەدەکرێن بۆ بڵاوکردنەوە، پێویست بەوە دەکات بۆ دوای بڵاوکردنەوەش ئامادە **بکرێن** بەوەی ئەو بابەتانە پۆلێنێکی گونجاو **بکرێن** بگونجی لەگەڵ سروشتی بڵاوکردنەوە لە ئینتەرنێت.

جگە لە پۆلێنکردن، بوەتە کارێکی پێویست کە بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان کلیل و کۆدیکی تایبەتیان بۆ دابنرێ (Tag) ئەویش لە ڕێگەی پێدانی چەند وشەیەکی کلیلی بەو بابەتانەی هەواڵەکە یان بابەتە ڕۆژنامەوانیەکە باسی لێوەدەکات، بۆ ئەوەی لە کاتی گەران(Search) دا خوێنەر بە ئاسانی دەستیبکەوێ، باشتر وایە لە کاتی دانانی کلیل و کۆدەکان ئەو وشانە دابنێین کە پێشبینی دەکرێ زۆربەی خوێنەران بەکاریدەهێنن لە هەوڵیاندا بۆ دۆزینەوەی بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان سەبارەت بە پرسێکی دیاریکراو.

١٠. بەشداریکردن: ئەمە قۆناغێکی پێشکەوتوترە لە کارلێکردن و نوێترین شێوازەکانی ڕێکخستنی پەیوەندییە لە نێوان ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان و خوینەرەکانی، هەندێ لە ماڵپەڕە ڕۆژنامەوانییەکان پانتاییەکی تەرخانکردوە بۆ خوێنەرانیان تاوەکو ڕاپۆرت و گرتەی ڤیدیۆیی و وێنەی فۆتۆگرافی بنێرن و ببێتە بەشێك لە ناوەڕۆکی ڕۆژنامەکە، ئەگەر ئەو مەرجانەی تێیدا بێت ڕۆژنامەکە بۆ ئەو مەبەستە دایناوە.

تەنانەت هەندێ لە ماڵپەڕەکان پێیاندەگوترێ ماڵپەڕی ناوەڕۆکە کراوەکان چونکە پشت بەو خوێنەرانە دەبەستن سەردانی ئەو ماڵپەڕە دەکەن و بابەتەکان دەنووسن و دەوڵەمەندی دەکەن و تازەی دەکەنەوە.

(د. هند بداری) ئاماژە بەچەند خاڵێکی دیکە دەکات لە تایبەتمەندییەکانی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی لەوانە:

١. بڵاوکردنەوە لەسەر ئاستی جیهانی Global Reach.

٢. ناجەماوەری بوون و پەرشوبڵاوی جەماوەری ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی Demystification

٢. بواری گۆڕانکاری زۆرە Changeability

## جۆرەکانی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی

بەگوێرەی ئەو ئامراز و هۆکاری پەیوەندیکردنەی پشتی پێدەبەستێت ڕۆژنامە دەکرێ بەم چەند جۆرەی خوارەوە:

١. ڕۆژنامە کاغەزیە چاپکراوەکان.

٢. ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییە چاپ نەکراوەکان لە بنەرەتدا پشت بە کۆمپیوتەرو هۆکارە ئەلیکترۆنییەکان دەبەستێت لە پرۆسەی ناردن و وەرگرتندا، ئەمجۆرە چەند شێوەیەك وەردەگرێت:

* ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی ڕاستەوخۆ و دەستبەجێ Online Journalism : خوێنەر دەتوانێ لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت لە ڕێگەی هاوبەشیکردن بە خۆڕایی دەستیبکەوێ، ئەو ڕۆژنامانە بەچەند خەسڵەتێك دەناسرێنەوە لەوانە کارلێکردن و نوێکردنەوەی بەردەوامی ناوەڕۆکەکەیی و بەکارهێنانی زمانی هایپەرتێکست.

* ڕۆژنامەوانی ناڕاستەوخۆ Offline Journalism: ئەو ڕۆژنامانەن ژمارەکانیان بە شێوەیەکی ئەلیکترۆنی لەسەر CD و DVD.

* هەندێ شێوازی دیکە، بەمدواییە کاری لەسەرکراوە، ئەویش ئەو ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییانەن کە لەلایەن ژمارەیەك ڕۆژنامەی کاغەزی ئامادەدەکرێن بەگوێرەی داواکاری و پێویستیەکانی کەسی وەرگر و لە ڕێگەی ئامێری فاکسمێل وەردەگیرێن، ئەمجۆرە لە ڕۆژنامە پێیدەگوترێ (ڕۆژنامەی فاکسمێل).

پێویستە ئەوە بڵێین ڕۆژنامەی ئۆنلاین وەرگر لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە وەریدەگرێ لە هەموو جۆرەکانی دیکە زیاتر لە چەمکی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی نزیکە کە ئەم بەشەی کتێبەکە لەسەری دەدوێ.

دەکرێ ڕۆژنامەی ڕاستەوخۆ و ئۆنلاینیش دابەش **بکرێ** بۆ چەند جۆرێك:

یەکەم: جۆرەکانی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لە ڕوانگەی بوون و نەبوونی چاپە کاغەزیەکەی:

١. ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی تەواو Online Newspaper، ئەویش لەسەر دوو شێوەیە:

أ. ئەو ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییانەی پەیوەندی نییە بە هیچ ڕۆژنامەیەکی چاپی کاغەزی و تەنها لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت هەیە.

ب. ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان کە چاپی کاغەزیان هەیە، بەڵام لە ناوەڕۆك دا جیاوازن و تەنها لە ناودا هاوبەشن و سەر بەیەك دەزگای ڕۆژنامەوانین، و لەمجۆرە نموونەی زۆر هەن لە ڕۆژنامە ئەمریکی و ئەوروپیەکان، ئەم جیاوازیە لە ناوەڕۆك دا دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی تایبەتمەندییەکانی جەماوەری هەریەك لەو دوو ڕۆژنامەیە و هەروەها جیاوازی خودی هۆکار و ئامرازەکە.

٢. چاپی ئەلیکترۆنی ڕۆژنامە کاغەزییەکان، لە بنەرەتدا ماڵپەڕی ڕۆژنامە کاغەزیەکانە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، ئەمجۆرە بە دوو شێوە بە دەردەکەوێ:

* ئەو ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییانەی ناوەڕۆکی چاپە کاغەزیەکە وەکو خۆی پێشکەش دەکەن دوای گۆڕینی بۆ شێوەی ئەلیکترۆنی.

* ئەو ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییانەی بەشێك لە ناوەڕۆکی ڕۆژنامە کاغەزیەکە پێشکەش دەکەن.

**دووەم:** جۆرەکانی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی لە ڕوانگەی جۆری ئەو تەکنیکەی بەکاریهێناوە لە ماڵپەڕەکەی:

بە جۆرەکانی گواستنەوەو **خستنەڕووی** دەق دەناسرێتەوە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت و ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان دابەش دەبن بۆ چوار جۆر:

١. ئەو ڕۆژنامانەی تەکنیکی گرافیکە ئاڵوگۆڕکراوەکان ( Graphic Interchange Format) بەکار دێنن بواردەدات بە گواستنەوەی کۆپی و وێنەیەکی وەکو خۆی بابەتە ڕۆژنامە کاغەزیەکان و بڵاوکردنەوەی لەسەر ماڵپەڕی ڕۆژنامەکە لە ئینتەرنێت، ئەمە تەکنیکی باش نیە لەبەرئەوەی دەرفەتی کارلێکردن لە بەردەم خوێنەر ناهێڵێتەوە.

٢. ئەو ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییانەی تەکنیکی دەقی بارکراو ( Portable Datagram Format) (PDF) ئەوەی ناسراوە بە پی دی ئێف بەکاردەهێنێت، ئەمجۆرەیان نزیکە لەوەی پێشوو، بواردەدات بە گواستنەوی دەق و شێوە و وێنەو هێلکاری و لاپەڕەکان بە تەواوەتی لە ڕۆژنامە کاغەزیەکەوە بۆ ماڵپەڕی ڕۆژنامەکە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، ئەوەی لە ماڵپەڕەکە بڵاودەکرێتەوە تەواو هاوشێوەی چاپە کاغەزیەکەیە.

٣. ئەو ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییانەی تەکنیکی دەقی پێشکەوتوو ( Hypertext Markup Format) (HTML) بەکار دێنن، ئەمجۆرە بواردەدات بە دانانی دەقەکانی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بە شێوەیەکی جیا و سەربەخۆ لە دەق و بابەتەکانی ڕۆژنامەی کاغەز، لەمجۆرە دا سوودی زۆر وەردەگیرێت لە تایبەتمەندییە سەرسورهێنەر و بێ شومارەکانی ئینتەرنێت کە گرنگترینیان بریتییە لە کۆکردنەوەی بە یەکەوەی دەق، وێنە، دەنگ، گرتەی ڤیدیۆ، فەراهەمکردنی خزمەتگوزاریی بەدواداگەران، ئەرشیف ودەرفەتی کۆپی کردنی دەقەکان.

٤. ئەو ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییانەی هەردوو جۆری دەقی پێشکەوتوو (HTML) و دەقی بارکراو (PDF) بەیەکەوە کۆدەکەنەوە بۆ سوودوەرگرتن لە باشیەکانی هەردوو سیستەمەکە، لە دەقی پێشکەوتوو دەرفەتی کارلێکردن و پێشکەشکردنی بابەتەکە لە ڕێگەی هۆکارە جۆربەجۆرەکان دەرەخسێنی، دەقی بارکراویش وێنەیەکی دەقاودەقی ڕۆژنامە کاغەزیەکە دەگوازێتەوە، ئەمە لەبەرئەوەی هەندێ لە خوێنەران بەلایانەوە

خۆشترە ڕۆژنامەکە بەوشێوەیە ببینن کە لێی ڕاهاتوون، زۆرێك لە ڕۆژنامەکانی کوردستان لەمجۆرەن وەك ڕۆژنامەی خەبات و کوردستانی نوێ و ئاوێنە.

## جیاوازیەکانی نێوان ڕۆژنامەی کاغەزی و ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی

دەکرێ ئەو جیاوازیانەی لە نێوان ڕۆژنامەی کاغەزی و ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بەدیدەکرێ لەم چەند لایەنە دیاریان بکەین.

**١. لە ڕووی شێوەو دیزاینەوە:**

أ. ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بە شێوەی ستوونی یان ئاسۆیی دەخوێنرێنەوە بە مەبەستی پیشاندانی لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر، لە کاتێکدا ڕۆژنامەی کاغەزی لەسەرەوە بۆ خوارەوەیە و لەسەر لاپەڕەی گەورە، ئەمشێوەیەش لەسەر شاشە زەحمەت و نەگونجاو دەبێت هەر بۆیە دەبینین ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان خۆیان لێی بەدوورگرتوە لە ڕێگەی دانانی ئەو لیستانەی لەهەر دوو لای ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکانن و زیاتر وەك پێرستێك وایە بۆ فایل و بەشەکانی ڕۆژنامەکە و کورتکراوەی هەواڵەکانە لەسەر لاپەڕەی سەرەکی ماڵپەڕەکە.

ب. توانای ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لەسەر کاراکردنی ڕەگەزەکانی مەڵتیمیدیا (Multimedia) و دەوڵەمەندکردنی **چیرۆکەهەواڵ**یەکان بە چەندین دۆسییەو لینکی هۆکارو ئامرازە جۆربەجۆرەکان، ئەمە لە ڕۆژنامە کاغەزیەکان بەرچاو ناکەوێ، لەگەڵ ئەوەش تێگەیشتن و سوودوەرگرتن لە ڕێگاکانی بەکارهێنانی ڕەگەزەکانی مەڵتیمیدیا هێشتا سنوردارە و لە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لە ئاستی پێویستدا نیە.

بەکارهێنانی ڕەگەز و کەرەستەکانی مەڵتیمیدیا **وادەکات** بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان لە بابەتە پەخشکراوەکانی وەك ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بچێت، بەڕای هەندێ لە شارەزایانیش ئەمە لە تایبەتمەندیی و خەسڵەتە تایبەتەکانی ڕۆژنامە کاڵدەکاتەوە، هەروەك بواری ڕکابەری و کێبڕکێکردن دەسازێنێت لە نێوان دەزگا ڕۆژنامەوانییەکان و ئەو ماڵپەڕانەش خزمەتگوزاری دەنگی و ڤیدیۆیی لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە پێشکەش دەکەن وەك ویستگەکانی ڕادیۆ.

وێنە جوولاوەکان لە ڕووی بەکارهێنانیانەوە لە ڕۆژنامەی ئینتەرنێتی دەکرێن بە دوو بەشەوە:

- **وێنە جوولاوە گۆڕاوەکان:**

لە ژمارەیەك بۆ ژمارەیەکی تری ڕۆژنامەکە بەگوێرەی جۆر و سروشتی بابەتە بڵاوکراوەکان لە ماڵپەڕی ڕۆژنامەکە گۆڕانیان بەسەر دادێت، بە شێوەیەکی گشتی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بەکاریدەهێنن بۆ:

١. نمایشکردنی مانشێتی هەواڵ و بابەتەکان لە لاپەڕەکانی ناوەوە.

٢. نمایشکردنی کۆمەڵێك وێنە سەبارەت بە یەك ڕووداو وەك بەکارهێنانی بۆ نمایشکردنی وێنەی پاڵێوراوەکانی سەرۆکایەتی یان نمایشکردنی وێنەی یاریزانانی تۆپی پێ کە لە یاریەکدا گۆڵیان تۆمارکردوە.

٣. نمایشکردنی مانشێتە گرنگەکان لەیەکەم لاپەڕەدا خوێنەر دەتوانێ سەیری بکات لە ڕێگەی جولاندنی لاپەڕەکە بۆ خوارەوە.

٤. ڕاکێشانی سەرنجی خوێنەر لە ڕێگەی سوودوەرگرتن لە جووڵەی وێنە و مانشێتەکان.

٥. وێنە جولاوە نەگۆڕەکان: ئەو وێنە و هێمایانەن لە هەموو ژمارەیەکی ڕۆژنامەکە وەکو خۆیانن و گۆڕانیان بەسەردا نایەت، کەسایەتی ئەو ڕۆژنامەیە لەوانیتر جیادەکاتەوە، لە بەکارهێناندا ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان دەیانەوێ ئەم مەبەستانە بەدیبێنن:

١. دروستکردن و جیاکردنەوەی کەسایەتی ڕۆژنامەکە لەسەر ئینتەرنێت لە ڕێگەی ئەو وێنانەوە، لە ڕۆژنامە و ماڵپەڕەکانی دیکەی سەر ئینتەرنێت ناچێت.

٢. **سەرنجڕاکێشانی** خوێنەری ڕۆژنامەکە بەلای خۆیدا.

٣. یارمەتیدانی خوێنەر لە بیرهێنانەوە و ناسینەوەی ڕۆژنامەکە.

٤. دروستکردنی تێروانینێکی تایبەت بە ڕۆژنامەکە لە لای خوێنەر.

**٢. لە ڕووی چەندێتی ناوەڕۆکەوە (Content):**

ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لە چاو ڕۆژنامە کاغەزیەکان توانایەکی زیاتریان هەیە لە بڵاوکردنەوەی بریکی زۆری ناوەڕۆك و ژمارەیەکی دیارینەکراو لە بابەت بە هۆی پابەندبوون بە پانتایی و کاتی بڵاوکردنەوەوە، هەروەها خزمەتگوزاری ئەرشیفی چەندێتی ئەو ناوەڕۆکەی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان پێشکەشی دەکەن بە بەراورد لەگەڵ

ئەو برە ناوەڕۆکەی ڕۆژنامە کاغەزیەکان توانای بڵاوکردنەوەیان هەیە هێندەی دیکە زیاتر دەکات.

**٣. لە ڕووی خێرایی گەیشتنەوە (Accessibility):**

ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بەوە لە ڕۆژنامە کاغەزیەکان جیادەکرێنەوە خوێنەر زۆر بەئاسانی و لەهەر کات و شوێنێك بیەوێت دەتوانێ بیگاتێ، هەرچی ڕۆژنامەی کاغەزییە شوێنی دیاریکراوی بۆ کڕین و فرۆشتن هەیە، لە هەمان کاتدا ئەگەری ئەوە هەیە تیراژی ئەو ڕۆژەی لە بازاردا تەواو ببێ و خوێنەر دەستی نەکەوێ، بەڵام ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بۆ ئەوەی خوێنەر دەستی بیگاتێ پێویستی بە بوونی کۆمپیوتەر و تۆڕی ئینتەرنێت هەیە، ئەمە لەهەندێ کاتدا گرفتی تێدەکەوێ بە تایبەتی لە کاتی پچڕانی هێڵی ئینتەرنێت یان خاوی هێڵەکە، سستی دابەزاندنی ڕۆژنامەکە، تووشبوونی کۆمپیوتەرەکە بە ڤایرۆس پێوست بە فۆرماتکردنی کۆمپیوتەر دەکاتەوە، ئەمانە بەشێکن لە گرفتی خوێنەری ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی لەهەندێ کاتدا ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

**٤. ڕاستەوخۆیی و هەنووکەیی بوون لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت (Immediacy):**

١. ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان دەتوانن بە درێژایی ٢٤ کاتژمێر ڕووماڵی ڕاستەوخۆ و هەمەلایەنی ڕووداوەکان بکەن، ئەمە لە ڕۆژنامە کاغەزیەکاندا کارێکی ئەستەمە، لەبەرئەوەی پێویست بەدەرکردنی چاپێکی تازەی ڕۆژنامەکە دەکات و ناچاردەبێت چاوەڕێی ڕۆژی دواتر بکات بۆ دەرکردنی ژمارەی تازەی ڕۆژنامەکە.

لەوبارەوە کۆمەڵەی جیهانی ڕۆژنامەکانی وڵاتانی ئەوروپا تێبینی ئەوەیان کردوە سەرباری ئەوەی گۆڤارەکان تیراژیان لە ڕۆژنامە ڕۆژانەکان زیاترە، بەڵام لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت ڕۆژنامەکان توانیویانە زۆرترین خوێنەر بەلای خۆیاندا رابکێشن و زیاتر لەگەڵ ئەم ئامرازە نوێیەدا خۆیان بگونجێنن، ئەمە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە خێرایی تۆڕی ئینتەرنێت نزیکە لە کلتور و تایبەتمەندیی ڕۆژنامە لە بنەرەتدا پشتی بەستووە بە خێرایی گەیاندنی هەواڵ و ڕووداوەکان، لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بە خێرایی لە ڕووماڵکردن و بڵاوکردنەوەی هەواڵ لەسەر حیسابی ووردی و دروستی ئەو زانیارییانە بووە بڵاویکردۆتەوە، لەوبارەیەوە زۆرجار هەست بەوە دەکرێ سوودوەرگرتن لە تایبەتمەندیی خێرایی لە بەرامبەر چاوپۆشی کردن بووە لە بنەمای وردی و دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستی زانیاری، بە بەردەوام ئەو پرسیارە لە

ڕۆژنامەوانان دەکرێ و ڕۆژنامەوانانیش خۆیان لەیەکدی دەکەن ئایا بۆ ڕۆژنامەوان کامەیان لەپێشتر و پێویست ترە لە کاتی ڕووماڵکردنی ڕووداوە گەرمەکان خێرایی یان ووردی و دڵنیایی؟ وەك (Patricia and other) دەڵێت: لە سایەی ئەو کێبڕکێ توندەی لە نێوان ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان هەیە لەسەر پێشکەشکردنی سات بە ساتی زانیارییە تازەکان بوارێکی لە بەردەم ئەو ڕۆژنامانە نەهێشتوەتەوە بۆ دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستی زانیارییەکان، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە کرۆکی کاری ڕۆژنامەوانی بریتییە لە پابەندبوون بە ئاکاری ڕۆژنامەوانی و جەخت کردنەوە لەسەر دڵنیابوون لە ڕاستی و دروستی زانیارییەکان، ڕێگەنەدان بەوەی **بکرێ** بە قوربانی هەڵپەی ڕۆژنامەوان بۆ کێبڕکێکردن و بە دەستهێنانی پێشدەستی ڕۆژنامەوانی**(السبق الصحفي)**.

**٥. هایپەرلینك (Hyper Linking):**

ئەمە لە بەشەکانی پێشوو باسمان لێوەکرد، بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان لە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان بواری زیاتر دەرەخسێنن لە بەردەم خوێنەراندا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی قوڵتر و فرەوانتر بە باکگراوندی ڕووداو و کەسایەتیە سەرەکیەکانی ناو ڕووداوەکە ئاشنابێت لە ڕێگەی لینکی ئەو بابەتە زیادانەی لە ناو جەستەی هەواڵ و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان دەیخاتە بەردەستی خوێنەر یان لە ڕێگەی لینکی بابەت و ڕووداوە پەیوەندیدارەکان بەو بابەتەوە، ئەم خاڵەش لەگەڵ لایەنە ئەرێنیەکەی، لایەنێکی نەرێنیشی هەیە لەوەی خوێنەر وا لێدەکات لە پێناو کۆکردنەوەی زانیاری زۆر لە بابەتێکەوە بڕوات بۆ بابەتێکی دیکە لە بابەتی یەکەم دووری بخاتەوە و تەرکیزی کەمدەبێتەوە لە تێگەیشتن و بیرکەوتنەوەی ئەو زانیارییانە بە شێوەیەکی باش، هەروەك زۆر ڕووچوونی خوێنەر لە نێو بڕیکی زۆری زانیاری ڕەنگە وەڕسی بکات و تووشی بێزاری بێت، وای لێبکات دەست لە خوێندنەوەی تەواوی ڕۆژنامەکە هەڵبگرێت.

**٦. کارلێکردن:**

میکانیزمی **کارلێککردنی** خوێنەر و ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکانی بەمشێوەیە دەبێت:

١. پۆستی ئەلیکترۆنی تایبەت بە ڕۆژنامەکە.

٢. گروپەکانی چات و گفتوگۆ.

٣. خوێنەر دەتوانێ لە ڕێگەی پۆستی ئەلیکترۆنی تایبەت بە **نووسەر** و بەرپرسی فایلەکان پەیوەندییان **پێوەبکات**.

٤. راپرسییە ئەلیکترۆنییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت.
٥. ئەو بڵاوکراوە ئەلیکترۆنییانەی خوێنەران ڕا و سەرنجی خۆیان لەسەری دەردەبڕن.
٦. گۆڕینەوەی نامەی ئەلیکترۆنی لەگەڵ ئەو کەسانەی پەیوەندییان بەبابەتی ڕووداوەکەوە هەیە.
٧. دانانی لینکی ماڵپەڕی تر کە زانیاری زیاتری نووسیوە لەسەر ئەو بابەتە، ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکە بڵاویکردۆتەوە.
٨. بواری پێوە هاوبەشبوونی ئەلیکترۆنی (**الاشتراك**) لە بڵاوکراوە ئەلیکترۆنییەکان دا.
٩. بواری بەشداریکردن لە گروپەکانی چات.
١٠. تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.
١١. بلۆگ و تویتەر.

**٧. لە ڕووی تێچوون و توانای دەستکاری کردنی ناوەڕۆك:**

لە ڕووی خەرجی و تێچوونەوە ڕۆژنامە کاغەزیەکان پێویستیان بە کەرەستە و ئامرازی زیاتر و گرانتر هەیە، هەرچی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکانە پێویستیان بە چاپکردن نیە ئەمە تێچووی ڕۆژنامەکە **کەمدەکاتەوە**، بەڵام ڕەنگە ئەو خوێنەرەی پێویستی بە بابەتێك یان چەند بابەتێکی ئەو ڕۆژنامەیە هەبێت ناچاردەبێت چاپی بکات و بیخاتە سەر کاغەز، لەگەڵ ئەوەشدا خوێنەری ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی ئازادیی زیاتری هەیە لەوەی بواری ئەو زانیاری و هەواڵە **دیاریدەکات** پێویستی پێیەتی ئەمە یارمەتی دەدات لە **کەمکردنەوەی** تێچووی چاپکردنەکە.

## بنەماکانی نووسین لە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنیدا

هەندێ لە توێژەران **پێیانوایە** شێوازی نووسین لە ڕۆژنامەوانی ژمارەییدا وەکو ڕۆژنامەوانی کاغەزییە لە ڕووی دەستخستن و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و بابەتەکە، بەڵام بە هۆی ئەو تایبەتمەندییانەی ئینتەرنێت هەیەتی، بنەماکانی نووسین لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی زادەی ئەو تایبەتمەندییانەیە سروشتی ئامرازە نوێیەکە و خێرایی بوون و دوولایەنی بوونی پرۆسەی پەیوەندیکردن و نەبوونی پانتایی و چەندین خەسڵەتی دیکەیە و پێشتر باسمان لێوەیان کردوە، هەریەك لەو خەسڵەتانەش ڕەنگرێژ و ڕەنگدانەوەی دەبێت

لەوەی توێژەران بەو ئاڕاستەیە کاربکەن بنەما و قاڵبە هونەریەکانی نووسین لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی جیاواز ببینین لە ڕۆژنامەی کاغەزی، ئەگەرچی ئەم کارکردن و جیاکردنەوەیە لە قۆناغە سەرەتاییەکانی دایە و لە ڕووی تیۆری و پراکتیکیەوە بە تەواوەتی گەلاڵە نەبووە.

(جۆناسان دیوب) دەڵێت: "نووسین لە ئینتەرنێت ئاوێتەیەکە لە نووسینی ڕۆژنامەوانی نووسراو و ڕۆژنامەوانی بینراو و بیستراو و جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە شێوازی سادەیی و کورتبڕی بەلای کارمەندانی دەزگا ڕاگەیاندنە بینراو و بیستراوەکانەوە گونجاو و باشترە، **وادەکات** خوێنەر بە ئاسانی بە دوای ئەو شتانە بچێت لەسەر ئینتەرنێت بڵاودەکرێتەوە، سەرباری ئەوەی زۆرێك لە ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکان ڕێسا سەرەکیەکانی نووسینی باش **فەرامۆشدەکەن،** (سکۆت ئەتکیسۆن) بەرێوەبەری هەواڵی تەلەفزیۆنی ئامۆژگاری ئەوانە دەکات بۆ ئینتەرنێت دەنووسن بەوەی چۆن نامەیەکی ئەلیکترۆنی بۆ هاوڕێیەکیان دەنێرن، ئاواش بۆ ڕۆژنامەوانی ئینتەرنێتی بنووسن، بە وتەی ناوبراو "**ئەمە مانای ئەوە نیە لە نووسیندا هەڵەبکەیت و چاوپۆشی لەوەبکەیت بوونیادێکی باش و دیاریکراو بە چیرۆك و گێڕانەوەکەت بدەیت، یان لە سیاقی گشتی دەربچیت، بەڵام بەو مانایە لە نووسینی بابەتەکەت شێوازێکی دۆستانە بەکاربێنی بەو ئەندازەیەی دەتوانیٚ**".

بەوپێیەی ماڵپەڕەکانی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان و ماڵپەڕە هەواڵیەکان لینك و هەڵبژاردنی زۆر دەخاتەبەردەستی خوێنەرانی، بۆیە دەبێت **نووسەران** خۆیان ببوێرن لە پێشەکی **دوورودرێژ** کە ناهێڵیٚ خوێنەر بە خێرایی بزانیٚ بابەتەکە باس لە چی دەکات، مەرجی پێشەکی باش ئەوەیە خوێنەر ڕابکێشێت بۆ لای تەواوی بابەتەکە و بەردەوام بێت لەسەر خوێندنەوە، دوورنیە ئەو پێشەکیە درێژە خوێنەر وەڕس بکات و دواجار دەستی لیٚ بەر بدات و بچێتە سەر بابەتێکی دی.

بە شێوەیەکی گشتی ئەو بابەتەی بۆ ئینتەرنێت دەنووسریٚ کورتترە لەوەی بۆ ڕۆژنامەکان دەنووسریٚ، یەکێك لەو ڕێنماییانەش سەبارەت بە نووسین لە ئینتەرنێت ئەوەیە درێژی بابەتەکە لە ٨٠٠ وشە تێپەڕنەکات و هەموو بابەتەکە لەسەر یەك لاپەڕە بنووسریٚ، بەگوێرەی دوایین توێژینەوە لەوبارەوە دەرکەوتووە ئەوانەی سەردانی ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکان دەکەن ئارەزووی خوێندنەوەی لاپەڕەکە تا کۆتاییەکەی دەکەن و هیچ

پێویستیش بەوە ناکات ناچاریان بکەین بچن بۆ لاپەڕەکانی تر بۆ تەواوکردنی هەمان بابەت "، بۆ ئەوەی خوێنەر بەئاسانی لەدەقە نووسراوەکە تێبگات، (دیوب) ئامۆژگاری **نووسەر**انی ئینتەرنێت دەکات بەوەی دەقی بابەتەکە بۆ چەند بڕگەیەك دابەش بکەن و چەند ناونیشانێکی لاوەکی بەکاربێنن و بابەتەکە بۆ چەند خاڵ و تەوەرێکی دیاریکراو دابەشبکەن بە مەبەستی گەیاندنی بیرۆکە و بۆچوونەکان بە جیاکردنەوەیەکی زیاتر لەوەی لە ڕۆژنامەی کاغەزیدا بەرچاو دەکەوێت.

خاڵی جەوهەری جیاوازی نێوان پەیامی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی و ڕۆژنامەی کاغەزی لەوەدایە پەیام لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی بەرهەمێکی هاوبەشی نێوان ڕۆژنامەوان و بەکارهێنەرە، ئەمە لە کاتێکدا ناوەڕۆکی پەیام لە ڕۆژنامەوانی کاغەزی بەشی هەرە زۆری لەلایەن ڕۆژنامەوان ئامادەدەکرێ و دەنووسرێ، لێرەدا لەوانەیە بلۆگەکان (Blog) یەکێك بن لە ڕواڵەتەکانی ئەو بەرهەمە هاوبەشەی نێوان بەکارهێنەر و ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی لەشێوە و جۆری جیاجیا بەرچاو دەکەون، بەڵام دیارترینی ئەو جۆرانە ئەوەیە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنییەکە ڕێگە بە بڵاوبوونەوەی بلۆگی خوێنەرانی بدات.

باشترین پێناسەش بۆ (Blog)"**ڕۆژنامەی مۆدێرنە**" ئەمجۆرە لە ڕۆژنامەوانی بە هۆی تایبەتیبوونی، خاوەنی تومخەکانی ڕێکخراوەیی لە نووسیندا نیە، هەر بۆیە هەندێ کەس لایان وایە کە خاوەن پێودانگە (**ستانداردەکان**) ی ڕۆژنامەوانی نیە.

بەڵام ئەوانەی کە پێداگیری دەکەن لەسەر ڕۆژنامەوانیبوونی بلۆگ باوەریان وایە کە:

بلۆگ وەکو تابلۆیەکی پروپاگاندە یان باشتر وایە بڵێین وەکو بڵاوکراوەیەکی تایبەتی کەسێك لە ئینتەرنێت وایە، ئەو کەسە دەتوانێ ئازادانە هەر بابەتێکی تێیدا بنووسێت، سکاڵا بکات و وتار بنووسێت، ڕوانگەکانی خۆی رابگەیەنێت و کەسانی دیکەش دەتوانن ڕاوبۆچوونی خۆیان لە بلۆگ بنووسن.

لایەنگرانی بۆچوونی ڕۆژنامەوانیبوونی بلۆگ دەڵێن: زۆرێك لە ڕێکخراوە گەورە حکومیەکان و تایبەتیەکان ڕوویانکردوەتە بلۆگ نووسین، تەنانەت هەندێ لە ڕۆژنامە گەورەکانی دنیا وەك "**گاردیان**" و "**نیویۆرك تایمز**" خاوەنی (**بلۆگ**)ن.

جگە لە بلۆگ جاران بەرهەمهێنانی ڤیدیۆ تەنها لە توانای ڕۆژنامەوانان دا بوو هەرچی ئەمڕۆیە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی ڕێگە بە بەکارهێنەرانی دەدات فیلمە کەسییەکان بەرهەم بێنن و لە ماڵپەڕەکانی میدیا **بڵاویبکەنەوە**، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت

بەکارهێنەری تۆڕی ئینتەرنێت وای لێهاتووە بەشداری بکات لەبەرهەمهێنانی هەندێ جۆری ناوەڕۆك پێشتر قۆرخ بوو لەسەر ڕۆژنامەوان و لە تایبەتمەندییەکانی ڕۆژنامەوان بووە.

لەوەتەی سەرهەڵدانی ئینتەرنێت و بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی ژمارەیەکی زۆری توێژینەوەو لێکۆڵینەوە ئەنجامدراوە بە ئامانجی ئاشنابوون بە تایبەتمەندیی و خەسلەتەکانی کلتوری خویندنەوە و خوێنەرانی ئینتەرنێت، لە نێویشیاندا نەریت و هەڵسوکەوتی بەکارهێنەران لە کاتی سەردان و خوێندنەوەی ماڵپەڕە جیاجیاکان، ئەم توێژینەوانە کە بە (Usability Studies) ناسراوە بە چەند دەرەنجامێکی گرنگ گەیشتوون و یارمەتی ئەوانە دەدات کە لە بواری ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی کاردەکەن چۆن پلانێکی نموونەیی دابرێژن بۆ پێشکەشکردنی ناوەڕۆك بە باشترین شێوە بە خوێنەرانیان، لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە بێگومان شێواز و ڕێگەکانی نووسینە بۆ ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان.

دیارترین ئەو توێژینەوانەی کراون بۆ ناسینی خواست و تایبەتمەندیی خوێنەرانی ئینتەرنێت، توێژینەوەکانی (John Markes & Jacob Nielson) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو، لە ساڵی ١٩٩٤دەستیپێکردوە ساڵانە بە شێوەیەکی بەردەوام ئەنجام دەدرێ، ئەم توێژینەوانە بەچەند دەرەنجامێك گەیشتوون گرنگترینیان ئەمانەن:

- ڕێژەی سەردانی ماڵپەڕێکی دیاریکراو **زیادیکردوە** بەمشێوەیە(٢٧٪) بۆ(٤٧٪) بۆ(٥٨٪)، دوای ئەوەی ڕەچاوی کورتبڕی(Concise) و توانای سڕینەوە و سەیرکردن (Scan) و بابەتیبوون (Objective) کراوە لە کاتی نووسینی **چیرۆکەهەواڵ**یەکان لە ماڵپەڕەکە.

- خوێنەران حەز بە لاپەڕەی **دووردورێژ** ناکەن، وەڕس دەبن لە کرداری (Scrolling)، پێیان باشترە دەقەکە کورت و ڕاستەوخۆ بێت.

- بەکارهێنەران رقیان لە زمانی پەخشانە و ئەوە بە باشتر دەزانن ڕاستەوخۆ قسە لە بابەتەکە **بکرێ**.

- ئارەزووی ئەوە دەکەن میکانیزمی بەدواداگەران باش بێت بە مەبەستی گەیشتنی ئاسان بە بابەتە دیاریکراو و داواکراوەکان.

- **چاوەڕێکردنی** ئەنجامەکانی بەدواداگەران بێزاریان دەکات و بە لە کیسچوونی کاتی دەبینن.

## شێوازەکانی نووسینی ڕۆژنامەوانی لە ماڵپەڕەکانی ئینتەرنێت

شێوازی نووسین بۆ ماڵپەڕە ئینتەرنێتییەکان (Web Style of Writing) دابەش دەبێت بۆ دوو جۆری سەرەکی هەریەکەیان بە شێوەی جیاجیا بەکاردەهێنرێت:

**یەکەم/ شێوازی درێژدادر و ناڕۆشن:**

لەم شێوازەدا خوێنەر ناچاردەبێت بە دوای هەموو وشە و دەستەواژەیەکدا بڕوات تاوەکو بتوانێت لێی تێبگات، بۆ نموونە لە بابەتێك دا باسی هەنگاوەکانی دروستکردنی ماڵپەڕێك **بکرێت** لەسەر ئینتەرنێت.

**دووەم: شێوازی کورتبڕ و واقیعیانە:**

لەم شێوازەدا بابەتەکە بە شێوەیەکی سادەو ساکار دەخرێتە بەردەست و لە شێوەی چەند هەنگاو و قۆناغێکی ڕوون و ئاشکرا تێگەیشتن لێی ئاسان دەکات.

نووسەری دەقە ئینتەرنێتیەکان بۆ ئەوەی دەقێکی ڕۆژنامەوانی **سەرنجڕاکێش** و پڕ لە ناوەڕۆك بنووسێت باشتر وایە ڕەچاوی ئەم ڕێنماییانەی خوارەوە بکات:

١. بەکارهێنانی وشەو دەستەواژەکان بە پێی پێویستی بابەتەکەو بە جۆرێك خزمەت بە ئامانجێکی دیاریکراو بکات، نووسەر دەبێت لەوە دڵنیا بێت ئەو دەقەی دەینوسێت بایەخی بۆ خوێنەر هەیە.

٢. **پەیوەستبوون** بە ئامانجێك (Stick Of the Point): مەبەستی دەقەکە ڕۆشن بێت و لە ڕێگەی دەستەواژە و برگەی سادەوە خوێنەر لەو مەبەستانە تێبگات، ناونیشانەکان بە ووردی دابنرێن تا خوێنەر بەلای بابەتەکە رابکێشێت.

٣. خوێنەر هەست بە تایبەتمەندیی خۆی بکات (Cultivate a voice): خوێنەر هەمیشە ئارەزوو دەکات ڕێزبگیرێ لە کەسایەتی و بوونی، لە نێو دەقە ڕۆژنامەوانییەکان بەوەی لە ڕێگەی نووسینەکە ئەو بدووێنی و بانگەشەی خوێنەر بکەیت بۆ بەشداربوون لە گفتوگۆ و مشتومڕەکان سەبارەت بە پرسە گرنگەکان و بواری بۆ برەخسێنرێ لەوبارەوە بۆچوونەکانی خۆی **بخاتەڕوو**.

٤. گوتاری ڕۆژنامەی ئەلکترۆنی، گوتارێکی جیهانییە: ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت نمایش دەکرێن هەموو جیهان لە ڕێگەی ئەو تۆڕەوە پەیوەندی بەیەکەوە دەکەن، بۆیە زمانی نووسین و گوتارە ڕۆژنامەوانیەکە زمانێکی ئینسانی و جیهانی دەبێت و تاوەکو ئەوەی گوزارشتی لێدەکەی هەموو کەس لەهەر شوێنێکی دنیا لێی تێبگەن.

**قۆناغەکانی ئامادەکردنی بابەتی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان:**

ئامادەکردنی بابەتی ڕۆژنامەوانی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بەچەند قۆناغێکی سەرەکی تێپەڕدەبێت لەباری نووسینی ئەلیکترۆنیشدا هەندێ ڕەگەزی تازە دەردەکەون (مەلتیمیدیا) کە پەیوەندییان هەیە بە سروشت و تایبەتمەندیی نووسینی ئەلیکترۆنی، باس لەو رەگەزانە دەکەین لە کاتی خستنەڕووی هەریەك لەو قۆناغانە:

**١. پلاندانان:**

ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییە گەورەکان لەم قۆناغەدا پشت بە تیمێکی کارکردن دەبەستن پێکدێت لە نووسەر (Writer)، بەرپرسی لاپەڕە(Editor) و تیمێکی تەکنیکی (Staff) پسپۆری بواری مەلتیمیدیا (Multimedia Specialist) لە خۆدەگرێت. لەم قۆناغەدا پێویست دەکات وەڵامی چەند پرسیارێك بدەیتەوە بۆ ئەوەی بابەتە ڕۆژنامەوانیەکە بە باشترین شێوە ئامادەبکەین:

- ئایا پێویست دەکات باکگراوندی بابەتە ڕۆژنامەوانیەکە ببەستینەوە بە هەندێ ماڵپەڕ و سەرچاوەی زانیاری دەرەکی؟

- ئایا پیویست دەکات باکگراوندی بابەتەکەو قۆناغەکانی گەشەکردنی ڕووداوەکان بە شێوەی خشتەی زەمەنی یان شێوە گرافیکیەکانی دیکە **بخەینەڕوو**؟

- ئایا پێویست دەکات سوود وەرگرین لە بابەت و هۆکارە ڕۆژنامەوانییەکانی دیکە؟

- ئایا بابەتە ڕۆژنامەوانیەکە ئەو پرسیارانە لە خۆدەگرێ زەمینەی گفتوگۆ و کارلێکردن لەگەڵ خوێنەر دەرەخسێنێ؟

کام لە رەگەزە ڕوونکەرەوەکان دەکرێ **بەکاربهێنرێ** لە بابەتەکە (**نەخشە، وینە، ڤیدیۆ....هتد**)؟

### ٢. کۆکردنەوەی زانیاری (Gathering Information):

لەکاتی کۆکردنەوەی زانیاری پێویستە سێ ئاستی سەرەکی لە پێشکەشکردنی بابەتە ئەلیکترۆنییەکان **رەچاوبکرێ**:

- ئاستێکی ڕووکەش (**کورتبڕی و چڕ کردنەوە**).
- ئاستێکی قووڵ (**وردەکاری، باکگراوند، بۆچوونە جیاوازەکان**).
- ئاستی نوێکردنەوە(**کۆکردنەوەی زانیارییە هەنوکەییەکان بۆ بەدواداچوونی ڕووداوەکە سات بە سات**).

### ٣. ڕێکخستنی زانیاری (Organization Information):

بە هۆی فرەیی و هەمەجۆری رەگەزە **بەکارهاتووەکان** لە بابەتە ڕۆژنامەوانیە ئەلیکترۆنییەکان بایەخی پلان و ڕێکخستن زیاتر دەردەکەوێت لە ڕوومالّکردنە ئەلیکترۆنییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژنامە کاغەزیەکان لەم قۆناغەدا ئەو رەگەزانە دیاری دەکرێن لەناو بابەتە ڕۆژنامەوانیەکە بایەخێکی زۆریان هەیە سەبارەت بە خوێنەر بۆئەوەی بەگوێرەی پێویست زەق **بکرێن**ەوە و لە کاتی نمایشکردنی ئەو رەگەزانە سوود لە تایبەتمەندییە زۆرەکانی ئینتەرنێت وەربگیرێ لە پێناو کەمەندکێشکردنی خوێنەر بەلای بابەتەکە.

**قالّبەکانی نووسین لەڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی**

بە شێوەیەکی گشتی چوارقالّبی سەرەکی هەیە لە نووسینی بابەتەکانی ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی:

### ١. قالّبی هەرەمی هەڵگەڕاو (Inverted Pyramid)

بە گونجاوترین قالّبەکانی دارشتنی بابەتە ڕۆژنامەوانیە کاغەزی و ئەلیکترۆنییەکان دادەنرێت لەگەڵ بیرۆکەی دوو ئاڕاستەیی لە بوونیادی بابەتی ئەلیکترۆنی **یەکدەگرێتەوە**.

لەم قالّبەدا سەرەتا پێشەکیەکی کورت دەخرێتەڕوو، دواتر کۆمەڵێك ناونیشان یان تەوەری سەرەکی لە نێو جەستەی بابەتەکە دادەنرێت بە شێوەیەکی سەربەخۆ لەیەکتر، هەریەك لەم ناونیشان و تەوەرانە لایەن و ڕەهەندیکی بابەتەکە **ڕووندەکەنەوە**، بۆچوونی زۆرێك لە توێژەران جەخت لەوە دەکاتەوە قالّبی هەرەمی هەڵگەراو زۆر گونجاوە بۆ نووسینی هەواڵ و **چیرۆکەهەواڵ**یەکان.

(Jacob Nielson)یش باس له بایەخی ئەو قاڵبە دەكات بۆ خوێنەری ڕۆژنامە ئەلیكترۆنییەكان بەوپێیەی له گرنگترین زانیارییەوە دەستپێدەكات بەمەش خوێنەر كاتێكی زۆر بە فیڕۆنادات تاوەكو ئەو زانیارییانەی دەستكەوێت.

**٢. قاڵبی گێڕانەوەی ئاسایی (Serial Narrative Model):**

پشت دەبەستێت بە دابەشكردن بۆ چەند بڕگەیەكی كورت، لەم قاڵبەشدا ڕووداوەكان بەگوێرەی كاتی ڕوودانیان ریزبەنددەكرێن و دەگێڕدرێنەوە و هەر برگەیەكیش كۆتاییەكی **سەرنجڕاكێشی** بۆ دادەنرێت، ئەم قاڵبە زیاتر بۆ ئەو بابەتانە گونجاوە سروشتی چیرۆك و دراماییان هەیە.

**٣. قاڵبی دەقە هاوقەبارەكانی مۆنیتەر (Screen-Size Chunk Model):**

لەم قاڵبەدا بابەتەكە لە شێوەی چەند یەكەیەك **دەخرێتەڕوو**، هەریەكەیان بە ئەندازەی قەبارەی شاشەی مۆنیتەرەكە دەبێت، پەیوەندیی و لینك لە نێوان ئەو یەكانە هەیە، بەڵام بەكارهێنەر بە شێوەی هێڵەكی(**خطي**) لە یەكێكەوە بۆ یەكێكی دیكە دەڕوات بە شێوەی (Preview-next)، هەركام لەو یەكانە درێژكراوەی ئەوەی پێش خۆیەتی و زەمینە خۆشكەریشە بۆ ئەوەی دوای خۆی، بۆیە كۆتاییەكی دیاریكراوی نیە، ڕەنگە لینكی هەندێ بابەت و ماڵپەڕی دیكەش دانرابێت، ئەم قاڵبە لەگەڵ ئەو بابەتانە دەگونجێت باس لە چەند ڕووداوێك دەكەن و پەیوەندییەكی لۆژیكی لە نێوان ئەو ڕووداوانەدا هەیە.

**٤. قاڵبی دەقە درێژەكان Scrolling Stories**

ئەگەرچی زۆرێك لە خوێنەرانی ئینتەرنێت و بڵاوكراوە ئەلیكترۆنییەكان حەز بە بابەتی درێژ ناكەن، بەڵام ژمارەیەكی زۆر لە ڕۆژنامەو ماڵپەڕە ئەلیكترۆنییەكان پەنادەبەنە بەر ئەم قاڵبە.

لەم سێ قاڵبەی دواییدا تێبینی دەكەین زیاتر گرنگی بە بیرۆكەی هێڵەكی و ریزبەندكردنی ڕووداو و زانیارییەكان دەدات و تەنها لە شێوەی نمایشكردن جیاوازن، بەو مانایەی دەقی بابەتەكە دابەش**بكرێ** بۆ چەند برگەیەكی دیاریكراو یان بە ئەندازەی شاشەی مۆنیتەرەكە بێت یاخود لە شێوەی دەقێكی درێژ بنووسرێ، لەبەرئەوە ئەم قاڵبانە گوزارشت ناكەن لە ئاڕاستە تازەكانی نووسینی ڕۆژنامەوانی لەسەر تۆڕی

ئینتەرنێت، بەڵکو زۆربەی توێژەرانی بواری ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی و ڕۆژنامەوانانیش قاڵبی هەرەمی هەڵگەراو بە گونجاو دەبینن کە نەرمییەکی زیاتری تێدایە و لەگەڵ سروشتی خێرایی و ڕاستەوخۆبوونی تۆڕی ئینتەرنێت دەگونجێت.

(جوناسان دیوب) لە توێژینەوەکانی سەبارەت بە ئاڕاستە باوەکانی نووسین لە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان چەندین شێوە و قاڵبی نووسین **دەخاتەڕوو**، (دیوب) لەو خاڵەوە دەستپێدەکات نەبوونی بەربەست لەسەر ئەو پانتاییەی بابەتە ڕۆژنامەوانیەکەی لێ بڵاودەکرێتەوە، بە بۆچوونی ئەو تێچووی بابەتەکە ئەگەر ۵۰۰۰ وشە بێت یان ۵۰ وشە هەمان شتە، ئەمە ڕۆژنامەکە ئازاد دەکات لەوەی وردەکاری زیاتر لەسەر ئەو بابەتانە بخاتە بەردەستی خوێنەر، گرنگترین ئەو شێوانە بریتیین لە:

**١. پێشکەشکردنەوەی ناوەڕۆکی ڕۆژنامە کاغەزییەکە (Print Plus):**

ئەمشێوەیە لەلایەن زۆرینەی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بەکاردەهێنرێت، ئەویش بە دووبارە پێشکەشکردنەوەی ئەو بابەتانەی بە چاپکراوی **بڵاوکراونەتەوە ( بە تایبەتی بۆ بڵاوکردنەوەی ئەلیکترۆنی ئامادەنەکراون )** لەپاڵ ناوەڕۆکە کاغەزیەکەش هۆکارە جۆربەجۆرەکانی وەك وێنە و ڤیدیۆ و نەخشە و... هتد لەگەڵیدادەنرێ،، سەرباری لینکی بابەت و ماڵپەڕی پەیوەندیدار ئەگەر هەبێت.

**٢. شێوەی کارلێکی (Clickable Interactive)**

بە شێوەیەکی گشتی پشت دەبەستێت بە **تێکەڵکردنی** بوونیادی گێرانەوەی هێڵەکی (**خطي**) و ناهێڵەکی (**الغير خطي**) لەگەڵ **ڕێنماییکردنی** خوێنەر بۆ مامەڵەکردن و کارلێکردن لەگەڵ بابەتەکە، لەمشێوەیەدا وێنە جووڵاوەکان و بابەتە دەنگیەکان و گرتە ڤیدیۆییەکان و ڕەگەزە کاراکانی دی بەکاردەهێنرێن بۆ بەهێزکردنی ناوەڕۆکی **چیرۆکەهەواڵی** و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان.

ئەمشێوەیە ئەگەرچی بەرهەمهێنانی کاتێکی زۆری پێویستە، بەڵام بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت زیاتر ڕوو لەمجۆرە بابەت و شێوە ڕۆژنامەوانیە دەکەن، لەبەرئەوەی ئەو بابەتانە لە توانایاندایە پێویستی و داواکاری زۆرێك لە بەکارهێنەران تێر بکەن، هەروەك گوزارشت دەکات لە ڕووە کارلێکیەکەی تۆڕی ئینتەرنێت و ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان.

### ٣. پێشکەشکردنی وێنە (Slide-show)

یەکێکە لە شێوە کاریگەرەکان لە پێشکەشکردن و نمایشکردنی بابەتە ئەلیکترۆنییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، لەمشێوەیەدا بەتەنها وێنەی ڕووداوێکی تایبەت نمایش ناکات، بەڵکو سوود لە وێنە گۆڕاوەکان و رەگەزە گرافیکیە جیاجیاکان وەردەگرێت لەپاڵ ئەو کاپشن و زانیارییانەی لەگەڵ وێنەکان پیشان دەدرێن.

پێویستیش دەکات پێشکەشکردنی وێنەو رەگەزە گرافیکیەکان ریزبەند**بکرێن** و جۆرێك لە گونجاوی و هەماهەنگی تێیدا **رەچاوبکرێ**.

### ٤. چیرۆکە دەنگیەکان (Audio Stories)

بایەخی ئەم بابەتە دەنگیانە لەوەدایە، ئەگەر هاتوو لەپاڵ پێشکەشکردنی **چیرۆکەهەواڵ** و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان مانایەکی تازەی دەبەخشیە بابەتەکە نەدەکرا لە ڕێگەی وشەی نووسراو پێشکەش **بکرێ**.

باشتر وایە بابەتە نووسراوەکە بە بابەتە دەنگیەکە ببەسترێتەوە لەگەڵ دانانی وێنەی سەرچاوە قسەکەرەکە بۆ ئەوەی سوودی تەواو لە تایبەتمەندی و تواناکانی وێب وەربگیرێ، نەوەك بەتەنها مەبەستمان ئەنجامدانی کارێکی ڕووکەش و تەکنیکی بێت.

### ٥. گێرانەوە وێنەیی و دەنگییەکان (Narrative Slide show)

لەم قاڵبەدا بابەتە **پێشکەشکراو**ەکە بریتی دەبێت لە تێکەڵێك لە رەگەزە دەنگی و وێنەیی و ڤیدیۆییەکان، بە مەبەستی پێشکەشکردنی بابەتە ڕۆژنامەوانیەکە لە قاڵبێکی **سەرنجڕاکێش**، بۆ ئەم مەبەستە ڕۆژنامەوان ژمارەیەك وێنە و بابەتی دەنگی هەڵدەبژێرێ، هەریەکەیان ئەوی دیکە تەواو دەکات، وێنەکان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی بە دوای یەکدا دێن و لەگەڵێدا بابەتە دەنگیەکان دانراون بە جۆرێك لە شێوەی فیلمێکی تەواو دەکەوێتە بەرچاو، ئەمشێوەیە زیاتر لە فیلمی دیکۆمێنتاری دەچێت، کەزیاتر لە پێشکەشکردنی ئەو چیرۆکانە سوودی لێوەردەگیرێ رەگەزە وێنەیی و فیلە دەنگیە کاریگەرەکان لە خۆدەگرن.

### ٦. گفتوگۆی زیندوو (Live Chats)

ئەمشێوەیە زیاتر لە پرسیار و وەڵام خۆی دەبینێتەوە، لە ڕۆژنامەی کاغەزی بۆ پێشکەشکردنی هەندێ بابەت بەکاردەهێنرێت، لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنیش دەکرێ **پێشوازی** لە پرسیارەکانی جەماوەر **بکرێ** و بە شێوەیەکی کاریگەریش دادەنرێ بۆ پێشکەشکردنی زانیاری و تاوتوێکردنی پرسە جیاجیاکان.

### ٧. چیرۆکە وێنەی گاڵتەجاڕی (Animate Stories)

دەکرێ سوود لە وێنە کۆمیدی و گاڵتەجاڕیەکان وەربگیرێ بۆ پێشکەشکردن و نمایشکردنی بابەت و چیرۆکە جیاوازەکان، بە تایبەتی ئەگەر هاتوو وێنە و گرتەی ڤیدیۆیی لەبەردەست نەبوو لەگەڵ ئەو بابەتە دابنرێ.

### ٨. مەڵتیمیدیای کارلێکی (Interactive Multimedia)

دەکرێ لە کاتی پێشکەشکردنی چیرۆکە ڕۆژنامەوانییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت کۆمەڵێ شێوەو ڕەگەز تێکەڵ بەیەك **بکرێن**، بە جۆرێك بە تیکەڵ کردنیان بایەخێکی **سەرنجڕاکێش** و یەکانگیری فرەرەگەز و فرەڕەهەند بخاتە بەردیدی خوێنەر بۆ نموونە دەکرێ بابەتێك لە مانەی خوارەوە پێکهاتبێت (**وێنە کۆمیدیەکان + ڕەگەزە گرافیکیەکاراکان + بابەتە دەنگیەکان + وێنەو گرتەی ڤیدیۆیی**) بەمەش لە چەند ئاستێکی جیا بە هەمەڕەنگیەکی زۆرەوە بابەتێکی ڕۆژنامەوانی پێشکەش دەکەین کە لە ڕۆژنامەی کاغەزی و کلاسیکی جیایدەکاتەوە.

### ٩.چیرۆکە لاوەکییەکان (Side Bare)

پێویستی **کورتکردنەوەی** بابەت و **چیرۆکەهەواڵ**یەکان، ئەوە دەخوازی هەندێ ڕەگەزی لاوەکی و لایەنی جیاجیای ڕووداوە سەرەکیەکە لە شێوەی چیرۆکی لاوەکی بخەینە بەردەست بەکارهێنەر ئەگەر بیەوێ بیانخوینێتەوە، ئەم چیرۆکانە لە هەمان کاتدا لە چیرۆکە سەرەکیەکە **جیاکراونەتەوە** بۆ ئەوەی نەبێتە ڕێگر لە بەردەم خێرایی بەدواداچوونی خوێنەر بۆ چیرۆکە سەرەکیەکە.

### ١٠. پێشکەشکردنی دیکۆمێنت و کۆپیە رەسەنەکان (Trans cripts)

لەپاڵ ئەم شێوە و قاڵبانەش (Herbert) وایدەبینێت دەکرێ ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکان دەق و بەڵگە رەسەنەکان سەبارەت بە دیدار و کۆبوونەوە گشتییەکان بخەنە بەردەستی خوێنەر و بەکارهێنەرانیان لەوانەش بەڵگەنامە و کۆپی رەسەنی کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکان.

### هەواڵی ئەلیکترۆنی

بەهۆی ئەو خەسڵەت و تایبەتمەندییانەی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی هەیەتی، لە سەرەتای ئەم بەشە لەسەریان هەڵوەستەکرا، هەواڵی ئەلیکترۆنی هەندێ ڕووی جیاوازی هەیە لە هەواڵی ڕۆژنامە کاغەزیەکان، بۆ نموونە بەهۆی خەسڵەتی خێرایی و **ڕاستەوخۆ**

**وونی** تۆڕی ئینتەرنێت (د.یونس شکرخاه) لێکۆڵەر و ڕۆژنامەوان جەخت لەوە دەکاتەوە دەبێت هەواڵی ئەلیکترۆنی کورت بێت وداواش دەکات لە هەواڵی ئەلیکترۆنی ووردەکاری ڕووداوەکە تەنها بە وشەی نووسراو باس نەکەین، بەڵکو سوود وەربگیرێ لە ئاسانکاری و توانای تۆڕی ئینتەرنێت خستوییەتیە بەردەست ڕۆژنامەوان، بۆ ئەوەی خوێنەر لە ڕێگەی بینین و بیستن و تەواوی هەستەوەرەکانی هەواڵەکە بخوینێتەوە و کارلێك بکات لەگەڵیدا.

لەکۆمەڵەی هەواڵنێری ئینتەرنێتیدا بەمشێوەیە باس لە بنەماکانی نووسینی هەواڵ دەکات:

١. با ئاستی نووسراوەکانتان نزمتر بێت لە ئاستی خوێندنی خوێنەران، ئاستی خوێندنی خەڵکی ئاسایی لە ئەمەریکا پێنجی سەرەتاییە، ئاستی خوێندنی کەسانی پسپۆڕ لە ئەمەریکا شەشی ئامادەییە.

٢. سوودوەرگرتن لە پەڕەگرافی کورت و **سەرنجڕاکێش**، مانای ئەم کارە پوختە نووسینە نەك "هێما نووسی".

٣. لە فەزای سپی ناودەقەکە سوودوەرگرن، فەزای سپی فەزایەك نییە خەسار بوو بێت، بەڵکو بۆ تێگەیاندن و ڕوونی بابەت یارمەتیدەرە.

٤. دەبێ لە هەڵبژاردنی وشەکان دا زۆر وریا و وورد بین، وشەکان لە گوتارە ئەلیکترۆنییەکان دا لە گوتارەکانی دیکە بە بایەخترن.

٥. خەڵك دەتوانن لەیەك کاتدا تەنها لە حەوت بابەت تێبگەن، ئەم خاڵە لەپەڕەگرافەکانی خۆتاندا رەچاوبکەن، نابێ تووشی ئاڵۆزی لە زمان و شلەژانی لە دارشتندا بن.

٦. لە **کورتکردنەوە**ی زۆر خۆ ببوێرن، ئەگەر لە **کورتکردنەوە** سوودتان وەرگرت دەبێ بە شێوەیەکی تێروتەسەل شیبکەنەوە، بەو مانایەی **کورتکردنەوە**کە نەبێتە هۆی نارۆشنی بابەتەکە و تێنەگەیشتنی خوێنەر لێی.

٧. رستەی نادیار، سلبی و پرسیاری، کاتێکی زۆرتری دەوێت هەتا خوێنەر لێیان تێبگات، هەربۆیە لەمجۆرە ڕستانە خۆ ببوێرن. لە بیرتان نەچێت ڕستەی نادیار سەر لە خوێنەر دەشێوێنێت و ڕستەی سلبی باس لە ڕوونەدانی ڕووداو دەکات کە خۆی لە خۆیدا

جۆرێك لە بێ هەواڵیە، خراپتر لەوەش ڕستەی پرسیاریە، ئەوە مافی خوێنەرە پرسیار بکات، هەواڵنێر دەبێ وەڵامی پرسیار بداتەوە.

٨. کار لەسەر ئەوە بکەن هەڵە نەکەن.

**پێکهاتەکانی هەواڵی ئەلیکترۆنی**

**هەواڵی ئەلیکترۆنی لە پێنج بەشی سەرەکی پێکدێت:**

**١. ڕووداو:** ڕووداوەکان بەشێکی گرنگی هەواڵن لەڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنیدا و دەروازەیەکی سروشتیە بۆ ئەوەی دواتر لە دوای زانیارییە **بایەخدار**ەکانی ڕووداوەکەدا برۆین لە ڕێگەی **وەڵامدانەوەی** شەش پرسیارە بە ناوبانگەکەی هەواڵ (**کێ، کەی، لەکوێ، چی، بۆچی، چۆن**).

**٢. زانیارییەکان:** پێویستە هەواڵێك بخەیتە بەردەستی خوێنەران کە بوونیادێکی **تێروتەسەلی** هەبێت و لایەن و ڕەهەندەکانی ڕۆشن بێت، هەواڵی ئەلیکترۆنی زانیاری زۆر و وردەکاریەکانی ڕووداوەکە لەخۆیدەگرێ بە مەبەستی تێگەیشتنی قووڵ لە هەواڵەکە، ئەو زانیارییانە دەدرێن بە خوێنەر یارمەتی بدات لە شیکردنەوەی ڕووداوەکە، ئەم زانیارییانەش لە شێوەی جیاجیا دەدرێن بە خوێنەر لەوانە:

أ. پێناسە و ناساندنی لایەنەکانی ڕووداوەکە.

ب. شیکردنەوەی ئەو هۆکارانەی پاڵنەری ڕوودانی ڕووداوەکە بوون.

ج. کارلێك لە نێوان خوێنەر و هەواڵ و زانیارییەکان لە ڕێگەی ڕادەربرین و نووسینی لێدوان و بەشداریکردن لە ڕاپرسیە پەیوەندیدارەکان بە هەواڵەکە.

**لە شێوەکانی خستنەڕووی زانیاری و پێشکەشکردنی:**

- ئەو باکگراوند و فلاشانەی بە دوای بڕگە سەرەکیەکانی هەواڵەکە دێن، ئەگەر هەواڵەکە بە قاڵبی **هەرەمی** هەڵگەراو بنووسرێ.

- وشە کاراکان (**لینك**) لەناو دەقی هەواڵەکە، بۆ ناساندنی لایەن و کارەکتەرەکانی ڕووداوەکان و **خستنەڕووی** وردەکاریە گرنگەکان.

- نەخشە و وێنەو خشتەی داتاکان.

**٣. ڕوونی و وردی:** سەرباری ئەوەی هەواڵی ئەلیکترۆنی گرنگی زۆر بە وردەکاری ڕووداو و باکگراوندەکانی دەدات، لەگەڵ ئەوەش هەواڵی ئەلیکترۆنی نابێ زانیاری

نارۆشن لە خۆی بگرێ سەبارەت بە کات و شوێن و کەسەکان، بەڵکو پێویستە بە ووردی ئەم زانیارییانە دیاری **بکرێ**.

**٤. بەڵگەو دیکۆمێنت:** یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی هەواڵی ئەلیکترۆنی ئەوەیە دیکۆمینتێکە دەمێنێتەوە، بە کۆتاییهاتنی نمایشکردنی لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت کۆتایی نایەت لەبەرئەوە پێویستە بایەخی زۆر بدرێت بە پۆلێنکردن و ئەرشیف کردنی و گرنگی بە ووردەکاریەکانی پۆلێنکردنی بدرێت.

**٥. گەڕێنەرەوە:** لەبەرئەوەی هەواڵە ئەلیکترۆنییەمان دەمێننەوە، بۆیە ئەگەری ئەوە هەیە بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت لە ڕێگەی ئامرازی بەدواداگەران (Search) داوای بکەن و دەستی بخەنەوە، هەروەك دووبارە بەکاردەهێنرێنەوە لەگەڵ ڕووداوە تازەکان، کەوا پێویست دەکات کلیل و کۆدی گونجاوی بۆ دابنرێ دەستراگەیشتنی خوێنەر بە هەواڵەکە ئاسان بکات لە ڕێگەی بە دواداگەران.

### قاڵبەکانی نووسینی هەواڵی ئەلیکترۆنی

لێرەدا سێ قاڵبی سەرەکی دەخەینە ڕوو بۆ نووسینی هەواڵی ئەلیکترۆنی:

**١. قاڵبی ناهێڵەکی (Nonlinear):**

لەم قاڵبەدا هەواڵ دەکرێ بەچەند پەڕەگرافێك، پێکدێت لە ناونیشان و پێشەکیەك لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکە دادەنرێت لەگەڵ کۆمەڵێك (Hyper Links) خوێنەر دەگەیەنێتە وردەکاری و باکگراوندەکانی ڕووداوەکە و لە لاپەڕەکانی ناوەوەی ڕۆژنامەکە دادەنرێت، لەمەشدا خوێنەر ئازادە کام لەو هایپەرلینکانە هەڵدەبژێرێ و بەچ ڕێزبەندێك و کامەیان پێش کامەیان دەخوێنێتەوە.

**٢. قاڵبی تابلۆی دیزاین (Bulletin Boarded Technique):**

یەکێکە لە قاڵبە گونجاوەکانی داڕشتنی هەواڵ لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت کە بە قاڵبی(Story Board) ناسراوە، لەم قاڵبەدا ئەوە لە بەرچاوگیراوە هەواڵی ئەلیکترۆنی بەوە جیادەبێتەوە لە هەواڵی کلاسیکی و چاپکراو، هەموو ئەو ڕەگەز و کەرەستانە بەکاردەهێنێت ژینگەی کاری ڕۆژنامەوانی ئینتەرنێتی بەرهەمی هێناوە لە مەڵتیمیدیای کارلێکیەوە، لەم قاڵبەدا دەنگ و وێنەو فیدباك و ڕەگەزەکانی دیکە دەخرێنە نێو **چیرۆکەهەواڵە**کەوە.

### ٣. قاڵبی هەرەمی هەڵگەراو:

لە سەرەتای ئەم بەشە لە قاڵبەکانی نووسینی بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان باسمان لێوەکرد، لەم قاڵبەدا دوای مانشێت پێشەکی و لیدێکی تێروتەسەل لەبارەی ڕووداوەکە پێشکەش دەکرێ گرنگترین زانیاری لە خۆیدەگرێ، دوای لید هەواڵەکە دابەش دەبێت بۆ سەر چەند برگەیەك هەریەکەیان زانیارییەکی گرنگ لە خۆیدەگرێ بە شێوەی تا لە کۆتایی نزیك بینەوە پەڕەگرافەکان بایەخیان کەمتردەبێتەوە، دوای ئەو پەڕەگرافانەش کۆمەڵێك زانیاری وەك باکگراوندی هەواڵەکە دەخرێنە بەردەستی خوێنەر.

## ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی کوردی

**لە سەرەتای** هەزارەی سێیەمەوە وردە وردە چەمکی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی خرایە نێو دونیای ڕۆژنامەوانی کوردی و بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار بووە بەشێك لە بوونیادی ڕۆژنامەوانیمان وەك هەنگاوێك بۆ گەیشتن بەو پێشکەوتنە خێرایەی تەکنەلۆژیای گەیاندن و ڕاگەیاندن بە خۆیەوە دەبینێت، ئەو پێشکەوتنە سەرسورهێنەرانەی لە سەرووی پێشبینی و چاوەڕوانکردن بوو، بە ڕادەیەك جیهان تەواو خۆی ئامادەنەکردبوو بۆ **پێشوازیکردن** لەو داهێنانە زۆرانەی لە بواری پەیوەندیکردن، ئینتەرنێت، مۆبایل، مانگە دەستکردەکان و پەخشی کەناڵە ئاسمانیەکان هاتونەتەئاراوە، هێشتا ئەو شۆك و سەرسوڕمانیە بەرینەداوە، خۆی لە ماوەیەکی کورتدا لە بەرامبەر شەپۆلێکی بەرفرەوانی تەکنەلۆژیا بینیەوە.

ئاسایی بوو هەلسوڕێنەرانی ڕۆژنامەوانی لە کوردستان لە خەمی سوودوەرگرتندا بن لەو پێشکەوتنانەی لەسەر ئاستی ڕۆژنامەوانی و میدیا هاتۆتەئارا و زەمینەسازی بکەین بۆ لە دایکبوونی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی کوردی، بۆ ئەوەش خوێنەری کورد لە سیما هاوچەرخەکانی ڕۆژنامەوانی بەهرەمەندبێت.

ئەو گۆڕانکاریە مەزنانەی لە کاری ڕۆژنامەوانیدا **بەرچاودەکەوێ** بە تەنیا لە ڕەهەندە تەکنەلۆژیەکە کورت **بکرێت**ەوە، بەڵکو بە بۆچوونی شارەزایانی بواری پەیوەندیکردن گۆڕانکاریەکان سەرتاپای پێکهاتەی سیستەمی ڕۆژنامەوانی گرتۆتەوە، هەر لەو تەکنەلۆژیای بەکاردەهێرێ و لێهاتووی نێرەر و ئامادەییەکانی وەرگر و ئەو فەزایە تازەیەی لە نێوان ڕەگەزە سەرەکیەکانی پرۆسەی پەیوەندیکردن دروستبووە و زیادبوونی

ڕۆڵ کاریگەری ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی لەسەر کایە سیاسی و کۆمەڵایەتیی و فەرهەنگیەکان.

سەرەتاکانی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی لە کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵی (٢٠٠٠)، سەرباری خراپی خزمەتگوزارییەکانی تۆڕی زانیاری جیهانی و نەبوونی پێداویستیە سەرەکیەکان بۆ راییکردنی کارەکە، لێ بەو توانا سنوردارەی **لەبەردەستی** ڕۆژنامەوانانی کوردستان هەبوو لە ڕووی کارامەیی پیشەیی و هونەری و تەکنیکی و ماددیەوە، ئەم لایەنە گرنگەی کاری ڕۆژنامەوانی گەشەپێدا، ئێستا لە ڕووی ئاستی جۆرایەتی و چەندایەتی هەنگاوی باشی بریوە، ئەگەرچی ئەم هەنگاونانە لە ئاستی پێویستی و چاوەڕوانیدا کەمترە.

ئەمڕۆ ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لە وڵاتانی پێشکەوتوودا بوونەتە هاوشانی ڕۆژنامە کاغەزیەکان و بگرە لە هەندێ شوێندا ئەو بەربەستەیان تێپەڕاندووە و بوونەتە ڕکابەری سەرەکی ڕۆژنامە کاغەزیەکان، لە ئامارە تازەکانی پەیوەست بە زیادبوونی ڕێژەی خوێنەرانی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لە ئەمەریکا دەرکەوتووە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان زیاتر لە ڕۆژنامە کاغەزیەکان دەخوێنرێنەوە، بەشی هەرە زۆری هاووڵاتیانی ئەمەریکا وەك سەرچاوەی یەکەمی بە دەستهێنانی زانیاری بەکاریدەهێنن، ئەم وەرچەرخانە لە بایەخپێدانی خوێنەری ئەمەریکی زۆرێك لە ڕۆژنامە گەورەکانی ناچارکرد مشوری تیراژی ڕۆژنامەکەیان بخۆن، بیر لەوە بکەنەوە خزمەتگوزارییە ڕۆژنامەوانییەکان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بە شێوەیەکی باشتر و بەرفرەوانتر **بڵاوبکەنەوە**.

کەواتە ئێمە باس لە ڕوخسارێکی نوێی کاری ڕۆژنامەوانی دەکەین ڕۆژ بە ڕۆژ گەشاوەتر دەبێت، ژمارەیەکی زیاتر لە خوێنەر بە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە، بەڵام دیمەنەکە لەهەرێمی کوردستان هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە، ڕۆژنامە کاغەزیەکان سەرباری دابەزینی ڕێژەی خوێنەرانیان، لەگەڵ ئەوەشدا بەلای خوێنەری کورد بەوشێوەیە پشتی تێنەکراوە و ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییە کوردیەکانی نەکردوە بە بەدیلێك بۆ ڕۆژنامە کاغەزیەکان.

پێنەگەیشتنی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی کوردی هاوشانی نەبوون لە ڕکابەریکردنی ڕۆژنامە تەقلیدیەکان، چەندین هۆکاری خودی و بابەتی هەیە، لێرەدا ئەو هۆکارانە ئاماژە پێدەکەین :

یەکەم: لە خۆرئاوا ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لەو کاتە پەیدابوون ڕۆژنامە کاغەزیەکان لە ساتەوەخی خۆرئاوابوون و پاشەکشێ بوون، بەڵام لە کوردستان ئەو ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییانە هاوکات بوون لەگەڵ ساتەوەختی هەڵاتنی خۆری ڕۆژنامە ئەهلیەکان و ئەو بزاوت و چالاکیەی کەوتە نێو جەستەی ڕۆژنامەوانی کوردیەوە، بۆیە بەگوێرەی پێویست نەیتوانی خۆی وەك میراتگری ڕۆژنامە کاغەزیەکان بسەپێنێ.

دووەم: کلتوری خوێندنەوە لای تاکی کورد هێشتا کلتوری کاغەزیە و نەگۆڕاوە بۆ کلتورێکی ئەلیکترۆنی، بەو مانایەی خوێندنەوە لە ڕێگەی کۆمپیوتەرەوە نەبووە بە نەریت و زەمینە و ئامادەییەکانی بە شێوەیەکی تەواو لە هزر و دەروونی خوێنەر نەخەملێوە، ئەمە وایکردوە ڕێژەی خوێنەرانی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان سنوردار بێت و لە ئاستی بژاردە مابێتەوە، هەنگاوی زۆر ماوە لەوەی لە ڕۆژنامەی بژاردە ببێ بە ڕۆژنامەیەکی جەماوەری، لە هەموو ئاستەکانی رەگەز و تەمەن و خوێندەواریدا بخوێندرێتەوە، بە تایبەتی ئەگەر ئەوە بە بیرخۆمان بهێنینەوە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لە توانایاندا هەیە پێویستی و ئارەزووی چین و توێژ و ئاستە جیاوازەکان تێربکەن بە هۆی بوونی پانتایی زۆر، هەروەها ئەو رەگەزە تایپۆگرافیانەی زۆرترین بری زانیاری لە خویان دا هەڵدەگرن، ڕوودانی هەر گۆڕانکاریەك لە کلتوری خوێندنەوەی تاکی کورد پێویستی بەوە هەیە لەسەر چەند لایەنێك کار **بکرێت** لەوانە:-

١- بەرە پێشچوونی ئابووری لە کوردستان و ڕەنگدانەوەی لەسەر بەرزبوونەوەی داهاتی تاکەکەس، تا ئەو شوێنەی کەسی خوێندەوار لەماڵەکەیدا توانای دابینکردنی کۆمپیوتەر و هێلی ئینتەرنێتی هەبێت.

٢- باشترکردنی خزمەتگوزارییەکانی ئینتەرنێت لە کوردستان دەبێتە هۆکارێکی یاریدەدەر بۆ ئەوەی زیاتر پشتی پێ ببەسترێ و لەلایەن خەڵکەوە بەکاربهێنرێ، هێلەکانی ئینتەرنێت لە ڕووی خێراییەوە زۆر خراپن و سستبوونی کردنەوەی ماڵپەڕ و لینکی ڤیدیۆیی ڕەگەزەکانی دی لە کاتی بەکارهێنانی ئینتەرنێت و ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان، بوونەتە هۆکارێك بۆ وەڕس بوونی بەکارهێنەر و لاوازبوونی حەز و پاڵنەری بەکارهێنان و سوودوەرگرتن لەو خزمەتگوزاریانە ڕەنگە پێویست بەوە بکات حکومەت و لایەنە فەرمیەکانی وەك وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن ڕۆڵی هەبێت لەوەی کۆمپانیاکانی بواری پەیوەندی و ئینتەرنێت ناچاربکات خزمەتگوزاریەکانیان

باشتربکەن لە ڕێگەی سەپاندنی یاسا و ڕێنمایی و مەرجی تایبەتەوە، ڕێکخستنی ئەم لایەنەی کاری کۆمپانیەکان و مافی بەکارهێنەران بە شێوەیەکی سەرەکی دەکەوێتە ئەستۆی لایەنە فەرمیە پەیوەندیدارەکان، ناکرێ بۆ حەزو بەرژەوەندی چەند کەس و کۆمپانیایەك جێ بهێلن.

٣- لەم هەرێمە سەرچاوەکانی زانیاری و مافی هاوولاتی و ڕۆژنامەوان لە ئازادیی گەیشتن و بەدەستهێنانی زانیاری تەسلیمی میزاجی شەخسی و پەیوەندییە شەخسیەکانی ڕۆژنامەوان و سەرچاوەکانی زانیاری کراوە، ڕۆژنامەوانی لە سایەی کەمی و سنورداری زانیاری سەبارەت بە هەندێ پرس و بابەتە گرنگ و هەستیارەکان، بووە بە ڕۆژنامەوانیی ڕاوبۆچوون نەك ڕۆژنامەوانی زانیاری، ڕۆژنامەوانی ئاڕاستەکردن و زیاتر کار لەسەر هەڵنان و هاندان بکات، بەمەست یان بێ مەبەست، بە ویست یان بێ ویستی خۆی بێت، هۆکارەکەی هەرچیەك بێت لە جەوهەری کاری ڕۆژنامەوانی نابێت دووربکەوێتەوە ئەویش بریتییە لە کۆکردنەوەی زانیاری و بڵاوکردنەوەی.

کەواتە لە بنەرەتدا میدیا بە گشتی و ڕۆژنامەوانی کاغەزی بە تایبەتی نەبۆتە سەرچاوەیەکی زانیاری وەرگرتن بۆ خوێنەر و هەمان ئەو نەخۆشیەش لە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی بەدیدەکرێ، ئەوەی دەبینرێ هەواڵەکان زیاتر لێدوان وەرگرتنە کە زۆربەی جار لە ڕێگەی تەلەفۆن وەردەگیرێت و کەمتر داتا و زانیاری دروست لەخۆیدەگرێ وەك ئەوەی ڕۆژنامەوان بە شێوەیەکی مەیدانی لە ئەنجامی بەدواداچوونی بەردەوام دەستیکەوتبێ، بۆیە زیادەڕۆیی نیە ئەگەر بلێین میدیا و ڕۆژنامەوانی ئێمە سەرباری داخستنی دەرگاکانی زانیاری بەڕوویدا بە تەقلیدی و ئەلیکترۆنییەوە ڕۆژنامەوانیەکی تەمبەڵە، ئامادەیی و پاڵنەرەکانی گەڕان و بەدواداچوونی زانیاری لە نزمترین ئاستیدایە.

ئەمە بۆ خۆی وایکردوە زۆرێك لە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لەیەکتر بچن وەك چۆن زۆرێك ڕۆژنامە کاغەزیە کوردیەکان لەیەك دەچن، بڵاوکردنەوەی هەمان زانیاری و بۆچوون بێت بە کۆمەڵێك ڕتوش و نەشتەرگەری کە لەگەڵ ئاڕاستەی سیاسییاندا بگونجێت.

دەرئەنجام ئەوەیە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی نەبۆتە پێویستی ڕاستەقینە و سەرچاوەی سەرەکی بۆ دابینکردنی ئەو پێداویستیانە و زۆرینەی ئەمانەن وەك سەرچاوەی یەکەم مامەڵە لەگەڵ ئەو ڕۆژنامانە ناکەین.

سێیەم: بەهۆی کەمی خوێنەر ڕکابەریەکی ڕاستەقینە لە نێوان ئەو ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییانە دروست نەبووە، لەوەش زیاتر نەیتوانیوە متمانەی سەرمایەدار و بازرگان و کۆمپانیاکان بەدەستبێنن بۆ ریکلامکردن بۆ بەرهەم و کالاکانیان، لەوەشدا ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی یەکێك لە سیماکانی ڕۆژنامەی سەردەم و هاوشێوەکانی لە وڵاتانی پێشکەوتوو لەدەستداوە و سەرچاوەیەکی داهاتی دەکرا لە **پەرەپێدانی** ڕۆژنامەکە و هاندانی ڕۆژنامەوانەکانی سوودی لێوەربگرێ.

چوارەم: ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی لە نێوان گرفتێکی **دوولایەنە**دایە، یەکێکیان نائامادەیی دامەزراوەی ڕۆژنامەوانیی سەربەخۆی تایبەت بە ڕۆژنامەیەکی ئەلیکترۆنی خودان ستاف و سەرمایە و ئامانج و سیاسەتێکی ڕۆژنامەوانی سەربەخۆ بێت و لەولاشەوە بەدەست **فەرامۆشکردن** گیرۆدەیە، وەك پاشکۆیەکی ڕۆژنامە کاغەزیەکە یان ڕێکخراوە سیاسی و مەدەنیەکە ئەرك و ئامانجی سنورداره و زەمینەی گەشەو **کارابوونی** لە بەردەمدا داخراوە.

ڕۆژنامە کاغەزیەکان سەرکەوتوو نەبوون لەوەی لەو ماڵپەڕانەی هەیانە سوودوەرگرن، بیکەنە هۆکارێکی بەهێزبوون و زیادکردنی خوێنەرەکانیان، ژمارەی ئەو کەسانەی سەردانی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنی و ماڵپەڕە هەوالیە کوردیەکان دەکەن بە بەراورد لەگەڵ ڕۆژنامەی کاغەزی و لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانی هەرێم، ژمارەیەکی کەمە و ئاماژەیەکە بۆ ئەو بۆچوونانەی هەڵوەستەمان لەسەریانکرد.

دەبێت سەر**نووسەر** و هەڵسوڕێنەرانی ڕۆژنامە کاغەزیەکان باشتر درك بە گرنگی ئەو لایەنە بکەن و ئەو تایبەتمەندی و خاڵە بەهێزانەی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی هەیەتی هەرس بکەن، **لە یەکێك لەسەرپەرشتیارانی ماڵپەڕی یەکێك لە ڕۆژنامە ڕۆژانەکانی کوردستانم پرسی بۆچی سوود لەو تایبەتمەندییە** زۆروزەبەندەی ئینتەرنێت وەرناگرن لە دەوڵەمەندکردن و بەهێزکردنی ماڵپەڕەکە؟ بۆ نموونە لینك لە ناوەڕۆکی بابەت و هەواڵەکان دانانێن تاوەکو زۆرترین زانیاری لە بەردەستدابێت، بۆ کۆمێنت و ڕاپرسی و ئەرشیفی پەیوەندیدار بە بابەتە بڵاوکراوەکان و دەیان خزمەتگوزاری دیکە هەن سوودی لێوەرناگرن؟ ئەو لە وەڵامدا باسی لەوەکرد لە سەرووی خۆیانەوە داوایان لێنەکراوە، ئەگەر داوایان **لێبکرێت** ئەوا دانانی ئەو خزمەتگوزاریە کارێکی ئاسانە.

پێنجەم: بەرەنجامی نەبوونی ئەو **گرنگیدانە** و بوونی کەسانێك توانا و شارەزایەکی ئەوتۆیان لە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنیدا نەبوو، ئەم کەم ئەزمونی و شارەزاییەش بەچەند شێوە ڕەنگیداوەتەوە بەسەر شێوە و ناوەڕۆکی ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان و لێرەدا لە چەند خاڵێك ئاماژەیان پێدەکەین:-

١-لاوازی و بوونی هەڵەی زەق لە داڕشتنی هەواڵ و بابەتە ڕۆژنامەوانییەکان، بەجۆرێك ڕەچاوی قاڵبە هونەریە گونجاوەکان و تایبەتمەندییەکانی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی ناکات.

٢-لە ڕووی شێواز و دیزاینەوە، بە شێوەیەکی دروست و ڕەچاوکردنی بنەما سایکۆلۆژیەکان سوود لە ڕەنگ و ئەو فەزایانە وەرنەگیراوە کە یارمەتی زیاتر **سەرنجڕاکێشانی** خوێنەر و ئاسانکاری بۆ بکات بۆ **چاولێکردنی** بابەتە گرنگ و تازەکان، لە هەندێ ماڵپەڕ و ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی زۆر جار قەرەباڵغیەکی زۆر دەبینرێ سەر لە خوێنەر **تێکدەدات**، لە هەندێکیان ڕەنگی زۆر نەگونجاو لەگەڵ یەکتر **بەکارهاتوون**.

٣-لە ڕووی بەکارهێنانی ڕەگەزە تایپۆگرافیەکانی وەکو وێنەی جوڵاو و فۆتۆ و نەخشەو هێڵکاری و دەنگ، ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییە کوردیەکان هەژارن بە شێوەیەکی سنوردار نەبن بەکارنایەن.

٤-خزمەتگوزارییەکانی کارلێکردنی وەك دانانی (کۆمێنت، گروپەکانی چات، ئیمێڵ، ڕاپرسی) لە ڕۆژنامەوانی کوردی سنورداره و زۆر بەکەمی بەکاردەهێنرێت، بەمەش بە هەمان عەقلیەتی ڕۆژنامەی کاغەزی، کاردەکرێت لە ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی.

٥-ئەو قوڵییە مەعریفیەی بڕیارە لە ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنیدا هەبێت وەك دانانی لینك لە ناوەڕۆکی بابەت، بوونی لینکی بابەت، ماڵپەڕی پەیوەندیدار، ئەرشیفی هەواڵ و بابەتە هاوشێوەکان لە کەمترین ئاستدا بەکاردەهێنرێن بۆیە ڕۆژنامە ئەلیکترۆنییەکان لەو ڕووەوە جیاوازیەکی ئەوتۆیان نیە لەگەڵ ڕۆژنامە کاغەزیەکان کە لە بنەرەتدا ئەو دەسەڵات و تایبەتمەندییانەیان نیە.

# سەرچاوەکانی بەشی سێیەم


**١. الصحافة الالكترونية، زيد منير سليمان، الطبعة الاولي، ٢٠٠٩، دار أسامة للنشر والتوزيع، عمان-الاردن.**

**٢. الصحافة الالكترونية، د رضا عبد الواجد امين، الطبعة الاولي، ٢٠٠٧، دار الفجر للنشر والتوزيع-القاهرة**

**٣. النشر الاكتروني، الطباعة والصحافة الالكترونية والوسائط المتعددة، الطبعة الاولي، ٢٠٠٥ د. محمد جاسم فلحي، دار المناهج، عمان-الاردن**

٤. ئومید مەسعودی، و: جوامیر مارایی، بنەماکانی نووسین لە ڕاگەیاندندا، چاپی یەکەم ٢٠٠٥-چاپخانەی سیما.

**٥. اسماعيل مصطفي، بناء الخبر في صحافة المعلومات-الجزيرة نت.**

٦. الصحافه الالكترونيه، تویژینەوەیەکە بە زمانی عەرەبی لەم ماڵپەڕە دا بڵاوکراوەتەوە:

www.masscomm.cu.edu.eg

7 .Jonathan Dube: Online Story telling forms-Http-www.CyberJournalist.net-news-000117-GMT4-10am-4-10-2010

# بەشی چوارەم

## پەیوەندیی نێوان ئازادیی ڕۆژنامەوانیی و کارایی میدیا

دەڵێن ئەوەی شۆڕش و ڕاپەڕینەکان دروستدەکات ستەمکاری نیە، بەڵکو هەستکردنی کۆمەڵگەیە بەو ستەمکاریە، لە سەردەمی تەکنەلۆژیای ژمارەییدا کاریگەرترین هۆکاری ئاشکراکردن و بەرجەستەکردنی ئەو ستەمکاریە ئامرازەکانی میدیان بە شێوەیەکی گشتی و میدیای نوێیە بە تایبەتی، میدیای نوێ بەڕەکەی لەژێر پێی حکومڕانەکان دەرهێنا، بوو بە میدیای خەڵك و گەرموگوڕترین ناوەندی دروستبوون و بزواندن و ڕێکخستن و ئاڕاستەکردنی ڕای گشتی، جاران میدیا ئامرازێك بوو تەنها بەدەست دەسەڵاتەوە بوو بۆ ئارایشتکردنی سیاسەت و بڕیارەکانی خۆی بەکاریدەهێنا، ڕای گشتی چەواشەدەکرد بەشێواندنی زانیاری و ڕاستیەکان، بەڵام ئێستا جڵەوی دەستپێشخەریەکە کەوتۆتە دەست هاووڵاتیەکی ئاسایی و ڕۆژنامەوانێکی پیشەگەر کە دەکرێ بە کامێرای بچووکی مۆبایلەکەی ڕاستیەکی گەورە تۆماربکات، بەخێراییەکی زۆر بیگەیەنێتە هەموو شوێنێکی دونیا، بەمەش سەرکوتکردن و داخران و پەردەپۆش کردن کە خاڵی هێزی سیستەمە ستەمکاریەکان بوو لە بەرامبەر کاریگەری میدیا و میدیای نوێدا سیحری جارانی نەما و لەگەڵێدا عەیب وعار و پێشێلکاریەکانیان بەدەرکەوت.

لە سیستەمە سیاسیە تاکڕەو و تۆتالیتاریەکان دا گرنگییەکی گەورە دەدرێ بە ڕۆژنامەوانی چونکە دەتوانن لەو ڕێگەیەوە ڕای گشتی ئەوتۆ بخولقێنن کە باوەر بەلۆژیك و

ئایدۆلۆژیای ئەوان بکات و پەیوەندی ڕۆژانە و بەردەوام دروستدەکات لە نێوان کار بەدەستانی بالاو بنکە کۆمەلایەتییە فرەوانەکە بە شێوەیەکی خێراو دینامیکی. ڕۆژنامەوانی ڕۆڵێکی سەنترالیزم دەبینێ لە پرۆسەی گواستنەوەی کۆمەلایەتیی "کۆمەڵگە"وەك گردبوونەوەیەکی دانیشتوان بۆ کۆمەڵگە، بەو سیفەتەی ڕای گشتی کاریگەرە، بە واتایی ڕۆژنامە بەشدارییەکی کارای هەیە لە بژاردە کردنی نەوعیانەی کۆمەڵگە و رزگاربوونی لەو نەخوێندەوارییە کەڵەکەبووەی لە واقیعدا هۆشیارییەکی دواکەوتووی خولقاندووە. نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە قۆناغەکانی **بەرە پێشچوونی** شارستانی لە بنەرەتدا پابەندبوونێکی ڕاستەوخۆی دەوێت بە هەقانییەت و شەرعیەتی خواستی کۆمەڵگەکان لە بەرێوەبردنی کاروبارەکانی خۆیان و بە ئازادییەکی بەرفرەوانتر، بۆیەش دەوترێ ڕۆژنامەوانی کەرەستەی گوزارشتکردنە لە هەقانییەت و ئارەزووی کۆمەڵگەکان لە فۆرمی جیاجیا دا.

بەمشێوەیە ڕۆژنامەوانی بووە بە سیمبولێکی هاوچەرخانەو پێویستییەکی شارستانیانەی مەزن بۆ حکومەت و کۆمەڵگەکان و تەنها حکومەتە دیکتاتۆرییەکان دژایەتی دەکەن بەهۆی ئەو هێز و کاریگەریە لە ڕادەبەدەرەی قەڵەم و وشەکان لە خۆیانی دەگرن، ئەو نەمریەی وشەی نووسراو هەیەتی نیگەرانیی دیکتاتۆرە بچووکەکان دەوروژێنێ و دەترسن لە نەمریی بیروبۆچوونەکان.

(کاسترۆ) یەکێکە لە سەرکردەکانی پێشووی ڤەنزویللا باس لەو ترسە دەکات لە ڕۆژنامە هەیەتی، بەئاشکرا گوزارشت لە بەهێزی ڕۆژنامە و گەورەیی کارەکانی دەکات و دەڵێ: "لە دەروازەی دۆزەخ ناترسم ئەگەر بە ڕوومدا **بکرێت**ەوە بەڵام لەرزم لـێدێ لە جیرەی قەڵەمی ڕۆژنامەوانێك ". بە هەمان ئاڕاستە (دیاز)ی سەرۆك کۆماری مەکسیك دەڵێ: دەمەوێ ببمە خاوەنی کارگەکانی مەرەکەب و کاغەز بۆ ئەوەی بیانسووتێنم "سوڵتان عەبدولحەمیدیش دوای لە کارلادانی دەڵێت: "ئەگەر بۆ یەڵدز بگەرێمەوە هەرچی ڕۆژنامەوان هەیە دەیخەمە قاوغی شقارتەیەك".

لەگەڵ ئەمە دا قسەکانی سوڵتان عەبدولحەمید و ئەوانی دیکەش، ئەمرۆ هیچ سەدایەکیان نەماوە و لایەنگری لـێ ناکرێ لە ناوەندە جۆربەجۆرەکاندا، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەرێتەوە ڕۆژنامەوانی بەهێز بووە، لە بوون و کاریگەریدا زیاتر رەگی داکوتاوە و هاتووەتە ناو ژیانی هاوچەرخ، وەك یاسایەکی بنەڕەتی و حەتمی هەرەس

ناهێنی، ئەمە وایکردوە حکومەتە دیکتاتۆرە کورت بینەکان هەوڵی کرینی هەموو ئەو شتانە بدەن پەیوەندییان بە رۆژنامەوانییەوە هەیە، چونکە لە سەکۆی تایبەت بەخۆی دەگەرێ و بەرەنگاری هەموو رۆژنامەیەکی بە میسداقیەت، بێلایەن و سەربەخۆ دەبێتەوە رەنگدانەوەی ئیرادەی جەماوەرو خواستەکانییەتی بۆ ئازادی، بەڵام ئەو راستیە بابەتیەی لە پێشەوەی راستیەکانەوە دێ ئەوەیە، بناغەی ماددی هەر پێشڤەچوونێکی کۆمەڵایەتیی رووداوات بەبێ پێشڤەچوونی رای گشتی، کە رۆژنامەوانی بریتییە لە گرنگترین فاکتەرەکانی جوڵاندنی رای گشتی، هیچ دەوڵەتێك ناتوانێ خۆی لابدا لە حەتمیەتی بوونی رۆژنامە، مادام حیساب بۆ رای گشتی و ئاراستەکانی دەکات.

لە سیستەمی دیموکراتی دا ئەوپەری ئازادیی و سەربەخۆیی دەدرێ بە رۆژنامەوانی، چونکە رۆژنامە و کەناڵەکانی دیکەی میدیا زمانحاڵی گەلن، لە رێگای ئەو کەناڵانەوە گەل گوزارشت لە بیروڕای خۆی دەکات. بۆیە بە شێوەیەکی سەرەکی ئەرکی رێکخستنی ئەو پیشەیە بۆ ئەندامان و کارمەندانی ئەو پیشەیە کاری جدی رۆژنامەوانانە، تەنها چەند لایەنێکی کەمی نەبێت کە لە رێگەی یاساوە رێکدەخرێ، دەبێت بەهێزترین گەرنتی یاسایی بۆ دەستەبەر بکرێ بۆ ئەوەی لە دەستوەردان و پێشێلکاریەکانی سیستەمی سیاسی پارێزراو بێت.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەو گەرنتیانە گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز و دەستوری ئەمریکی ساڵی (١٧٩٨) لەیەکەمین هەموارکردنی دا لە ساڵی (١٧٩١)، ئازادیی رۆژنامەوانی پاراستوە لە دەستوەردان و دەست درێژی دەسەڵات تێیدا هاتووە: " کۆنگرێس بۆی نییە هیچ یاسایەك دەربکات کە ئازادیی رۆژنامەوانی سنوردار بکات". بەرلەوەی باسی ئازادیی رۆژنامەوانی لە دەستوری ئەمەریکی بکەین چەند پرسیارێك لە خۆمان دەکەین و دەپرسین ئایا ئازادیی رەها هەیە تاکو ئازادیی رۆژنامەوانی هەبێت؟ ئەگەر هەیە، دەبێ ئەم ئازادییە لە کوێ بێت و روخسارەکانی چین؟ ئەی راستە لە ئەمەریکا رۆژنامە ئازادە و دەستور کەفالەتی دەکات و کۆنگرێسیش بۆی نییە یاسایەك دەربکات بۆ دیاریکردنی سنوری ئەم ئازادییە؟ ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێ رۆژنامەوانی لەو وڵاتە دەسەڵاتە؟ دەبێ شوێنی ئەو دەسەڵاتە لەنێو سێ دەسەڵاتە گشتییە تەقلیدییەکان — یاسادانان، جێبەجێکردن، دادوەری لە کوێ بێت

؟ ئەگەر وایە، کێن ئەوانەی ئەم دەسەڵاتە بەڕێوەدەبەن و چۆن ڕێکخراوەو ملکەچی چ بنەما و ڕێسایەکە ؟

ئازادیی ڕۆژنامەوانیەکێکە لە ئازادییە گشتییەکان و لقێکە لە لقەکانی مافی مرۆڤ ئەو مافانەش لە بنەرەتدا مافی سروشتین و لەگەڵ سروشتی مرۆڤایەتی مرۆڤ دەگونجێن، بەرلەوەی مرۆڤ بێتە ناو دەوڵەت ئەم مافانەی هەن و هەر لەگەڵ لە دایکبوونییەوە دەیبێ و تەنانەت هەندێك لەو مافانە هەر لەو کاتەی کۆرپەلەیەو لە ناو سکی دایکی دایە خوای گەورە پێی دەبەخشێت وەك مافی ژیان. بەڵام دوابەدوای هاتنەڕیزی کۆمەڵ، مرۆڤ بۆ ڕێکخستنی ماف و ئازادییەکانی بەمەبەستی پاراستنیان لە دەستدرێژی کەسانی تر پێویستی بە ڕێککەوتنێکی کۆمەڵایەتیی هەیە، چونکە پرۆسەکردنی ئەم ماف و ئازادییانە بەبێ ڕێکخستن دەبێتە هۆی ڕووبەڕووبوونەوە و بەگژیەکدا چوونیان، لەبەرئەوەی بەرژەوەندیی هەریەکێك لەو ئەندامانەی کۆمەڵ، خۆی لەخۆی دا ناکۆکە لەگەڵ بەرژەوەندی ئەوی تر. ڕاستیان وتووە ئازادیی هەرکەسێك لەو شوێنەوە دەستپێدەکات کە ئازادیی بەرامبەرەکەی لێ کۆتایی دێت. بەمشێوەیە بیرۆکەی دیالۆك و لێکحاڵیبوون و ئیتیکی قسەکردن دروستبووەو بەپێی ئەم ئیتیکەش ئەگەر دوو کەس کەوتنە بەرامبەر یەك، دەبێ یەکێکیان گوێگر بێ تا ئەوەی بەرامبەری قسەی خۆی تەواو دەکات، ئینجا ئەو قسە بکات و ئەویتر گوێگر بێت و بەمشێوەیە بیروڕا گۆڕینەوە دروستدەبێت.

مرۆڤ بە ئارەزووی خۆی دەستی لە هەندێك ماف و ئازادییەکانی خۆی هەڵگرتووە بە مەبەستی زامنکردنی بەشەکەی تری. ئەگەر وەهای نەکردبا دەبووە پاشاگەردانی و کەسیش خاوەن ماف نەدەبوو. هەروەکو لە پێشەوە وتمان بەرژەوەندی هەرتاکێك لە تاکەکانی کۆمەڵ لەگەڵ بەرژەوەندی ئەویتر ناکۆکە، چونکە هەرکەسێك لەوانە\ بە سروشت کۆمەڵێك غەریزەی هەیە وەك غەریزەی خۆویستی و چاولێکەری و شەڕانگێزی و چەندانی تر، ڕادە و دەسەڵاتی ئەم غەریزانەش بەسەر کەسایەتیی مرۆڤەوە لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر بە سروشت لێك جیاوازە، ئەم جیاوازییەی نێوان سروشتی کەسەکان وا لە مرۆڤ دەکات لە حاڵەتی سروشتی و دوور لە حوکمی یاسا و ئەقڵ ملکەچی ئەم غەریزانەی خۆی بێت و هەردەم بەرژەوەندی خۆی بخاتە پێش بەرژەوەندی کەسانی تر لە کاتی ناکۆك بوونی بەرژەوەندییەکەی لەگەڵ بەرژەوەندیی ئەواندا، کەواتە

بۆئەوەی کۆمەڵگەیەکی ئاسوودەو سەقامگیر لە ئارادا بێت کە هیواو ئاواتی مرۆڤە، دەستبەرداری نابێت، دەبێ ئەم ماف و ئازادییانە ڕێکبخرێن.

هەڵبەتە ئەم ڕێکخستنەش لە ڕێگای سنورداركردنی ئەو ماف و ئازادییانەوە دەبێت، وێڕای دانانی کۆمەڵێك ئەرك دەبێ هەر مرۆڤێك بۆ پرۆسەکردنی ئەو ماف و ئازادییانەی لە ئەستۆی خۆی بگرێت. بۆیە هیچ ماف و ئازادییەك بەبێ ئەرك نییە.

پانتایی ئەم ماف و ئازادیی و ئەرکانە لە هەموو کۆمەڵگەیەك وەکو یەك نین، لە کۆمەڵگەیەك بۆ کۆمەڵگەیەکی تر دەگۆڕێن بەپێی گۆڕانی فەلسەفەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی ئەو کۆمەڵگەیە. کە دەڵێین کۆمەڵگە مەبەست کۆمەڵگەی سیاسییە واتە وڵات.

لە وڵاتە سەرکوتکارەکاندا، بەچاوی کۆیلە تەماشای مرۆڤ دەکەن و بەکاریدەهێنن بۆ خزمەتی حوکمڕانان، هیچ سەنگێك بۆ ماف و ئازادییەکانی دانانێن، بۆیە ئەوەندەی کە دانیشی پیانراوە شتێکی ڕواڵەتییە بۆ خزمەتی خۆیاندانیان پێداناوە نەك خاوەنەکانیان، بەڵام لە وڵاتە دیموکراتی ەکاندا، ئەم تێڕوانینە جیایە و بە چاوی ڕێزەوە سەیری مرۆڤ دەکەن و بە بنچینەی کۆمەڵگەی دادەنێن، بۆیە گشت هەوڵ و تەقەلایەك بۆ ئاسوودەیی و بەختەوەری ئەو دەخرێتە گەر. ئەمە وا دەخوازێ کە دان بە ماف و ئازادییەکانی لە بەرزترین ئاستیدا بنرێت.

ئەمەی سەرەوە نموونەی دوو کۆمەڵگەی سیاسیی لەیەك جیاوازن، لەیەکەمیان ماف و ئازادییە گشتییەکان بە ئازادیی ڕۆژنامەوانی شەوە بوونیان نییە، لە دووەمدا بواری ئەو ماف و ئازادییانە هێندە فرەوانە و گەیشتۆتە ڕادەی زیادەڕۆیی کە مەحاڵە لەم سەردەمە پڕ گرفت و کێشە و ئاڵۆزییەدا بەدی بهێندرێت.

بۆیە دەبینین، ئەمڕۆکە هیچ مافێك ڕەها نییە تاکو ئازادیی ڕۆژنامەوانی ڕەها بێت. بە لکو لە ڕوانگەی ئەخلاقی پیشەو دابونەریت و بەرژەوەندییە باڵاکانی هەر کۆمەڵێك سنور بۆ ئەم ئازادییە دانراوە و دەبێ ڕۆژنامەوان پابەندیان بێت. کەواتە، دەتوانین بڵێین ڕوخسارەکانی ئازادیی ڕۆژنامەوانی لەم سەردەمەدا بریتییە لە ملکەچ بوون بۆ بنەماکانی کێبڕکێ کردن و ڕەچاوکردنی دابونەریت و بەرژەوەندییە باڵاکانی کۆمەڵ و ئەخلاقی پیشەی ڕۆژنامەوانی.

بەپێی ئەم بۆچوونە هیچ ئازادییەك ڕەها نییە بەڵكو ئەرك و بەرپرسێتیی كۆمەڵایەتیی لەگەڵدایە و هەر تاكێك دەبێ لە خۆیەوە دەستپێبكات و بەرپرسیارییەتی ڕۆژنامەوانیش لە چوارچێوەی ئەم بۆچوونەدا بەرپرسیارتییەكی گرینگانەكراوە. كەواتە بەپێی ئەم بۆچوونە، ڕۆژنامەوانی مافی ئەوەی هەیە ڕەخنە لە حكومەت و دامودەزگاكان بگرێت، بەڵام لە هەمان كاتدا چەندین بەرپرسیارییەتی بنچینەیی دیاریكراویی لە ئەستۆیە بۆ ئاسوودەیی و سەقامگیریی كۆمەڵ دەبێ ڕەچاویان بكـــات، لە ئاكامی ئەم بۆچوونەدا كە ڕەواجێكی باشی لەلای حكومەتە سەرمایەدارەكانەوە هەبوو، لە بەریتانیا و ئەمەریكا و هەندێ وڵاتی تر، بۆ دانان و دیاریكردنی ئەخلاقی پیشەی ڕۆژنامەوانی و سەرپەرشتی كردنی ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەوانی دامەزرا. هەروەها میسر و لوبنان و سوودانیش هەرچەندە وڵاتی سەرمایەداری نین و دیموكراتییەت و مافی مرۆڤیش تێیدا وەكو پێویست بەرقەرار نەبووە بەڵام سەرەڕای ئەمە ئەنجومەنێكی باڵای ڕۆژنامەوانی وەك ئەو وڵاتانە و نیمچە سەربەخۆ بۆ بەڕێوەبردن و سەرپەرشتی پیشەی ڕۆژنامەوانی دامەزراوە تێیدا.

هەر وەكو لە پێشتر ئاماژەمان پێكرد، ئەمڕۆكە باشترین تیۆر لە تیۆرەكانی ڕۆژنامەوانی (تیۆری بەرپرسیارێتیی كۆمەڵایەتیی)یە ئازادیی ڕۆژنامەوانی لە وڵاتە دیموكراتی ەكاندا لەبەر ڕۆشنایی ئەم تیۆرە ڕێكخراوە.گومانیشی تێدا نیە، هەروەكو چۆن ئەم تیۆرە بەهەوڵ و تەقەللای لیژنەی ئازادیی ڕۆژنامەوانی و لە ئاكامی نووسینەكانی (ولیەم كنج و جۆن ملتۆن) لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا سەریهەڵدا، ئەوهاش ئەو وڵاتە دەستپێشخەر بووە لە شۆڕش دژی داگیركەری ئینگلیزو پێش فەڕەنساش پەیامی مافەكانی مرۆڤی دەركردوە، لەم سەدەیەدا پێشڕەوێتیی كۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لەم ڕووەوە دەكات و داڕێژەری سیستەمی جیهانی نوێیە، ئەو سیستەمەی لەسەر بنەمای مافی مرۆڤ و دیموكراتییەت دامەزراوە، هەربۆیە شتێكی سەیر نیە دەستوری ئەمریكی دان بەم ئازادییە بنێت و كەفالەتیشی بكات. هەرچەندە، ئێمە پێمان وایە، ئەمەریكا ئەوەندەی بە پەرۆشە بۆ دابینكردنی زۆرترین بری ئەو ئازادییانە بۆ هاووڵاتیانی خۆی هێندە باوەڕی بە ئازادیی گەلانی تر نیە. فشار خستنە سەر ئەمیری قەتەر و كەناڵی ئاسمانی جەزیرە بۆ دوورخستنەوەی فەیسەڵ قاسم لە

پرۆگرامەکانی لە کۆتاییەکانی سەدەی ڕابردوو هەروەها قەدەغە کردنی پەخشکردنی وتارەکانی ئوسامە بن لادن ئەم بۆچوونەمان دەسەلمێنن.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە یەکەمین هەموارکردنی دەستورەکەیدا لە ساڵی (١٧٩١) لەژێر ناونیشانی بەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤ لە مادده (١) ی دا داناوە بە ئازادیی ڕۆژنامەوانیدا وتێیدا هاتووە (کۆنگرێس بۆی نیە هیچ یاسایەك دەربکات.. سنور بۆ ئازادیی وشە دابنێ، یان ئازادیی ڕۆژنامەوانی، یان مافی خەڵك بۆ کۆبوونەوە لە کەشوهەوای ئاشتیدا، هەروەها لە بەرزکردنەوەی سکاڵا بۆ حکومەت بۆ لابردنی ئەشکەنجە).

ئەگەر سەرنجی ئەم دەقە دەستورییە بدەین، یەکەمجار وادێتە بەرچاو لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئازادییەکی ڕەهای وشەو ڕۆژنامەوانی هەبێت و بە پێچەوانەی ئەویش لە هەندێ وڵاتی دیکەدا ئەم ئازادییە نەبێت. کەچی بە تێڕامان وقوڵ بوونەوە لە هۆی ئەم حوکمە و مەبەستی یاسادانەری ئەمریکی، بۆمان بە دەردەکەوێ مەسەلەکە وا ئاسان نییە تا بە بەڵێ یان نەخێر، ئازادیی هەیە یان نییە وەڵامی بدەینەوە. بەڵکو لە هەموو وڵاتێکدا سەرەڕای دانپێانان بەم ئازادییە، سنورێك لە بەردەم پرۆسەکردنیدا دادەندرێ ومەرج نییە تەنانەت ئەو بڕە مافەی دانیشی پیانراوە لە هەموو کات و ساتێکدا کاری پێ**بکرێت**. بەڵام جیاوازی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو وڵاتانی دی لەو ڕووەوە لەوەدایە، بەپێی حوکمەکانی دەستوری ئەمریکی، حکومەت بۆی نیە بە ئارەزووی خۆی کۆتوبەند بەسەر ئەم ئازادییەدا بسەپێنێ، بەڵکو سنوری دەسەڵاتی لەم بارەیەوە دیارە و لە تەسکترین چوارچێوەدا بۆی هەیە ئەمە ئەنجام بدات. کەواتە دەستەواژەی (کۆنگرێس بۆی نییە هیچ یاسایەك دەرکات.. سنور بۆ ئازادیی وشەو ڕۆژنامەوانی دابنێ..) ئەوە دەگەیەنێ کە حکومەت بۆی نیە هیچ کۆتوبەندێکی پێشین لە بەردەم ئازادیی وشە دابنێ.

بەم پێیە مرۆڤ ئازادە چی بنووسێ و چی بڵاو بکاتەوە بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ حکومەت و ڕەزامەندی ئەو وەربگرێ لەسەر ئەوەی کە دەینووسێ یان بڵاوی دەکاتەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم ئازادییە ئەوە ناگەیەنێ دوورە لە لێپرسینەوە. بەڵکو هەمووکاتێك دەبێ ئەوەی لە خەیاڵ بێت بەرپرسە لەسەر هەموو قسەیەك کە دەیکات

یان دەینووسێ یان بڵاوی دەکاتەوە، ئەم بەرپرسیارییەتیەشی گریمانەکراوە و دەبێ خۆی هەستی پێبکات.

بەپێی یەکەمین هەمواری دەستوری ئەمەریکی ی ساڵی (١٧٩١) کەتایبەتە بە بەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤ، هەر لەو ڕۆژەوە ڕۆژنامەوانی بووە هێز و خاوەن ڕای خۆی. ئەمڕۆکەش ئازادیی ڕۆژنامەوانی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا زۆرجاران بە دەسەڵاتی چوارەم ناوی ئەبردرێت و هەربەم ناوەش دەناسرێت، ئەم ناوە ئەوە دەگەیەنێ، کە ڕۆژنامەوانی لەو وڵاتەدا شانبەشانی سێ دەسەڵاتەکەی تر بەشداری دەکات لە حوکمڕانێتی وڵات. کێشە ئابڕووبەرەکەی (ۆتەرگێت) باشترین نموونەی هێزی ڕۆژنامەوانیە وەك دەسەڵاتێکی چوارەم لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. ئەم کێشەیە، دوو ڕۆژنامەوانی ئەمەریکی لە ڕۆژنامەی ((واشنتۆن پۆست)) ورووژاندیان و ئاشکرایان کرد، بووە هۆی دەست لەکار کێشانەوەی سەرۆکی پێشووی ئەمەریکی نیکسۆن، و دەرچوونی لە کۆشکی سپی بەرلەوەی ماوەی سەرۆکایەتییەکەی تەواوبێت.

ئەگەر سەرنجی ئەو بڕگە جیاجیایانە بدەین لەیاسای ئەمریکی سەبارەت بە دانانی کۆتوبەند لە بەردەم ئازادیی ڕۆژنامەوانی، بەراوردی بکەین لەگەڵ پانتایی ئەو ململانێ درێژخایەنەی ڕۆژنامەوانی لەگەڵ حکومەت دەیکات بێ ئەوەی ڕووبەڕووی لێپرسینەوە بێت، دەبینین دادگا وەك دەسەڵاتێکی سەربەخۆ، هەروەکو لە ماددە سێی دەستوری ئەمەریکیدا هاتووە، هەمیشە پاڵپشتێك بووە بۆ دەسەڵاتی ڕۆژنامەوانی و باشترین زەمان بووە بۆ ئەم ئازادییە.

ئەو کێشە گرینگانەی بەرزبوونەتەوە بۆ بەردەم دادگا، ڕێگا خۆشکەربوون بۆ پتەوکردنی ئازادیی ڕۆژنامەوانی، تایبەت بوون بە بەدواداچوونی زانیاری و بڵاوکردنەوەی بەڵگەنامە حکومییەکان یان ئەو زانیارییانەی

کەسایەتیە گشتییەکان لە بەرچاوی خەڵك دادەبەزێنێ. بۆ نموونە، دادگای باڵای ئەمەریکی خۆی خستەپاڵ ڕۆژنامەوانی دژی حکومەت لە مەسەلەی ڕێگادان بە ڕۆژنامەکان بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو بەڵگەنامە حکومییانەی کە دواتر بە بە بەڵگەنامەکانی (پنتاگۆن) ناسران.

ڕۆژنامە ئەمەریکاییەکان ئەم بەڵگەنامە نهێنیانەی شەڕی ڤێتنام دوای ئەوەی بە شێوەیەکی نارەسمی دەستکەوت، سەرەڕای لاری بوونی حکومەت بڵاویانکردەوە. هەروەها

دادگای باڵای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەپێی یەکەمین هەمواری دەستور بڕیاری لەسەر چەند حەسانەتێك لە یاساکانی ناوزڕاندندا، بۆ ئەوەی ڕۆژنامەوان و دەزگاکانی میدیا دەستهەڵگرن لە بڵاوکردنەوەی تەواوی ئەو ڕاپۆرتانەی تایبەتن بە کاروبارە گشتییەکان بۆ ڕزگاربوون لە ڕووبەڕووبوونەوەی داوای دادگایی و ئەگەری دانی قەرەبووی دارایی. بۆ ئەوەی کەسایەتییەکی گشتی سکاڵای ناوزڕاندن لە ڕۆژنامەیەك یان هەر کەناڵێکی میدیا بباتەوە، دەبێ بوونی (نیازخراپی) لە پشت ئەم بڵاوکردنەوەیە بسەلمێنێ.

دادگاکان بڕیاریاندا ئەوکاتە (نیازخراپی) لە پشت بڵاوکردنەوەکەدا دەبێ بابەتەکەی بڵاوکردۆتەوە بزانێ ئەو زانیارییانەی بڵاوی کردوونەتەوە درۆیە یان لە ئەنجامی کەمتەرخەمی ئەو ڕۆژنامەیە یان کەناڵەوە بووە کە لە بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتە تەئکیدی نەکردوە کە ئایا ئەو زانیارییانە ڕاست و دروستن یان نادروست. هەڵبەتە ئەرکی سەلماندنی (نیازخراپی) ڕۆژنامەو کەناڵەکان لە بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان ئەرکێکی قورسە و دانانی ئەم ئەرکە لە ئەستۆی کەسایەتییە گشتییەکان خۆی لەخۆیدا خزمەتکردنی ئازادیی ڕۆژنامەوانی و پاراستنیەتی لە دەسەڵاتی حکومەت.

سەربەخۆیی ڕاستەقینەی دادوەرانی فیدراڵی لە ئەمەریکا، ڕەگەزێکی سەرەکییە بۆ پەرەپێدانی ئەو حەسانەتە یاساییانەی ڕۆژنامەوان و کەناڵەکانی تری میدیا سوودی لی وەردەگرن. سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دادوەرانی فیدراڵی بە ڕەزامەندی ئەنجومەنی پیران دادەمەزرێنێ. بەڵام دوای دەرچوونی ڕەزامەندی لەسەر دامەزراندنیان، ئەوکەسانە تاکو مردن لە پلەوپایەی خۆیان دەمێننەوە، پارێزراویشن لە ئەگەری هەر پاڵەپەستۆیەکی دەرەکی ڕەنگە لەلایەن بەرپرسێکی حکومەت یان دەسەڵاتی یاساییەوە بخرێتە سەریان، هەروەها نابێ مووچە و دەرماڵەیان کەمبکرێتەوە یان لەبەر ئەم هەڵوێستەیان پلەوپایەیان لێ بسەندرێتەوە.

سەرەڕای ئەوەی لە دەستوری ئەمەریکا ئازادیی ڕۆژنامەوانی وەك دەسەڵاتێکی گشتی ناوی نەهاتووە، بەڵام دوابەدوای یەکەمین هەمواری ساڵی (١٧٩١) و دەستەبەرکردنی گرێنتی بۆ ڕێگاگرتن لە کۆنگرێس بۆ سنوردارکردن و دانانی کۆتوبەند لە بەردەم ئازادیی ڕۆژنامەوانیدا، هەروەها دەستەبەرکردنی حەسانەتی دادوەری لەلایەن دادگای باڵاو دادگاکانی تری ئەمەریکی، دەتوانین بڵێین ئازادیی ڕۆژنامەوانی هیچی لە سێ دەسەڵاتە گشتییەکەی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەری کەمتر نییە، بەڵکو لە

هەندێ کاتدا لەوانیش کاراتر و کاریگەرترە، چونکە چۆن چاودێرە بەسەریانەوە ئەوهاش کاریگەری هەیە لە دروستکردنی ڕای گشتی و دروستکردنی بڕیارە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی و یاساییەکانی وڵات، هەربۆیە هەندێ کەس تەنانەت بە دەسەڵاتی دووەم ناوی دەبەن. دوابەدوای ئەوەی کە بۆمان دەرکەوت لە ئەمەریکاو ئەو وڵاتانەی باوەڕیان بە دیموکراتییەت یێکی ڕاستەقینەو تەواو هەیە، ئازادیی ڕۆژنامەوانی دەسەڵاتێکی سەربەخۆو جیاوازە لە سێ دەسەڵاتە گشتییەکەی تری وڵات، با بزانین کێن ئەوانەی ئەو دەسەڵاتە بەڕێوەدەبەن و ئەو بنەمایانە کامانەن کە کاری ئەم دەسەڵاتە ڕێکدەخەن.

لە ئەمەریکاو ئەو وڵاتانەی کە ڕێچکەی ئەویان گرتۆتەبەر بۆ دەستەبەرکردنی زۆرترین بری ئازادیی بۆ وشە و ڕۆژنامەوانی، هەروەها بەمەبەستی پاراستنی ڕۆژنامەوانی لە دەست تێوەردانی حکومەت و دەسەڵاتی یاسادانان و دەستەبەرکردنی زۆرترین بڕی ئازادیی بۆ پرۆسەکردنی ڕۆژنامەوانی، لە ڕێگای ئەنجومەنێکی باڵای ڕۆژنامەوانییەوە ئەم دەسەڵاتە بەڕێوە دەچێ، هەروەها لە ڕێگای دانانی کۆمەڵێك بنچینەی ئەخلاقییەوە کە پێی دەوترێ (بەڵگەنامەی شەرەفی ڕۆژنامەوانی) لەلایەن ئەنجومەنی باڵای ڕۆژنامەوانییەوە دادەندرێن بۆ پرۆسەکردنی ئەم پیشەیە، کاری ڕۆژنامەوانی ڕێکدەخرێ.

## میدیا وەك پردی پەیوەندیی نێوان ڕای گشتی و سیستەمی سیاسی

پەیوەندیی نێوان ڕۆژنامەوانی و سیستەمی سیاسی هەر وەکو توێژینەوەکانی بواری زانستی سیاسی، پەیوەندیکردنی سیاسی و کۆمەڵناسی سیاسی، جەختی لەسەر دەکەنەوە پەیوەندییەکی پتەو و کارلێکردنی **دوولایەنەیە**، گرنگی ئەو پەیوەندیە لەوەدایە ڕۆژنامەوانی ئەڵقەی بە یەکگەیاندنی دەسەڵاتە بەجەماوەر، ئەو پەیوەندیە بە درێژایی مێژووی سەرهەڵدانی ڕۆژنامەوانی بی گرفت نەبووە و کرۆکی ئەو گرفتە لەوەدایە ئایا ڕۆژنامەوانی دەکرێ **بکرێتە** بڵندگۆی سیاسەت، یان بە پێچەوانەوە ببێتە بڵندگۆی میللەت بۆ لێپێچینەوە لە دەسەڵات؟

هەموو تیۆرەکانی ڕۆژنامەوانی بە پلەی یەکەم ویستویانە سروشتی ئەو پەیوەندییە دیاری بکەن هەریەك لە گۆشەنیگایەك و لەژێر کاریگەری هەلومەرجی سیاسی و ئابووری ئەوکاتە، تیۆری دەسەڵات و ئیشتیراکیەت بە ئاڕاستەیەك دەروات

ڕۆژنامەوانی ئامرازێکی دەستی سیاسەت و ڕەنگدانەوەی ستراتیژ و بەرژەوەندی و ئایدۆلۆژیای سیستەمی سیاسی بێت بۆ جۆشدان و ئاراستەکردنی جەماوەر بەوشێوەیەی دەسەڵاتی سیاسی دەیەوێ، دواتر ئاراستەیەك پەیدابوو وەك کاردانەوەیەك بوو لە بەرامبەر تیۆرەکەی پێشوو، بانگەشەی لیبرالێیەتی ڕەهای دەکرد و هەموو سنورردارکردنێکی ڕەهای رەت دەکردەوە لەلایەن سیستەمی سیاسی، پاشان تیۆری دیکە پەیدابوو کە هەوڵی هاوسەنگی و سنورردارکردنی ئەو ئازادییەی دەدا لە پێناو تەوزیفکردنی بۆ خزمەتی بەرژەوەندی گشتی.

دامەزراوە سیاسی و ڕۆژنامەوانییەکان لە ئاستە جیاوازەکانیاندا لە کارلێکردنی ئاسۆییدان بە مەبەستی سازدانی پەیامی پرۆسەی پەیوەندیکردن، ئەگەرچی هەردوو دامەزراوەکە لە ڕووی سروشتی پێکهاتن و ئامانجی کارەوە لە یەکتر جودا و سەربەخۆن، بەڵام کاتێك دێینە سەر باسی پرۆسەیەکی لەمجۆرە هاوراییەك دروستدەبێت لە بڵاوکردنەوە و بەگەڕخستنی زانیارییەکان بۆ جەماوەر، کارلێکردنی بەردەوامی نێوان پێکهاتە سەرەکییەکانی ئەم پرۆسەیە پەیوەستە بە ڕادەی بە هێزی ئەو پەیوەندییانە، لەوە سەرچاوەی گرتووە هەردوولا بە کۆمەڵە ئەرکێکی گرنگ و ئاشکرا هەڵدەستن لەناو کۆمەڵگە.

ئەگەر بەهێزی و چەسپاوی دامەزراوە سیاسییەکان لە کۆمەڵگەدا مەسەلەیەکی یەکلاکەرەوە و جێگای گومان نەبێت، ئەوا هەندێك هەن لە بەهێزی دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان و چەسپاویان لەناو کۆمەڵگەدا گومان دەکەن، لەو سۆنگەیەوە دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان دامەزراوەی لاوەکین و هەمیشە پشت بەغەیری خۆیان دەبەستن لە دامەزراوە ئابووری و سیاسییەکانی تر بۆ دەستخستنی سەرمایەو هەروەها هەواڵ و زانیاری، لەبەرئەوە مومارەسە و دەسەڵاتەکانی ئەو دامەزراوەیە سنورردارکراوە بە ژمارەیەکی زۆر لە فاکتەری سیاسی و ئابووری و تەکنەلۆژی و کولتوری لە کۆمەڵگە، سبسنەر دەڵێت "پێشکەوتووترین قۆناغی پێشڤەچوونی کۆمەڵگە ئەوکاتەیە تاك و کۆمەڵ و دامەزراوەکان لە ڕووی سیاسی و ئابوورییەوە ئازادبن، هەر کاتیش کۆمەڵگە ئازادیی سیاسی و ئابووری بەدەستهێنا ئەوا بێگومان دەسەڵاتی دەوڵەت بەسەر تاك و دامەزراوەکان سنورردارتر دەبێت"

لەم ڕوانگەیەوە ئەگەر دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان لە ڕووی ئابووری و سیاسییەوە سەربەخۆبوون و ئازادانە کاریانکرد، هەروەك زۆرێك لە کۆمپانیا و دامەزراوە زەبەلاحەکانی میدیا لە جیهاندا، ئەوا دەتوانن ڕۆڵی گەورە و کاریگەر لە ئاڕاستەکردنی جەماوەر و گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگە بگێڕن و ئەو وەختەش ناتوانین بە دامەزراوەی لاوەکی وەسفی بکەین. دەروازەی سەرەکی و هەوێنی لە دایکبوونی ئەو ئازادییە سیاسی و ئابوورییە لەو کولتووره سیاسییە زاڵ و باوە کورت بۆتەوە لە فیکر و مومارەسەی سیستەمی سیاسیدا جێگیر بووە و سەرچاوەی ئاڕاستەکردنیەتی. بە دیوەکەی تر دەتوانین بڵێین لە سایەی کولتوری داخراو و تۆتالیتاریدا ئاشکرایە ڕۆڵ و پێگەی دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان نەك هەر تەنها لاوەکی و سەرەتاییە، بەڵکو کەرەستە و میکانیزمێکی پڕوپاگەندە و بانگەشە و چەواشەکردنیشە.

ئەگەر قسە لەسەر دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکانی کوردستان بکەین لە ساڵانی دوای وەستانی شەری ناوخۆییدا بەشی هەرە زۆری ڕۆژنامەکان سەرچاوەی پارەدارکردنیان بە پلەی یەکەم لە حیزبەوە بووە بە پلەیەکی کەمتریش حکومەت، لەبەرئەوەی لە بنچینەدا ئەو ڕۆژنامانە بۆ ئەوە دەردەچن تا لە چواچێوەیەکی دیاریکراودا خزمەت بە ئامانج و سیاسەتەکانی حیزب و حکومەت بکەن، تا ئەو شوێنە ئازادن لە گەیاندنی هەواڵ و زانیاری و خستنەڕووی تێڕوانینی جیاواز زیان لە بەرژەوەندیدا و شۆرەتی حیزب و حکومەت نەدات، لەبەرئەوە ڕۆژنامەکانی کوردستان توانای ئەوەیان نەبووە چاوەدێری کارەکانی حکومەت بکەن و دەسەڵات ناچاربکەن شەفاف بێت و ڕووبەڕووی لێپێچینەوەی بکات لە کاتی خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و داهاتی گشتی یاخود لە کاتی پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ یان لەوکاتەی ئاڕاستەکانی ڕای گشتی لەلایەن دەسەڵاتەوە فەرامۆش دەکرێ. بۆیە لەم چەند ساڵەی ڕابردوو ڕۆژنامەوانی کوردی هێشتا لە بازنەی دامەزراوەیەکی لاوەکیدا بووە و پێویستی بە کرانەوەی زیاتری هەلومەرجی سیاسی و ئابووری و فەرهەنگی هەیە تا بتوانێ لە دەرەوەی خواست و هەژموونی سیستەمی سیاسی ڕۆڵ و ئەرکەکانی پیادەبکات، دواجار کاریگەری لەسەر کار و بڕیارەکانی دەسەڵاتی سیاسی دروستدەکات.

بە سەرهەڵدانی ڕۆژنامەوانی ئەهلی و زیادبوونی ژمارە و فرەوانبوونی ئاستی خوێنەر و کاریگەریان، گۆڕانێکی گەورە بەسەر ژێرخان و کوی سیستەمی ڕۆژنامەوانی کوردی هات، ئەگەرچی ئەو گۆڕانە لە هەنگاوە سەرەتاکانیدایە، لەژێر فشاری گومان لە

سەربەخۆیی بوون و هەڕەشە و پێشێلکاری دەسەڵات و ئەو کەموکوڕیانەی لە ئەدای پیشەیی ئەو ڕۆژنامانەدا بە دەردەکەوێ، هێشتا سیما و روخساری ڕۆژنامەوانی ئەهلی بە تەواوەتی گەڵاڵەبووە.

**سروشتی پەیوەندی نێوان ڕۆژنامەوان و سیاسەتمەدار**

دوای ئاماژە کردن بە ڕۆڵی دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان لە پرۆسەی سیاسی بە شێوەیەکی گشتی و ڕۆڵی دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکانی کوردستان، لەبەر رۆشنایی ئەو ئاماژەیەش پێویست دەکات قسە لەسەر سروشتی ئەو پەیوەندییە بکەین ڕۆژنامەوان و سیاسەتمەدار بەیەك دەبەستێتەوە.سروشتی ئەو پەیوەندیەش لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا بە کوردستانەوە بابەتی چەندین لێکۆڵینەوە و توێژینەوە بووە لەوانە (گوریفتش و بلومەر و ئیتزوێنی)، دوو نموونەیان بۆ شرۆڤەکردنی ئەو پەیوەندییە پێشکەشکردوە :

**١ـ** نموونەی یەکەم ئەوەیە دامەزراوە ڕۆژنامەوانی و سیاسییەکان لە باری کارلێکردنێکی بەردەوامدان بۆ بەگەرخستن وبلاوکردنەوەی زانیاری لە جەماوەرەوە بۆ جەماوەر.

**٢** ـنموونەی دووەم نموونەی ئیتزۆێنییە باس لەملکەچی و گوێرایەڵی ڕۆژنامەوان و دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان دەکات لە هەڵسوکەوتەکانیدا بۆ سیاسەتەکانی حکومەت و دامەزراوە سیاسییەکان، ئەم ملکەچیەش لە ڕێگەی هۆکارە ماددی و رەمزییەکاندا دێتەکایەوە.

لە ڕاستیدا ئەو لێکدانەوانەی پێشوو لەسەر زۆربەی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا وەکو یەك بە هەمان ڕێژە و پلە جێبەجێ نابێت، چونکە هەر کۆمەڵگەیەك هەلومەرج و پێوەری تایبەت بە خۆی هەیە لە چوارچێوەیدا سروشتی ئەو پەیوەندییە گەڵاڵەدەبێت.

بەڵام ولیامز (williams) بەوشێوەیە وەسفی ئەو پەیوەندییە دەکات لە نێوان ڕۆژنامەوانان و سیاسەتمەداران بەوەی پەیوەندییەکی باوکسالاریە ( media paternalism) ئەمە تێگەشتنێکی مامناوەندیە لە نێوان تێگەیشتنی سیبیرت(siebert) کە باس لە سانسۆری دەسەڵات لەسەر ڕۆژنامەوانی دەکات لەگەڵ ئەو تێگەیشتنەی باس لە دەستوەرنەدانی حکومەت دەکات لە هۆکارەکانی میدیا،

تاڕادەیەکی زۆر دەتوانین بڵێین ئەو پەیوەندییەی لە نێوان ڕۆژنامەوان و سیاسەتمەدار هەیە لە کوردستان پەیوەندییەکی باوکسالارییە و حاڵەتێکە لە نێوان سانسۆری بەرفرەوان و ئازادیی تەواودا.

## ڕۆڵی جەماوەر و پەیوەندیی بە ڕۆژنامەوان و سیاسەتمەدار

ڕۆڵی جەماوەر "Audience roles"

ئەو ڕۆڵەی جەماوەر دەیبینێت لە ئاست پەیام و ناوەڕۆکی ڕۆژنامەوانی، لە چوارچێوەی پرۆسەی پەیوەندیکردنی سیاسی شێوەی جیاواز وەردەگرن، دەکرێ بە شێوەیەکی گشتی بۆ چوار جۆر پۆلێنیان بکەین:

### ١- ڕۆڵی حزبیی بوون "partisan"

ئامانجی سەرەکی ئەو کەسە بریتییە لە گەڕان بەدوای ئەو پەیامانەی بیروباوەڕە سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکانی بەهێزتر دەکەن.

### ٢- ڕۆڵی لیبراڵ و سەربەخۆ "Liberal"

ئامانجی ئەو کەسە ئاراستە پێدانی خوێندنەوە و تێڕوانینە سیاسییەکانیەتی لە ڕێگەی پەیامەکانی ڕۆژنامەوانیەوە.

### ٣- ڕۆڵی چاودێر " Monitar "

ئەو کەسەیە دەگەڕێ بەدوای زانیاری ئەوتۆ سەبارەت بە تایبەتمەندییەکانی ژینگەی سیاسی، لەوانە کێشە هەنوکەییەکان و سیاسەتە پێشنیار کراوەکان و بیروبۆچوونی سیاسەتمەدارەکان.

### ٤ ـ ڕۆڵی سەیرکەر یاخود بینەر "Spectator"

ئەو کەسەیە زیاتر خەمی تێرکردنی حەزو ئارەزووە کەسایەتییەکانی خۆیەتی، زۆر گرنگی نادات بە هەواڵ و زانیاری سەبارەت بە پێشهاتەکانی ڕەوشی سیاسی ناوخۆ و دەرەوە.

دەتوانین بڵێین پرۆسەی پەیوەندیکردنی سیاسی بەگوێرەی تیۆری ڕۆڵ دەروات بەرێوە، بۆ نموونە لەوانەیە ڕۆڵە جیاواز و پێشوەختەکانی جەماوەر هاوشێوەی هەبێت لەو ڕۆڵەی ڕۆژنامەوان و سیاسەتمەدار دەیبینێت. هاوڵاتی حزبیی کە ئارەزووی بەهێزکردنی بیروڕاو ئایدیۆلۆژیای حزبەکەی دەکات دەتوانین لەسەر ئاستی ڕۆژنامەوانی هاوجۆرەکەی بەدی

بکەین کە ڕۆژنامە حیزبییەکانن و ڕۆڵی ئاڕاستەکردن و ڕێپیشاندان دەبینن و لە بەرامبەریدا هاوشێوەی ئەو ڕۆڵە لەسەر ئاستی سیاسەتمەدارەکان هەیە، ئەو سیاسەتمەدارانەن ڕۆڵی تەبەنیکردنی کێشەیەك یان ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو دەبینن و هەوڵی ڕەواج پێدانی دەدەن لە ناو جەماوەر. لە یەکچوون و هەماهەنگی ڕۆڵی جەماوەر لەگەڵ ڕۆڵی ڕۆژنامەوان و سیاسەتمەدار پێوەرێکە بۆ دەرخستنی مسداقیەتی دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان لەلایەك و متمانەبوون بە سیاسەتمەداران لەلایەکی دیکەوە، لە کاتێکدا دووری و نەبوونی پانتایی هاوبەش لە نێوان ڕۆڵەکانی جەماوەر لەگەڵ ڕۆڵەکانی سیاسەتمەدار و ڕۆژنامەوان پێوەرو ئاماژەیە بۆ شکستی هەردوو دامەزراوەی ڕۆژنامەوانی و سیاسی یان لانی کەم یەکێکیان لە بینینی ڕۆڵی خۆیان، **گرنگیدانی**ان بە شێوەیەك، کە بگونجێت لەگەڵ خواست و پێویستییەکانی جەماوەر.

لەو سیستەمە ڕۆژنامەوانیانەی لە ئاستێکی بەرزی سەربەخۆیدان، ڕۆژنامەوان زیاد لە ڕۆڵێك دەبینێـت، ئازادیی شە لە بینینی، ئەم فرە ڕۆڵ بینینەی ڕۆژنامەوانیش کاریگەری ڕاستەوانەی دەبێت لەسەر زیادبوونی ڕێگاکانی بەردەم جەماوەر بۆ بینینی هەر کام لەم ڕۆڵانە کە لەگەڵ مەیل و ئاڕاستەکانی ئەودا دەگونجێت. لێرەدا سیاسەتمەدارەکان ناچاردەبن، لە چوارچێوەیەکی فرەیی و کرانەوە دا مامەڵە لەگەڵ ئاستە جیاوازەکانی ژیانی سیاسی و فیکری، لەم سیستەمانە جیاوازی دەبینی لە نێوان ڕۆژنامەوان و سیاسەتمەدار.

کاتێك خزمەتگوزاری گشتی باڵ دەکێشێ بەسەر ئامانجی دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان، ڕۆژنامەوان زیاتر مەیلی چاوەدێری دەکات، کەهاندەری زیاتری جەماوەرە، بۆ چاوەدێری و گەڕان بەدوای مەعریفەی سیاسیدا. **وادەکات** فشار لەسەر سیاسەتمەدار زیاد بێت و ناچاری بکات زانیاری زیاتر بدات بە جەماوەر کە بەدوای دادەگەڕێن.

کاتێکیش دامەزراوە سیاسییەکان دەست دەگرن بەسەر دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکاندا، تەنها ڕۆڵێك دەمێنێتەوە لە بەردەم سیاسەتمەدار ئەویش گرتنە بەری باوەڕ و ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو، ڕەواج پێدانی ئەو ئایدۆلۆژیایە لەناو جەماوەر، کاریگەری لەسەر ڕۆڵەکانی ڕۆژنامەوان دەبێت لە ئاڕاستەکردنی ڕای گشتی لە ڕێگەی وتارە نووسراوەکان لە چوارچێوەی ئەو ئایدۆلۆژیایەوە ڕۆڵی جەماوەریش پەیڕەوکردنی ڕۆڵی حزبی و لایەنگری سیستەمی سیاسی دەبێت. بۆیە کاتێك خۆسەپێنی

دەسەڵات لەسەر دامەزراوە ڕۆژنامەوانییەکان زیاد دەکات لە بەردەم دوو ئەگەر داین، یەکەمیان: جەماوەر شوێن کەوتووی ئەو ڕۆڵانە دەبێت کە ڕۆژنامەوان پێشکەشی دەکات بە تایبەتی ڕۆڵی حزبی، دووەمیش: جەماوەر ڕەتی ئەو ڕۆڵە بکات و ململانێ لە نێوان ڕەگەزەکانی سیستەم دروست بکات. لە کوردستان ئامار و ڕاپرسی ئەوتۆمان لە بەردەست نییە جەماوەری کوردی بە شێوەیەکی گشتی کام ڕۆڵ دەبینێت بەڵام ئاڕاستەیەکی دیار هەیە لەلایەن جەماوەر بۆ گرنگیدان بە ڕۆژنامەی سەربەخۆ و دەستخستنی هەواڵ و زانیاری، لەژێر فشاری ئەم ئاڕاستەیەش بوو زۆرێك لە ڕۆژنامە حیزبی و ڕەسمیەکانیش لە سنورێکی دیاریکراو گرنگی بەهەواڵ و بیروڕای جیاواز بدەن ئەگەرچی لە ئاستی پێویست و خوازراو دا نییە.

## ڕۆژنامەوانی ئازاد و بەرژەوندی گشتی

بەردەوام بەرپرسیارییەتی میدیا لە بەردەم کۆمەلگەو بەرژەوەندی گشتی دا یەکێك بووە لەو بابەتانەی جێگەی مشتومری شارەزایانی بواری میدیایی بووە، ئایا دەکرێ دامەزراوە میدیایی و ڕۆژنامەوانییەکان وەك کەرەستەیەکی پڕوپاگەندەی دەسەڵاتی سیاسی کە ئامانجی یەکەمی بریتییە لەخزمەتکردنی سیاسەت و بڕیارەکانی ئەو دەسەڵانە یان وەك کۆمپانیایەکی بازرگانی کەرتی تایبەت سەیر **بکرێ** کەدەستهێنانی قازانج و بڵاوکردنەوەی ڕێکلام لە سەرووی ئامانجەکانیەوە بێت؟ وەرگرەکان موشتەری نین لە بازاردا هەتا وشەیان وەك کەل وپەل بنمایش **بکرێت**، بەڵکو ئەوان هاووڵاتین و مافیان لە ڕۆشنبیری و چاوەدێریکردنی گۆڕانکارییە سیاسییەکان هەیەو مافی خۆیانە بەشدار بن لە پیشەسازی دروستکردنی ڕاوبۆچوونەکان دا، لەبەرئەوە پێویستە پارێزگاری لەسەرچاوەی زانیارییە میللیەکان **بکرێت** و نەبەسترێتەوە بە بزنسمان و وەبەرهێنان و کەرتی ڕێکلامەوە.. ڕۆژنامەوانی جددی لە بواری پەیوەندیکردنی سیاسیدا ( political communication) ڕۆڵێکی کاریگەر و سەنترالی هەیەو تەنانەت بوارەکانی دیکەش وەك ڕادیۆ و تەلەفزیۆن پێوەندی بەو چوارچێوەیە هەیە، هەر بۆیە ئەگەر ئامرازێکی میدیا بکەوێتە دەستی وەبەرهێن و بزنسمانەکان، ئەوا بەناچاری ملکەچی بنەمای قازانج و داهات دەبن، نەك ئەو بنەمایانەی کە ڕۆژنامەوانی جددی لەسەری بەڕێوەدەچێت، لەم حاڵەتەدا بیرکردنەوە ئاڕاستەری ڕۆژنامەوانی حەسم دەکات نەك

هەواڵی بابەتی، ئەمە مانای ئەوە ئازادیی ڕۆژنامەوانی و مافی هاووڵاتی بۆ زانینی هەواڵی ڕاست لەبار دەبرێت و ڕۆژنامەوانی ش ڕەهەندە ڕەخنەییەکەی خۆی ون دەکات کە هیچ بەدیلێکی نییە.. هەر بۆیە لە پێناوی ڕووبەڕووبوونەوەی هەژموونی پۆلیسی و نەخۆشیە ئایدۆلۆژییەکان کە لە یەکێك لە قۆناغەکان دا ڕووبەڕوووی کۆمەڵگەکەمان دەبێتەوە، ئەوا بەبێ بوونی ڕۆژنامەوانی ئازاد و جددی و ڕەخنەیی، دیموکراتییەت لاوازدەبێت و تەنانەت توانای بەرگری لەخۆکردنی نامێنێت، هەربۆ نموونە ئەگەر دەوڵەت بتوانێت لەکاتی تەنگژەی دابین نەکردنی وزەدا دەست وەربدات لەکاروباری کۆمەڵگە، ئەوا پێویستە لەسەری بۆ هاریکاری ڕۆژنامەوانی جددی، بەردەوام دەستوەردان بکات، لەبەرئەوەی ڕۆژنامەوانی جددیش وزەیەکی ژیاری و شارستانییە بۆ هاووڵاتیان و نەمانی ئەم وزەیە کاریگەری نەرێنی زۆر گەورەی لەسەر دیموکراتییانەی دەبێت.

لاوازی ژێرخانی میدیای جددی و ئازاد کێشەی سەرەکی وڵاتانی تازە پێگەیشتووە، هەر بۆیە کاتێك کۆمەڵگە دەست دەکات بە پرۆسەی بوونیادنانی دیموکراتی و دابینکردنی ئازادییەکان، بە ئازادیی ڕادەربڕینیشەوە، ئەوا لەبەرئەوەی لە زۆربەی ئەو کۆمەڵگەیانەی بە قۆناغی ئینتقالی دا تێدەپەڕن ژێرخانی میدیای ئازاد **فەرامۆشدەکەن** و ڕاستەوخۆ وەك مۆدێلی ڕۆژئاوا بە بازاڕی دەسپێرن و دەیخەنە بەر کاریگەری پشتگیری ڕێکخراوە ناحکومیە نێودەوڵەتیەکان و پشتبەستن بە داهاتی ڕێکلام و هاریکاری کۆمپانیاو بزنسمانەکان، لە هەمان کاتدا وەك وڵاتی خۆمان ژمارەیەکی ئێجگار زۆر میدیای حزبی بوونی هەیە، بۆیە وەك پرۆفیسۆر (کارۆڵ جاکۆبیز) پسپۆڕی نێودەوڵەتی پەخش و ئەندامی لیژنەی میدیای سەربەخۆ لە کۆسۆڤۆ لە توێژینەوەیەك دا بە ناونیشانی (**پەرەپێدانی** میدیا لە کۆمەڵگەکانی پۆست کۆمۆنیست) دا ئاماژەی پێکردوە، (لەو قۆناغەی ئەو کۆمەڵگەیانەی پێدا تێپەڕدەبێت ئازادیی ڕۆژنامەوانی هەم ئۆکسجینی دیموکراتی بەرهەم دەهێنێت و هەمیش گازی پێکەنین (Laughing Gas) کەدەبێتە هۆکارێك بۆ کات بەسەربردن و قازانجی بازرگانی، ئەمە مانای ئەوەیە هەوڵدان بۆ کۆپی کردنەوەی شێوازی ڕۆژنامەوانی ئازادیی وڵاتانی دیموکراتی ڕۆژئاوا بۆ وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان، ئەگەر لە ڕوویەکەوە هۆکار بێت بۆ پشتگیری بوونیادی دیموکراتی، ئەوا بەڕووەکەی دیکە دا هۆکارێکە بۆ دروستکردنی ئاستەنگ بۆ بنیادی دیموکراتی، ئەمە لەگەڵ ئەوەی بۆ دیموکراتیەکانی ڕۆژئاواش سیاسەتی پشت بەستن بە بازار وەك

بزنس بۆ بوونیادی ژێرخانی میدیای کاریگەر وەك بیرمەندی هاوچەرخ(یۆرگن هابرماس) ئاماژەی پێدەکات، دیسان کارێکی مەترسی دارەو میدیا ناچاردەکات هێندەی بایەخ بە قازانجی وشە بدات، هێندەی بایەخ لە هەواڵی بابەتی و لایەنی هۆشیاری کۆمەڵگە نەدات، هەر بۆیە لەم ڕاستەوە هەڵوەستە کردن لەسەر ئاستەنگەکانی بەردەم ڕۆژنامەوانی ئازا و جددی و ڕەخنەیی، وەك ڕامانێك لەم دێڕانە ئاماژەی پێکراوە بۆئەوەی ئەو پرسیارە بوروژێنێت ئایا چۆن ئەو ئاستەنگانە لابەرین و ڕۆژنامەگەر بکەینەوە بەو توخمە کاریگەرەی وەك تۆماس جیفرسۆن دەڵێت "ئەگەر سەر پشك **بکرێم** لە نێوان ڕۆژنامەوانی ئازاد و پەرلەمانی ئازاد دا، ئەوا من ڕۆژنامەوانی ئازاد هەڵدەبژێرم" لەوانەیە هەندێك یان ڕاشکاوانەتر بەرپرسانی دامەزراوەکانی دەوڵەت لە وڵاتی تازەپێگەیشتوو یان قۆناغی ئینتیقالی، ئاستەنگەکانی بەردەم ڕۆژنامەوانی جددی و ئازاد و ڕەخنەیی، بخەنە ئەستۆی خودی ڕۆژنامەوانان و بیانەوێت بەو جۆرەی ڕای گشتی ئاڕاستە بکەن، کە ڕۆژنامەوانانی ئەو وڵاتانە لەو ئاستە نین کە بتوانن ڕۆژنامەوانی لەوشێوەیە هەڵبسوڕێنن یان بتوانن بە شێوەیەکی بەرپرسانە بایەخ بە هەواڵی بابەتی بدەن، تەنیا خەمیان ئەوەیە بازرگانی بە وشەوە بکەن و چاویان لە قازانجی بێت، سەبارەت بەم بۆچوونە کە بە شێوەیەکی زمنی لە هەڵوێستی دامەزراوە دەوڵەتیەکانی قۆناغی ئینتقالی زۆربەی دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو (کە وڵاتی ئێمەش بەشێکە لەوان) دەخوێنینەوە، چاوەدێری بێلایەن دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە بڵێت دەسەڵاتی سیاسی (دامەزراوە گشتییەکانی دەوڵەت) پێویستی بەوە نییە کە ڕۆژنامەوانی ئازاد و جددی و ڕەخنەیی بوونی هەبێت، بێگومان کە دەڵێین دەسەڵاتی سیاسی دەوڵەت، هەموو بەشدارانی دامەزراوە گشتییەکانی دەوڵەت دەڵێین کە بریتیین لە دەسەڵاتەکانی (یاسادانان، بەڕێوەبردن، دادوەری) لەم حاڵەتەش دا هیچ حزبێکی سیاسی (فەرمانڕەوا بێت یان ئۆپۆزسیۆن) ناکەوێتە دەرەوەی دەسەڵاتی سیاسیدامەزراوەکانی دەوڵەت، ڕاشکاوانەتر واتە حزبە سیاسییەکان بە ئۆپۆزسیۆن و فەرمانڕەواوە لە بەرژەوەندیداان نابێت ئەوجۆرە ماس مێدیایە بوونی هەبێت، هەر بۆیە لەسەر هەمووشتێك پێدادەگرن لەسەر هاوکاری حکومەت بۆ بنیادی ژێرخانی میدیای ئازاد و سەربەخۆ و جددی و ڕەخنەیی پێداناگرن، ئەگەر پێش دابرن لە چوارچێوەی بەرژەوەندی سیاسی حزبەکەنیان زیاتر نابێت.

**بوونیادی ژێرخانی ڕۆژنامەوانی بەشێکە لە پرۆسەی بوونیادی دیموکراتی**

ئەگەر پرۆسەی بوونیادی دیموکراتی لەسەر هەردوو ئاستی سیاسی و ئابووری هەڵبسەنگێنین، ئەوا لەسەر ئاستی سیاسی، دیموکراتی بریتییەلە دابینکردنی ئازادییەکان بە ئازادیی ڕادەربرین و ئازادیی ڕۆژنامەوانی شەوە، لەسەر ئاستی ئابووریش واتە ڕێکخستنی ئابووری لەسەر بنەمای ململانێی بازاڕ و دابینکردنی هەل و دەرفەتی یەکسان لە بەردەمی هەمووان، بەڵام لەسەر هەردوو ئاستی سیاسی و ئابووری، پرۆسەی بوونیادی دیموکراتی کە لەهەندێك وڵاتدا پێیدەگوترێت پرۆسەی بوونیادی نەتەوە یان پرۆسەی بوونیادی دەوڵەت، پێویستی بەبوونیاد و ڕێکخستنەوەی ژێرخانی وڵات هەیە بۆ ئەوەی ئەو توخمانەی دەبنە فاکتەری پرۆسەی بوونیادی دیموکراتی کارلێك لەگەڵ یەك بکەن و بە شێوەیەکی هاوسەنگ پرۆسەکە بچێتە پێشەوە بۆ ئەوەی بەسەرکەوتوویی ئەو قۆناغە تێپەڕێنرێت، کەواتە ئەم ئاڕاستەیە ئەوەمان پێدەڵێت، ئەرکی سەرشانی دامەزراوەکانی دەوڵەتە کە هەوڵەکانی لە پرۆسەی دیموکراتی هەموو ژێرخانەکانی ئەو توخمانە بگرێتەوە کەدەبنە کۆڵەگە بۆ ئەوەی سیستەمە دیموکراتیەکە ڕابگرێت، کە پێش هەموویان جیاکردنەوەی بوارە گشتییەکانە کە دامەزراوە گشتییەکانی دەوڵەت دەگرێتەوە، هەروەها بوارە تایبەتەکانە کە خواستی تاك و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و بەڵام جیاکردنەوەی ئەم دوو بوارە بەو مانایە نییە ئیدی پێك نەگەن و کارلێك لەگەڵ یەك نەکەنەوە، بەڵکو هەردوو بواری گشتی و تایبەتی لەبازنەیەکی فرەوان دا یەکدە گرنەوە و پێکەوە موناقەشە دەکەن و دەگەنە لێکتێگەشتنێکی هاوبەش، ئەم بازنە فرەوانە هابرماس ناوی لێناوە ئەتمۆسفێری گشتی (Public Sphere)، لەم ئەتمۆسفێرە دا هۆیەکانی میدیا ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێرن بۆ دروستکردنی کارلێکی نێوان بواری گشتی و بواری تایبەتی دا بۆ ئەوەی لەسەر بنەمای لێك تێگەیشتن ڕای گشتی وەك ڕاستیەك دروست بێت و ئەم ڕای گشتیە ببێتە بنەمای بڕیار دروستکردن لە دەوڵەت دا، ئەمە مانای ئەوەیە تاکەکانی کۆمەڵگە و چالاکوانانی کۆمەڵگەی مەدەنی گفتوگۆ دەکەن لەگەڵ دامەزراوە گشتییەکانی دەوڵەت بۆ ئەوەی بگەنە حاڵەتی لێکگەیشتن بۆ چۆنیەتی بەکارهێنانی تواناکانی کۆمەڵگە بۆ خۆشگوزەرانی کۆمەڵگەو ئەو ڕێگە وتوانایانەی لەبەردەستن بۆ چۆنیەتی چارەسەرکردنی

کێشەکان، لەوبارەوە هێربەرت مارکۆس لە کتێبی (مرۆڤی تاك ڕەهەند) ئاماژە بەوەدەکات، مەسەلەکە ئەوەنیە کە کۆمەڵگەیەك لە کۆمەڵگەیەکی دیکە دەوڵەمەندترە یان هەژارترە، بەڵکو مەسەلەکە ئەو توانایەیە کە لە کۆمەڵگە هەیەتی و هەموو کۆمەڵگەیەکیش توانای تایبەتی خۆی هەیە، بۆیە پێشکەوتنی کۆمەڵگە پەیوەستە بەچۆنیەتی هەڵسوڕان و ڕێکخستنی ئەو توانایانە، ئەگەر لەمەیان سەرکەوتوو بوون، ئەوا ئەو کۆمەڵگەیە بەرەو کۆمەڵگەیەکی خۆشگوزەران هەنگاو هەڵدەگرێت، ئەگەر سەرکەوتووش نەبوون، ئەوا کۆمەڵگە بەرەو تەنگەژە هەنگاودەنێت، ئەمە پێمان دەڵێت بۆئەوەی بتوانین کۆمەڵگە بەرەو کۆمەڵگەیەکی خۆشگوزەران ببەین، پێویستە تیۆری ڕەخنە ببێتە تیۆری کۆمەڵگە، بەڵام پرسیار لێرەدا لەوە دەکرێت ئایا مەبەست لە تیۆری ڕەخنە چیە؟ بێگومان تیۆری ڕەخنە واتە پیشاندانی کەموکوڕیەکان بۆ چارەسەرکردن، کام چارەسەرکردن و بەچ شێوازێك ؟ بێگومان بەشێوازی دروستکردنی لێکگەیشتن لە نێوان دامەزراوە گشتییەکان و تاك وڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، نەك ڕەت کردنەوەی بەرامبەرەکانمان، گرنگترین پرسیاریش ئەوەیە چ شتێك ئەم لێکگەیشتنە دروستدەکات، بێگومان ئامرازەکانی میدیا وبوونی ڕۆشنبیران بە شێوەیەکی پراکتیکی لەناو فەزای گشتی داو، کەرەستەی دەستی میدیا و ڕۆشنبیرانیش بۆ دروست بوونی ئەم لێکگەیشتنە زمانە، بێگومان زمان وەك هۆکارێك بۆ لێکگەیشتن نەك زمان خۆی ئامانج بێت، ئەمە واتە بەکارهێنانی زمان بۆ تێگەیشتنێکی ئەقلانی. ئەم تێگەیشتنە ئەقلانیەش لەسەر بنەمای زانیاری ڕاست و لە بەرچاوگرتنی بەرژەوەندی گشتی دروستدەبێت کە تێیدا تاکەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و دامەزراوەکانی دەوڵەت دەگەنە تێگەیشتنێکی هاوبەش، بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە پێویستە ئەومافە لەتاك زەوت نەکرێت کەبەژداریەکی کارای هەبێت لە پیشەسازی دروستکردنی ڕای گشتی دا لەسەر بنەمای لێکگەیشتن. ئەگەر لێرەوە بگەڕێینەوە بۆ کاریگەری میدیا لە دروستکردنی بەردەوامی دیالۆگی سیاسی لە نێوان دامەزراوە گشتییەکان و تاك و ڕێکخراوەکانی مەدەنی، ئەوا میدیا ناتوانێت ئەو ڕۆڵە گرنگە ڕەخنەییە بگێڕێت و بەردەوامی بەو دیالۆگە سیاسیە بدات ئەگەر سەربەخۆ نەبێت، بۆ ئەم سەربەخۆییەی سیستەمی میدیاش لە کۆمەڵگە پێویستە خۆڕێکخستنێکی خودی (self_regulation) هەبێت ئەم خۆڕێکخستنە خودیەی سیستەمی میدیا پێویستی

بەوە هەیە کە هۆکارەکانی میدیا ناچار نەبن تەنیا لەسەر بنەمای داهاتی ڕێکلام و قازانجی وشە ئیشبکەن وتەنیا ئامانجیان ئەوەبێت وشەکانیان لەبازاڕ دا بفرۆشرێت و حساب بۆ ئەو ئەرکە گرنگە نەکەن لەو قۆناغە دا کەلەسەر شانیانە، هەر بۆ نموونە سەبارەت بە سیاسەتی کاری وەبەرهێن و بزنسمانەکانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا یەکێك لە توێژینەوەکان ئاماژە بەوەدەکات، کە هیچ بزنسمان و کۆمپانیاییەك پڕۆژەیەك جێبەجێ ناکات ئەگەر ڕێژەی قازانجی لە (١٥ ــــ ١٠٪) کەمتر بێت، بەڵام هەر ئەو توێژینەوەیە ئاماژە بەوە دەکات، باشترین کۆمپانیای میدیا ڕێژەی قازانجی(٤ ــــ ٣٪) تێپەڕ ناکات، بۆیە پرسیار ئەوەیە چۆن بزنسمانێك یان کۆمپانیایەك پڕۆژەیەکی میدیا بەڕێوەدەبات سیاسەتی خۆی ڕەنگدانەوەی لەناو ئەو پڕۆژەیە نەبێت؟

## میدیا و بازرگانیی و سیاسەت

بۆ ئەوەی میدیا تەنیا ملکەچی ئیتیکی ڕۆژنامەوانی و یاسای ڕۆژنامەوانی بێت، نەك ملکەچی یاسای بازاڕ کە لە باشترین یاساکانی بازاڕ لەسەر بنەمای ململانێی و نمایشکردن و داوایە، ئەوا دەبێت تێگەیشتنێك لەسەر دوو ئاست لە نێوان حکومەت و ڕۆژنامەوان و میدیاکاراندا هەبێت:

١- ئەگەر میدیا بە مانای سەربەخۆبوون و پشت بەخۆ بەستن پێی بگوترێت بازرگانی، ئەوا ئەم بازرگانییە بە تایبەتی بۆ وڵاتێکی وەك وڵاتی ئێمە قابیلی قازانج نییە و زیان دەکات.

٢- پێویستە ئەم بازرگانییە بە تایبەتی بۆ وڵاتی ئێمە و هاوشێوەی ئێمە پێشووەختە دەزانرێت زیان دەکات، دەبێت بازرگانییەکی سەربەخۆ بێت. ئەم بازرگانییە زیانمەندەش وەك ئۆکسجین بۆ کۆمەڵگەی دیموکرات پێویستە.

فەرامۆشکردنی بواری ڕۆژنامەوانی بە بیانووی ئەوەی حکومەت دەست لەو بوارە وەرنادات و بڕوای بەئازادیی ڕۆژنامەوانی هەیە، بۆتە هۆکاری ئەوەی بۆشاییەکی گەورە لە نێوان ڕۆژنامەوانی جددی و حکومەت دروستبێت، بەڵام بەرژەوەندی دیموکراتی لەم قۆناغە وا پێویست دەکات چیدیکە ئەو بۆشاییە درێژەی نەبێت، بێگومان پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییەش پێویستی بە تێگەیشتنی دوولایەنە هەیە بە مانای لێککگەیشتن نەك ئاشتەوایی، لەبەرئەوەی تێگەیشتن بە مانای (لێککگەیشتن) واتە دەبێت حکومەت لەو

ڕاستیە تێبگات کە بەبێ ڕۆژنامەوانی جددی و ڕەخنەیی پرۆسەی دیموکراتی بوونی نییە، دەبێت ڕۆژنامەوانان لەو ڕاستیە تێبگەن مانای ڕەخنە واتە خستنەڕووی کەموکوڕییەکان و هەوڵدان بۆ نەهێشتنی ئەو کەموکوڕیانە لە ڕێگەی لێکگەیشتنی نێوان خەڵك و حکومەت، ڕۆژنامەوانی ناوەندێك بێت بۆ لێکگەیشتن نێوان خەڵك و حکومەت، نەك بۆ کەڵەکەبوونی کەموکوڕیەکان و چارەسەر نەکردنیان، لایەنێکی دیکەی بۆشایی نێوان حکومەت و ڕۆژنامەوانی بۆتە هۆی لاوازکردنی کلتوری دیموکراتی یان بە لاڕێدابردنی ئەو کلتورە، ئەمە مانای ئەوەیە لەبری ئەوەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کلتوری جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان و بۆشایی نێوان خەڵك و حکومەت کەم**بکرێت**ەوە، بەڵام بە پێچەوانەیە، لایەنێکی دیکەی بۆشایی نێوان حکومەت و ڕۆژنامەوانی، فەرامۆشکردنی بازاڕ و پڕۆژەکانی کەرتی تایبەتە لەلایەن ڕۆژنامەوانیەوە وەك خەمی خەڵك فەرامۆشکراوە و، لەمەش خراپتر کەرتی تایبەت لە هەموو کەموکوڕیەك بێبەری کراوە، ئەمە لەکاتێکدا پێویستە ڕۆژنامەوانی جددی ڕەخنە لە هەموو ئەو کۆمپانیانەی کەرتی تایبەت بگرێت کە کارەکانیان هەمووی کەموکوڕیە نەك بەشێکی، ڕەخنە لەو حکومەتەش بگرن لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو کۆمپانیانە ناکەن، بۆیە ئەگەر ئەو بۆشاییە پڕ**بکرێت**ەوە، ئەوا ڕۆژنامەوانی ئازاد بە خستنەڕووی زانیارییەکان بۆ خەڵك و بە تێگەیشتن لەگەڵ حکومەت دەتوانن بەشێکی زۆری هاوکێشەکە ڕاست بکەنەوە.

## ڕۆڵی میدیای کورد لە چاکسازی سیاسیدا

### بایەخی میدیا لە ژیانی سیاسیدا

بایەخی هۆکارەکانی میدیا لەوەدا بەرجەستەدەبێت بە یەکێك لە ئامرازە کارا و گرنگەکانی ئەژماردەکرێت لە بواری سیاسیدا، ئەرکی میدیاکان تەنها گواستنەوەی پەیام و زانیارییەکان نیە لە دامەزراوە سیاسییەکانەوە بۆ جەماوەر، بەڵکو گۆڕین و فۆرمەلەکردنی ئەو زانیارییانە بۆ شێوەی جیاجیا لە ڕێگەی پڕۆسە و هەنگاوەکانی تایبەت بە دروستکردنی هەواڵ، لە پێناو بەدیهێنانی ئامانج و مەبەستێکی دیاریکراو.

(B.MCNAIR) پێیوایە پەیوەندییەکی جەدەلی هەیە لە نێوان میدیا و پڕۆسەی سیاسیدا.دەکرێ بەوشێوەیە وێنا **بکرێ** میدیاکان کاردەکەن بۆ گواستنەوە و شیکردنەوەی چالاکیە سیاسیە جۆر بەجۆرەکان، لە هەمان کاتدا وەك بەشێك لە پڕۆسەی

سیاسی، یەکێکە لەو سەرچاوانەی سیاسەتمەدار بەکاریدەهێنێت بۆ دەستخستنی زانیاری و ئاشنابوون بەهەڵوێست و کاردانەوەی جەماوەر لە هەمبەر کار و سیاسەتەکانی، زانینی قیدباك و کاردنەوەی جەماوەریش سەرچاوەیەکی گرنگە لە دروست بوونی بڕیاری سیاسیدا، جگە لەوە جەماوەر بە شێوەیەکی سەرەکی پشت بە میدیا دەبەستێت لە پێکهێنانی بیروبۆچوونەکانیان لە ئاست ڕووداو و گۆڕانکاریەکاندا، بەرمەبنای ئەو بیروبۆچوونانە هەڵوێست و کاردانەوەی بەرچاوڕوون و هۆشیارانەی دەبێت لە بەرامبەریاندا، ئەمە ڕۆڵ و کاریگەری مەزنی میدیاکان بە دەردەخات لە ژیانی سیاسی و پڕۆسەی چاکسازی سیاسیدا.

ئەم ڕۆڵ و بایەخەی ئامرازەکانی میدیا لە پڕۆسەی چاکسازی سیاسی و وەرچەرخانی دیموکراتیدا وابەستەیە بە کۆمەڵێك فاکتەری خودی و تایبەتی، لەوانە سروشتی ئەرکەکانی میدیا لە کۆمەڵگە، مەودای ئازادییەکان و بوونی فرەیی و جیاوازی لە بۆچوون و ئاڕاستە سیاسیەکانی دەزگاکانی میدیادا، لەگەڵ سروشتی ئەو سیستەمە سیاسیەی لە چوارچێوەی دا کاردەکات.

میدیاکان بە ئامرازێکی کارا لە قەڵەم دەدرێن لەپاڵپشتی کردنی بنەماکانی دیموکراتییەت لەو کۆمەڵگەیانەی لە ڕابردوودا سیستەمی تۆتالیتاری و دیکتاتۆڕیەکان حوکمیان تێیداکردوە، لە ئێستادا میدیاکان لە سایەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن و کرانەوەی ئاسمانەکان و نەمانی سنورەکان، ئاسانتر دەتوانن ببن بە ئاوێنەیەك بۆ خستنەڕووی نەریتەکانی دیموکراتی لە کۆمەڵگە کراوە و پێشکەوتووەکان، دیوی دووەمی رۆڵی میدیا لەو ڕووەوە بریتییە لە زەقکردنەوەی دیوەکانی سیستەمە نادیموکراتیەکان.

میدیاکان لە هەموو کایەو دامەزراوەیەکی دیکەی کۆمەڵگە باشتر دەتوانن کار لەسەر پێکهێنانی ئیدراك و تێگەیشتنی سیاسی تاکەکان بکەن، لە ڕێگەی دەستەبەرکردنی زانیاری سەبارەت بە پرس و بابەتە سیاسییەکان، ڕاکێشانی سەرنج و تێگەیشتنیان بۆ بایەخ و کاریگەری ئەو پرس و بابەتانەی میدیاکان پێشکەشی دەکەن لە دەرخستنی ڕەهەند و شرۆڤەکردنی لایەنە شاراوەکان، پێشبینیکردنی دەرکەوتە و دەرهاوێشتەکان، شێوازی ڕاست و دروست بۆ مامەڵەکردنی تاك لە هەمبەریاندا، میدیاکان باشتر دەتوانن کاربکەن لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی بایەخپێدانی جەماوەر بە

ڕووداوەکان، ئاسانکاری بۆ جەماوەر بکەن بتوانن ڕووداو و هەڵوێستە سیاسییەکان ببەستنەوە بەیەکتر، دواجار لە بارەیانەوە بگاتە دەرەنجامێکی لۆژیکی و واقیعیانە، لەم پێشەکی و دەروازە خێرایەدا، دەگەینە ئەو باوەڕەی میدیاکان کاریگەرییەکی مەزن هەیە بەسەر پێکهێنان و ئاراستەکردنی ڕای گشتیدا.

توێژینەوەکان جەخت لەسەر پەیوەندییەکی ئەندامی دەکەنەوە لە نێوان ئازادیی میدیا و توانای میدیا بۆ دەستخستنی زانیاری لەلایەك، لەلایەکەی تریشەوە بوونی زەمینەی فەرمانڕەوایەتی عەقلانی و دیموکراتییانە، هاندانی کارایی لە فەرمانڕەوایەتی و کەمبوونەوەی ئاست و مەوداکانی گەندەڵیدا.

هەریەك لە(Art.Sliverblatt and Zlobin) وایدەبینن ڕۆڵی ئامرازەکانی میدیا لە چوارچێوەی هەر پرۆسەیەکی چاکسازی سیاسیدا، پەیوەستە بە خودی سیستەمی سیاسیەوە، ئەوکاتەی سیستەمی سیاسی دیموکرات و کراوەبێت، دامەزراوەکانی بەبێ جیاوازی گوێ بۆ داواکاریەکانی کۆمەڵگە بگرێ، میدیاکان دەتوانن باشتر کەشوهەوای سەرخستنی پرۆسەی چاکسازی سیاسی فەراهەم بکەن، لە ڕێگەی یەکخستنی کاری سیاسی و زەمینە خۆشکردن بۆ گفتوگۆی دیموکراتییانە، بڵاوکردنەوەی بەها و بنەماکانی دیموکراتی، فرەوانکردنی بنکەی بەشداری سیاسی و بەرەنگار بوونەوەی گەندەڵی.

بە پێچەوانەشەوە کاتێ سیستەمی سیاسی و دامەزراوەکانی لە خزمەتی کەس و گروپێکی سیاسی دیاریکراودا بن، بەرژەوەندی تایبەتی ئەوان بخرێتە سەرووی بەرژەوەندی گشتیەوە، ئەوکات ڕۆڵی میدیا ڕۆڵێکی نەرێنی دەبێت لە فرەوانکردنی مەودای نێوان سیستەمی سیاسی و هاووڵاتیان،هۆکارێك دەبێت هانی بێباکی و لاوازبوونی هەست و ئینتیمای سیاسی و نیشتمانی دەدات، ڕۆژنامەوان لەبری ئەوەی ڕۆڵی ئاراستەکردنی کاری سیاسی ببینێت، تەنها وەك بینەرێك ئەرکی بریتی دەبێت لە وەرگرتن و بینینی ڕووداوەکان و هیچیتر نا.

لانیکەم لە ڕووی تیۆریەوە ئەگەر سیستەمی سیاسی بە ئاراستەی شەفافییەتی سیاسی کاربکات، ئەوا میدیا دەتوانێ وا لەو سیستەمە سیاسییە بکات زیاتر پابەندی شەفافییەت بێت.میدیا لە توانایدا هەیە یارمەتی خەڵك بدات باشتر تێبگەن لە پرۆسە حکومییەکان و بەشداریکردن لە بڕیارە سیاسییەکان، بەرپرسە حکومییەکان بخرێنە

بەردەم لێپرسینەوەی یاسایی، لە ڕاستیشدا ئاکامەکانی کارێکی لەجۆرەش هەمە چەشن دەبێت، لەوەی کۆمەڵگەیەکی زیندووی خودان هەڵوێست و کاریگەری دەخولقێنی، هەمووڵا دەخاتەبەردەم ماف و بەرپرسیارییەتەکانی و یەکسانیان دەکات لە بەردەم یاسادا.

## چەمکی چاکسازی سیاسی و ڕەهەندەکانی

چەمکی چاکسازی سیاسی (political reform) یەکێکە لەو چەمکە تازانەی ماوەیەکی زۆر نیە لە ئەدەبیاتی سیاسی هاوچەرخ سەریهەڵداوە، بۆیە دەبینین زانستە کۆمەڵایەتییەکان بە تایبەت زانستی رامیاری پێناسەیەکی ورد و دیاریکراوی ئەم چەمکەیان نەکردوە.بەوپێیەی ناوەڕۆك و مەودای چاکسازی سیاسی لە کۆمەڵگەیەك بۆ یەکێکی دی، لەکاتێك بۆ کاتێکی تر جیاوازە، لە ناو خودی یەك کۆمەڵگەدا گۆڕان بەسەر ڕەهەند و ماناکانیدا دێت، بەگوێرەی سروشت و قەبارەی ئەو کێشەو قەیرانانەی ڕووبەروی کۆمەڵگەکە دەبێتەوە.

بەرمەبنای ئەو ڕاستیە دەکرێ بوترێ چاکسازی سیاسی وەك چەمك مرونەتێکی زۆری هەیە، دەتوانرێ لە چوارچێوەی فکری و ئایدۆلۆژی و جڤاتی جیاجیادا قسەی لەبارەوە **بکرێ** و مامەڵەی لەگەڵ **بکرێت**.

یەکێك لەو پێناسانەی بۆ ئەم چەمکە کراوە، چاکسازی سیاسی بریتییە" لەو هەنگاوە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیانەی ئەرکی ئەنجامدانیان دەکەوێتە ئەستۆی هەریەك لە حکومەت و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و کەرتی تایبەت، لە پێناو گەیاندنی کۆمەڵگە بە رەوتی بونیاتنانی سیستەمی دیموکراتی"

بەگوێرەی ئەم پێناسەیە چاکسازی سیاسی هەنگاوە بەراییەکانی پڕۆسەی وەرچەرخانی دیموکراتیە (democratic transition)، بۆیە پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان هەردوو چەمکەکەدا، چاکسازی سیاسی زەمینە خۆشدەکات بۆ وەرچەرخانی دیموکراتی، لە قۆناغی وەرچەرخانی دیموکراتیدا کۆمەڵگە لە سیستەمی تۆتالیتاری و تاکرەویدا دەگۆڕێ بۆ سیستەمی دیموکڕاتی، بە جۆرێك گۆڕانکاری ریشەیی دێتەئارا لەو ژێرخان و ئامانج و پڕۆسانەی کاریگەریان هەیە بەسەر دابەشکردن و مومارەسەکردنی دەسەڵاتی سیاسی.

شارەزایان لە بواری زانستی رامیاری وای بۆ دەچن چاکسازی سیاسی بەدینایەت بەبێ گۆڕانکاری جەوهەری و ڕاستەقینە لە ژێرخان و بوونیادی دامەزراوەکان و ئەرك و ئامانج و شێوازی کارکردنیان، لە ڕێگای ئامرازە یاساییەکان کە یارمەتی سیستەمی سیاسی دەدەن بە توانا و کاراییەکی زۆرەوە مامەڵە لەگەڵ گۆڕانکاریەکان و گرفتە تازەکان بکات.

چاکسازی سیاسی لە یەکێك لە ماناکانیدا واتای گۆڕانی سیاسی political change دەگەیەنێت، کە بریتییە لەو گۆڕانەی لە بوونیادی دامەزراوە، ئامانج و پرۆسەکان دێتەدی، ڕەنگدانەوەی قوڵی دەبێت بەسەر دابەشکردن و مومارەسەکردنی دەسەڵات لەلایەن هێزە فەرمانڕەواکان لە کۆمەڵگە، بە شێوەیەکی ئاشتیانەی دوور لە توندوتیژی، بە پێچەوانەی شۆڕش و کودەتاکان.

هەروەك چاکسازی سیاسی پرۆسەی هەمووارکردن و پەرەپێدانیکی ریشەییە لە شێوەی فەرمانڕەوایی و پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان لە ولاتێکدا لە چوارچێوەی ئەو دەسەڵاتە سیاسیەی فەرمانڕەوایەتی دەکات، بەو کەرەستە و ئامرازانە فەراهەمی دەکات بە شێوەیەکی پلەبەند.

چاکسازی سیاسی کاتێك بەدیدێت کە دەسەڵاتی بڕیاردان لە چەند کەس و گروپێکی سەرەوەی **هەرەمی** دەسەڵات دێتە خوارەوە بۆ تەواوی هێز و گروپە کاریگەرەکانی ناو کۆمەڵگە، ئەمە بەو مانایە دێت پرۆژەو هەنگاوەکانی چاکسازی سەرەنجامەکەی شکست و بە بنبەست گەشبین دەبێت، بەبێ بوونی بەشداریەکی سیاسی ڕاستەقینەی خەڵك لە پرۆسەی دروست بوونی بڕیاری سیاسیدا.

لە کوردستان کێشەیەکی ئەوتۆمان نیە لە بوونی دیدگای رۆشن، پرۆژەی تۆکمە و هەمەلایەنی بۆ چۆنیەتی ئەنجامدانی چاکسازی سیاسی، هێندەی گرفتەکە نەبوونی ئیرادە سیاسیەکەیە لەبەکردەیی کردنی ئەو دیدگا و پرۆژانەیە.

هەمیشە قەیرانەکان لە بڕیار و هەنگاوێکی نەشازەوە دەستپێدەکەن، چارەسەرەکانیش لە بڕیار و هەنگاوێکی جیددی و راستگۆیانە خۆی دەبینێتەوە، ئەوەی قەیرانەکان قوڵتردەکەنەوە ئەو هێزانەن لە گەرمەی قەیران و دۆخە نەشازەکاندا پێدەگرن و گەشەدەکەن.قەیران چیە جگە لە ونبوونی یاسا و زاڵبوونی رۆحی تاکرەوی بەسەر کۆی دەزگا و دامەزراوەکاندا؟ ئەو دەزگایانەی زیاد لە دەنگ و ڕەنگ و ئەقڵێکی پێویستە،

ئەو قەیرانانەی لە ئێستادا ئەستەمە تێپەڕێنرێت بریتیین لە ئاستەنگی بنبڕکردنی گەندەڵی لە جومگەکانی دەسەڵاتدا، هێزێکی بڕیاربەدەستی ڕاستەقینە نیە پەنجەبخاتە سەر ئازارەکان، ئیدی "لێخورە دەشتە" بۆ ئەوانەی بەو کارانە هەڵدەستن هەروا سوك و ئاسان بۆیان مەیسەر دەبێت دەسەڵات و داهات لە سەرووی یاسا بەخراپ بەکاربێنن لە بەرژەوەندی گروپ و تاقمێکی سیاسیدا، ئەوەی بە ڕوونی دیارە لە ئیستادا کێشەی گەندەڵی بووە بە سیستەم، تێیدا جومگە سەرەکیەکانی هەریەك لە حیزب و پەرلەمان و حکومەت پێکەوە دەبەستێتەوە، ناتوانین ئەو ڕاستیە فەرامۆش بکەین قەیرانی گەندەڵی لەم هەرێمەدا وەك شادەمارێکی هاوبەش و سەرەکی بە جەستەی حیزبدا دەڕوات، یەکەم هەنگاوی چاکسازیش لە بڕین و وشککردنی ئەو شادەمارە دەستپێدەکات ڕەنگدانەوەی کارەساتباری هەبووە بەسەر ئەدای کۆی دەسەڵاتی سیاسیدا.

ئەمڕۆ لە بەردەم دەرفەتێکی مێژوویی داین بۆ بەخۆداچوونەوەیەکی گشتگیر و دڵسۆزانە بە کۆی کایە سیاسی و ئیداری و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکە، لە پێناو بنیاتنانی نەتەوە و نیشتمانێکی هاوچەرخ و کراوە، لەسەر بنەمای ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ، ئازادییە گشتییەکان، مافی هاووڵاتیبوون، بە دامەزراوەیی و یاساییکردنی پرۆسەی شەفافییەت و لێپرسینەوە لە دەسەڵات، جیا لەوەی خەڵکانێك هەن باوەریان وایە پرۆسەی چاکسازی سیاسی وابەستە نیە بە دەرفەت و قۆناغێکی دیاریکراو، بەڵکو میکانیزم و پێویستیەکی بەردەوامی کۆمەڵگەکانە بۆ بەرگرتن لەوەی گەندەڵی و هەر هەلسوکەوتێکی دەرەوەی یاسا ببێت بە مۆدیل و دیاردەیەکی درێژخایەن، لەوە ترسناکتر بە "سیستەم"**بکرێ**.

## ڕۆڵی میدیا لە چاکسازی سیاسیدا

میدیا لە سایەی پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرەکانی بواری تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردنی ژمارەییدا، هێزێکی ئەفسانەیی دروستکردوە، بووە بە ئیمپڕاتۆڕیەتێکی گەورەی جیهانی، بە ڕادەیەك ئەو شۆڕشە مەزنەی لە دەستخستن و بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان هاتۆتەئارا تا دەگاتە تەکنەلۆژیای پەخشی ڕاستەوخۆ وایکردوە کەناڵەکانی میدیا ببێ بە سەرچاوەی سەرەکی زانیاری خەڵك، دەسەڵات، دەمەزراوە رەسمی، ئەهلی، لۆکاڵی و نێودەوڵەتیەکان، تەنانەت بۆتە فاکتەری پلە یەك لە گۆڕانی هاوسەنگی و

هاوکێشەی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان و سەرلە نوێ داڕشتنەوەی پانتاییەکی بەرفرەوانی کلتور، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و تێڕوانینی تاکەکان بۆ ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتیی و شەرعیەتی سیستەمە سیاسییەکان.

ئەو ڕۆڵ و کاریگەرییەی میدیا بینیویەتی و دەیبینی لە ساتەوەختی سەقامگیری و ئارامیدا یاخود لە کاتی ململانی و شەڕ و شۆڕشەکاندا ڕۆڵێکی چارەنووس ساز و یەکلاکەرەوەیە، شۆڕشەکانی تونس و میسر و لیبیا نموونەی ڕوون و ئاشکران بۆ دەرخستنی ئەو کاریگەرییە بێ سنورەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی ئینتەرنێت (فەیسبووك، تویتەر و یوتیوب) کە بە کۆڵەگەکانی میدیای نوێ (new media) دەناسرێن، لەپاڵ ئەوانیش میدیا هەواڵیەکان.

لەبەرئەوە میدیا و کاریگەریەکانی خۆیان باس لەخۆیان دەکەن، پێویست بە ڕوونکردنەوەی زۆر ناکات، ئەوەی لێرەدا پێویستە هەڵوەستەی لەسەر بکەین ڕۆڵی میدیای کوردیە لەهەر پرۆسەیەکی چاکسازی، کە دەسەڵاتی سیاسی لەهەرێم پێویست دەکات بە پەلە لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی نیشتمانی ستراتیژی کاری لەسەر بکات، لەسەر بنەمای ئیرادەیەکی سیاسی ڕاستەقینە هەنگاوی بۆ بنێت، لە ڕێگەی دەستە و کارەکتەر و پرۆسێسە کارا و جێ باوەرەکان هەنگاوی بۆ بنێت.

بەبێ بەشداری میدیای کوردی لە هەنگاوەکانی چاکسازی سیاسیدا، نەوەك هەر گەرەنتی سەرکەوتنی ئەو پرۆسەیە ناکرێ، بەڵکو هیچ ئەگەرێك لە ئارا نابێت بۆ بەئاکام گەیشتنی، بەهۆی ئەو ئەرك و کاریگەرییەی دەکرێ میدیا بیبینێت لە تەواوی قۆناغەکانی ئەو پرۆسەیەدا، وەك هێڵێکی گشتی ئەو رۆڵەی میدیا لە چەند خاڵێکدا چردەکەینەوە:

**یەکەم : بەدیهێنانی شەفافییەت**

لە کۆمەڵگە کراوە و دیموکراتەکان، میدیا ڕۆڵی چاوەدێریکردنی حکومەت و دامەزراوەکانی دەسەڵاتی سیاسی دەبینێ، لە ڕێگەی ڕوومالکردنی هەواڵی و بەدواداچوونی ڕۆژنامەوانی زۆرترین زانیاری سەبارەت بە کارەکانی حکومەت بلاو دەکاتەوە و دەیگەیەنێت بە خەڵك، بە تایبەت ئەو بڕیار و ڕێکەوتن و گرێبەست و پرۆژانەی بایەخی تایبەتی هەبێت بۆ کۆمەڵگە، گومان و ئەگەری ئەوەی **لێبکرێت** بۆ بەرژەوەندی تایبەتی کەسێك یان گروپێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی بقۆزرێتەوە.

بۆ ئەوەی ئیرادەیەکی سیاسی ڕاستەقینە لە کوردستان بێتەئاراوە بۆ ئەوەی میدیا ئەو ڕۆڵە هەستیارە ببینیت پێویستە دەسەڵاتی جێبەجێکردن و یاسادانان لەسەر دووئاستی گرنگ کاربکات ئەوانیش:

١.کارکردنی جددی حکومەت لەسەر بڵاوکردنەوەی کلتوری حکومەتی کراوە، بە جۆرێك ئەسڵ لە کارکردنی حکومەت شەفافییەت و ئاشکراکردنی بڕیار و کارەکانی بێت بۆ خەڵك و میدیاکان، ئەوانەشی بۆ بڵاوکردنەوە ناشێت زۆر سنوردار بێت، حکومەتێکی لەمجۆرە، زەمینە خۆشدەکات لەسەر ئاستی کۆمپانیا و ڕێکخراوە رەسمی و نارەسمی، تەنانەت بچووکترین یەکەی ئیداری و سیاسیدا ئەم کلتورە بڵاو ببێتەوە، بێتە بەشێك لە بیرکردنەوە و مومارەسەکردنی ژیانی ڕۆژانەمان.

٢.دەبێت پەرلەمانی کوردستان و رۆژنامەوان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی هەرچی زووە بێنەدەنگ بۆ ئەوەی چیتر یاسای ئازادیی گەیشتن بە زانیارییەکان کە ماوەیەکی زۆرە لەخولی سێیەمی پەرلەمان پەسەندکراوە، لەلایەن حکومەت و دەسەڵاتی دادوەریەوە جێبەجێ بکرێ، لە پێناو پاراستنی مافی ڕۆژنامەوان و هاووڵاتیان لەوەی ئەو زانیارییانەی پێویستیان پێیەتی بەئاسانی دەستی بخەن و بڵاویبکەنەوە، بەبێ بوونی ئەم زەمینە یاساییە و کاراکردنی، ئەستەمە میدیا بتوانێت ڕۆڵێکی ئەوتۆی هەبێت لە پرۆسەی چاکسازی و شەفافییەت و ڕووبەڕووبوونەوەی گەندەڵی، کێشەی گەورەی ڕۆژنامەوانانی لەوەدایە دەستیان بە زانیارییەکان ناگات، بە پاساوی بێ بنەما و بوونی دەستەواژە لاستیکیەکان، هاووڵاتی و ڕۆژنامەوانان بێبەش دەکرێن لەو زانیارییانە.

ئەمەیان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی یاسای ڕۆژنامەگەری لە کوردستان ژمارە(٣٥)ی ساڵی (٢٠٠٨)، ئەوەندەی لە دژی ڕۆژنامەوانان و میدیا بەکارهێنراوە، ئەوەندە لە بەرژەوەندی و لە پێناو ڕاستیدا بەکارنەهێنراوە، لەم یاسایەدا لە برگەی دووەمی مادەی دووەمدا، ئەو مافەی بۆ ڕۆژنامەوان دەستەبەرکردوە لە دەستخستن و بڵاوکردنەوەی زانیاری، بەڵام بێ ئەوەی حکومەت و دامەزراوەکانی پابەندنەکردوە بەو یاسایە، یان سزاو ڕێکارێکی یاسایی بسەپێنێ بەسەر ئەو کەس و لایەنانەی هاوکاری ڕۆژنامەوان ناکەن.

٣.بڵاوکردنەوەی کلتوری کرانەوە و بوونی یاسایەکی لەجۆرە بەها و کاریگەریەکی ئەوتۆی نابێت، ئەگەر داواکاری گشتی کارانەکرێت، بە دوورنەگیرێت لە دەستوەردان و فشار و هەوڵەکانی پەکخستنی، هەموو ئەمانە ناتوانن هەنگاوێك لە چاکسازی سیاسی نزیکمان بکەنەوە، ئەگەر دەسەڵاتەکان لەیەك جیانەکرێنەوە و هەژموونی حیزب لە حکومەت سنوری بۆ دانەنرێت، دەسەڵاتێکی دادوەری سەربەخۆ، پەرلەمانێکی چاوەدێر و حکومەتێك نەیەتە ئاراوە بۆ هەموان بێت، نەك ئەندامانی گروپێکی سیاسی دیاریکراو، ئەمانە ئاستەنگەکانی بەردەم هەر پرۆسەیەکی لەجۆرەن کە دەتوانن بنەماکانی شەفافییەت و دادپەروەری و لیپرسینەوەی یاسایی و رۆژنامەوانی بەرقەراربکەن، مەوداکانی قۆرخکردنی دەسەڵات و بەرژەوەندییەکان لە بەردەم بریاربەدەستەکان بەرتەسك و سنوردار بکەنەوە.

**دووەم: بەهێزکردنی بنەمای لێپرسینەوە**

**فەراهەمکردنی** سەکۆیەکی ئازادیی دوور لەسانسۆڕ و چاوسورکردنەوە، لە پێناو مومارەسەکردنی رەخنەی ئازاد و بنیاتنەرانە لە کاروبارەکانی حکومەت و دەسەڵاتەکانی دیکە، بە جۆرێك ئەم رەخنە و بۆچوونانەی لەسەر سەکۆی رۆژنامەوانیەوە دەخرێنەڕوو وەك فیدباك (feedback) و ئاڕاستەکانی ڕای گشتی سەیربکەین، لەهەر بڕیار و یاسایەکی دواتر لە بەرچاو بگیرێن و کاریان پێ**بکرێت**.

لە پرۆسەی چاکسازی سیاسیدا پێویستە بڕیاربەدەستانی کوردستان خۆیان تەلقین بکەن بەوەی میدیا تەنها مافی ئازادیی ڕادەربڕینی نیە، بەڵکو مافی ئازادیی کارتێکردن و کاریگەری نواندنیشی هەیە، لەبەرئەوەی میدیا هیچ بەهایەکی نابێت ئەگەر گوێی بۆ نەگیرێ.

ئەوەی کاریگەری ئەو رەخنانە زیاتر دەکات، ئەندازەی ئەو زانیارییانەیە **لەبەردەستی** ڕۆژنامەوان و هاووڵاتیانە لەبارەی کارەکانی دەسەڵاتی سیاسی، بۆیە ئەم دوو خاڵە تەواوکەری یەکترن و لە یەکدی دانابڕێن.

**سێیەم: قوڵکردنەوەی گفتوگۆی نیشتمانی**

بەوپێیەی میدیاکان ئەڵقەی بە یەکگەیاندنی دەسەڵاتی بڕیاربەدەستە بە جەماوەر، هەردوولا گوێیان لەهەڵوێستی یەکدی دەبێت، ئەرکی میدیا لەم قۆناغە بریتی دەبێت لە قوڵکردنەوەی گفتوگۆی جددی و راشکاوانە لە نێوان خەڵك و کەسانی پسپۆڕ و

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و لایەنە سیاسییەکان لەلایەك، بڕیاربەدەستان و هەڵسوڕێنەرانی پڕۆسەی چاکسازی لەلایەکی ترەوە.

بوونی ئەم گفتوگۆ کراوە و بەردەوامە خزمەت بە دەوڵەمەندکردنی هەنگاوەکانی چاکسازی سیاسی، ڕاستکردنەوەی ئاڕاستەکانی و هەڵسەنگاندنی هەنگاوەکانی دەکات، پانتاییەکی ڕاستەقینە بۆ دەسەڵاتداران دەڕەخسێنێ لەو ڕێگەیەوە کار بۆ دەستەبەرکردنی متمانەی ڕای گشتی بکەن بۆ بەهێزکردنی شەڕعیەتی سیاسی کار و بڕیارەکانیان.

تاکەکانی کۆمەڵگە مومارەسەیەکی کرداری مافە سروشتی و سیاسییەکانی خۆیان دەکەن لە بەشداریکردنی سیاسی، لە گەیاندنی خواست و بۆچوونەکانیان لەمەڕ جموجۆڵە سیاسیی و گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتییەکان.

**یاسای مافی دەستخستنی زانیارییەکان**

بەوپێیەی هەرێمی کوردستان بەشێکە لە عێراق، عێراقیش واژووی لەسەر پەیماننامەی بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی کردوە، هەر وڵاتێکیش ئەو پەیماننامەیە واژوو بکات پێویستە لەسەری گۆڕانکاری لە بوونیادە دەستوری و یاساییەکانی بکات بۆ ئاسانکردنی کاری ئەو دامەزراوانەی دەتوانن ڕۆڵیان هەبێت لە وەها کارێکدا، بۆیە عێراق و هەرێمی کوردستان لە بەردەم لێوەشانێکی نێودەوڵەتی و نیشتیمانیدان لە دانانی یاسایەکی ڕوون و تێروتەسەل بۆ زامانکردنی مافی گەیشتن و دەسخستن و بڵاوکردنەوەی زانیاری.

لە بوونیادی فیکری لیبرالیش دا دووانەی کۆمەڵگەی دیموکرات و هاووڵاتی بە ئاگا لەیەك جیاناکرێنەوە، لەوبارەوە (جان کلۆد برتراند) ی پسپۆری جیهانی لەیاساکانی میدیا دەڵێت: "دیموکراتییەت مانای ئەوەیە هەموو هاووڵاتیەك مافی بەشداریکردنی هەبێت لە ڕێکخستنی کۆمەڵگە، بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە هەموو هاووڵاتیەك پێویستی بەوە دەبێت بە باشی ئاگای لەوەبێت چی ڕوودەدات، بە دەربڕینیکی تر بەبێ بوونی خزمەتگوزارییەکی باش لەمیدیای هەواڵی، ئەستەمە دیموکراتییەتی ڕاستەقینە بوونی هەبێت"، کاتێکیش (دیڤید هێڵد)ی پسپۆڕی سیاسی بەریتانی باس لە مۆدێلەکانی دیموکراتییەت دەکات، باس لە نۆ مۆدێل و جۆری دیموکراتی دەکات بەگوێرەی سروشتی فەرمانڕەوایەتی و پەیوەندیی دەسەڵات بە هاووڵاتیانەوە، یەکێك لەم مۆدێلانە

دیموكراتییەتی بەشداریكردنی پێدەوترێت، لەم مۆدێلە ئەوە بە پێویست دەزانێت هاووڵاتی ئاگای لە ڕووداو و گۆڕانكاریەكانی دەوروبەری خۆی هەبێت لەسەر ئاستە جیاواز و لە هەموو بوارەكاندا.

لەم ساتەوەختەی ژیانی سیاسیی هەرێمی كوردستان، داواكاری و خواستێكی جەماوەری بەرفرەوان هەیە لەسەر هەرچی زووتر چوونە نێو پرۆسەیەكی ڕاستەقینەی چاكسازی كۆی دەسەڵات و دامەزراوەكانی بگرێتەوە، پێویست بەوە دەكات پەرلەمانی كوردستان، هێزە سیاسییەكان، میدیا، ڕێكخراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی، ناوەندە ئەكادیمی و فیكریەكان پێداگیری لەسەر پەلەكردن لە جێبەجێكردنی یاسای مافی گەیشتن بە زانیارییەكان بكەنەوە، ماوەیەكی زۆرە لەلایەن پەرلەمانی كوردستان پەسەندكراوە، كەچی هێشتا ئەو ڕێوشوێنانەی لەو یاسایە ئاماژەی بۆ كراوە ئیشی جددی لەسەر نەكراوە.

بەردوام گەیشتن بە زانیاری و ڕاستیەكان و بڵاوكردنەوەیان پەیوەست بووە بە بوونی ئازادیی، بۆیە ئەوەی لە كوردستان هەیە ئازادیی ڕادەربڕینە نەوەك ئازادیی گەیشتن بە زانیاری و ڕاستیەكان، بۆیە بە درێژایی ئەزمونی هەرێم ناوچە تاریكەكان ڕۆژ بە ڕۆژ پانتایی زیاتریان داگیردەكەن و تێروانینی بەشێكی بەرفرەوان لە خەڵك و میدیا بۆ دەسەڵات لە گومانێكی قوڵ خۆی نمایشدەكەن.

گەرەنتیكردنی مافی هاووڵاتی و ڕۆژنامەوان لە ئازادیی گەیشتن بە زانیارییەكان گەرەنتیكردنی بوونی تاكی هۆشیار و بەئاگایە، گەرەنتیە بۆ بەشداری سیاسی ڕاستەقینەی تاك، گەرەنتیە بۆ گەشەی سیستەمی دیموكراتی و بەرگرتن لە گەندەڵی و قۆرخكاری سیاسی.

ئەگەر ئازادیی ڕۆژنامەوانی بپێوین لەسەر بنەماكانی دیموكراتییەت كە حیزبە دەسەڵاتدارەكانی ئێرە بانگەشەی پەیڕەوكردنی دەكەن، دەگەینە ئەو ڕاستییەی دیاردەیەكی تەندروست و ئیجابی هەیە ئەویش "ئازادیی ڕۆژنامەوانی"یە، بەڵام ئازادییەك لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەكانی حیزب دەرنەچێت، بە مانای ئازادییەك لە سنورەكانی بیركردنەوەو ئامانجەكانی حیزب تێپەڕنەكات، ئەو ئازادییە ڕێگەی پێدراوە بە شێوەیەكی ئیجابی لەسەر ناو و مێژووی حیزب بەرجەستەبكات، بەڵام ئەگەر باس لە ئازادیی ڕۆژنامەوانی بێت بە مانای ئازاد و سەربەخۆ، ئەوا دەكرێ بڵێین لە كوردستان

میدیای ئەهلی و سەربەخۆ هەنگاوە سەرەتاییەکانی گوزەراندوە،سەرباری ئاستەنگ و فشارە زۆرەکانی بەردەمی، ئەو رۆژنامەوانیە قۆناغی کۆرپەلەیی جێهێشتوە و ئیدی ترسی لەبارچوون یاخود لەباربردنی لێناکرێ، ئێستا کۆمەڵێك رۆژنامەوانی کار و پیشەگەر بە دەوریەوە ئێشکگرن و بە دیاریەوە شەونخونی دەکەن، بەرگەی شەق و تیهەڵدان و قسە تاڵ و ترشەکانی دەسەڵات دەگرن بگرە قوربانی بە گیانی خۆشیانداوە تاوەکو مۆمی ئەو کایە ئومێدبەخشە نەکوژێتەوە، ئەگەرچی ئەزمونی میدیای ئەهلی لە کوردستان بێ کەموکوڕی نەبووە، لێ دیوە جوان و گەشەکەی زۆر زیاترە و بەراوردناکرێ بەو کەموکوڕیانە، ئەو رۆژنامەوانیە مانا و رەهەندێکی قوڵ و راستەقینەی بە رۆژنامەوانی کوردی بەخشی، ئاسۆیەکی گەورەی بەڕوودا کردینەوە، ئەو بڕە کەمەی هەقیقەت مابوو لەچنگی سیاسەت و چەواشەکاریەکانی دەرهێنا، ئەمە واتای ئەوە ناگەیەنێ قسە لەسەر کەموکوڕیەکان نەکرێ یان بمانەوێ پەردەپۆشی بکەین، نەخێر ئەزمونی میدیای ئازاد چۆتە قۆناغی بەرپرسیاریەتی بەرامبەر بەخۆیی و وەرگرانی و ئەو دۆخە سیاسیەی ئێستای کوردستان، ئێستا لە هەموو کات زیاتر دەبێ کار لەسەر بژارکردنی ئەو کەموکوڕیانە بکات بۆ بەردەوامبوونی وشەی ئازاد و رەخنەی جددی،لە هەموو کات زیاتر پێویستمان بەو ئۆکسجینەی ئازادی هەیە لەنێو ئەو ئیمپراتۆریەتە رۆژنامەوانیانەی لێرە و لەوێ بەپارە و توانایەکی زەبەلاح قوتدەکرێنەوە بە ئەجیندایەکی نارۆشن، لەوە دەترسێم قوتکردنەوەی ئەو ئیمپراتۆریەتانە مەبەست لێی کاڵکردنەی کاریگەری ئەو میدیا ئازادە بێت و دروستکردنی ژاوەژاو بێت لەسەر پەیام وناوەڕۆکەکەی، هیوادارم لەو ترس و نیگەرانیەم بە هەڵەدا چووبم و نەمپێکابێ.

لەپاڵ چەمکی "ئازادیی ڕۆژنامەوانی" وەك یەکێك لە جۆرەکانی ئازادیی، چەمکی "ڕۆژنامەوانی ئازاد"هەیە، بەو مانایەی هەموو تاکێك ماف و توانای ئەوەی هەبێت ڕۆژنامەیەکی تایبەت بە خۆی هەبێت، بە شێوەیەك مومارەسەی پیشەی ڕۆژنامەوانی ئازاد **بکرێت** کە ئینتیمای نەبێت بۆ هیچ دامەزراوەیەکی ڕۆژنامەوانی حیزبی یان حکومی،بوونی میدیای ئازاد لەکوردستان ببە هەموو جۆرەکانیەوە لە ڕووی چەندێتی و چۆنیەتیەوە رۆژ بە رۆژ لە زیادیوون و پەرەسەندندایە.

ئەگەرچی هەندێك بە چاوی گومان و پاشکۆیەتی بۆ میدیای ئەهلی و ئازاد دەروانن، هەندێکی تریش دەڵێن تێگەیشتنی ڕۆژئاوایی سەبارەت بە میدیای ئەهلی لەسەر

جێبەجێ نابێت، بەڵام ئەوەی لەسەر ئەرزی واقیع دەبینرێ ئەوەیە ئەو میدیایە پانتاییەکی فرەوانیان تەرخانکردوە بۆ ئەو بابەتە رۆژنامەونیانەی تایبەتن بە واقیعی ژیانی خەڵك و خواست و رەخنەکانیان، تیشك دەخاتە سەر کەموکورییەکان لە ئەزمونی حوکمرانیەتی کوردیدا، ئەم کارەش بە شێوەیەکی بەرتەسك نەبێت لە ڕۆژنامە حیزبییەکان ڕێگای پێنادرێ، لەبەرئەوەش دەبینین تیراژی ئەم ڕۆژنامانە لە نێوان "٩٠٠٠-١٦٠٠٠"دایە هەروەك ئەو ڕۆژنامانە خۆیان بڵاویانکردۆتەوە، لەگەڵ ئەوەش ئەم ژمارەیە ئەگەر راست و دروست و ورد بێت لەو قەیرانە کەم ناکاتەوە ڕۆژنامەوانی کوردی تێیدا دەژێت ئەگەر ئەو ژمارەیە بەراورد بکەین بە ژمارەی دانیشتوانی کوردستان و ڕێژەی خوێندەواران، ئەم ڕۆژنامانە توانیویانە لە ڕۆژنامە حیزبی و حکومییەکان ڕۆڵێکی بەرچاوتریان هەبێت، بەڵام ئەویش نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی ڕۆژنامەوانی بکاتە دەسەڵاتێکی کردەیی لە بەرامبەر دەسەڵاتەکانی دیکە، ئەوانیش لە سایەی ئەم رەوشە سیاسییە تەگەرەی زۆریان دەخرێتە بەردەم، لەوانە داخستنی سەرچاوەکانی هەواڵ و زانیاری بەڕوویاندا، تۆمەتبارکردنیان بە پاشکۆیەتی، ناوەناوەش راپێچکردنی نووسەر و سەرنووسەرەکانیان بۆ بەردەم دادگا و زیندانیکردنیان.

## پەیوەندیی نێوان میدیای کوردی و ناوەندەکانی بڕیار

لە هەموو ئەمانە گرنگتر ئەوەیە پەیوەندیی نێوان میدیا و پرۆسەی سیاسی لەسەر بنەمایەکی تەندروست گەڵاڵە نابێت، تاوەکو ڕەوشی سیاسی و سیستەمی سیاسی لە کوردستان ڕەهەندی دەستوری و دامەزراوەیی وەرنەگرێت، دەسەڵاتی داوەریش جیانەکرێتەوە لە دوو دەسەڵاتەکەی تر و سەربەخۆ نەکرێت، نەبوونی دەستورێکی هەمیشەیی و نەبوونی سیستەمی دامەزراوەیی لە بەرێوەبردنی دەوڵەت ڕێگا خۆشدەکات بۆ پاشاگەردانی ئیداری و بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لەسەر هەموو ئاستەکان، سەروەرنەبوونی یاسا و تەسککردنەوەی روبەری ئازادییەکان.

لە سیستەمە دیموکراتییەکاندا فرەحیزبی ڕاستەقینە بوونی هەیە، فاکتەرێکی ئیجابی و پرەنسیبێکی سەرەکی بەرجەستەکردنی دیموکراتییەت ە، لەو ڕوانگەیەوە کە ئەم فرەحیزبییە فاکتەرێکی بەهێزکردنی ڕۆڵی ڕۆژنامەوانیە لە ڕێگەی هۆشیارکردنەوە و بزواندنی ڕای گشتی لە ئاست پابەندنەبوونی دەسەڵاتی سیاسی بەو بەرنامەیەی زووتر لە

هەڵبژاردنەکان بەڵێنی جێبەجێکردنی دابوو بە دەنگدەرانی یاخود لە کاتی پێشێ لکردنی یاساکان و مافەکانی مرۆڤ و بە کەسیکردنی سیستەمی سیاسی، دەنگی نارەزایی حیزبەکان دەبێتە پاڵنەری ئاکتیڤ بوونی ڕای گشتی و ڕۆڵی میدیا. بەڵام لە کوردستان سەرباری رواڵەتەکانی فرەحیزبی، هەریەك لەو حیزبانە میدیای تایبەتی خۆی هەیە بەڵام بە درێژایی چەندین ساڵی ڕابردوو بە بەردەوامی خۆیان بە دوور گرتبوو لە وروژاندنی ئەو پرسانەی سەریان دەکێشا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵاتی سیاسی و دوو حیزبە دەسەڵاتدارەکە. ئەم نیمچە ئیفلیج بوونەش لە ئەدای فرەحیزبی بە درێژایی ئەو ماوەیە نێگەتیڤانە ڕەنگیدایەوە لەسەر ڕۆڵی میدیای حیزبی ئەو حیزبانەی لە دەرەوەی دەسەڵات بوون یان بەشداریەکی رواڵەتیانەیان پێکرابوو لە حکومەتدا.

سەرەتای هەزارەی دووەم سەرەتای کردنەوەی گرێ کوێرەی میدیای کوردی بوو کە دانیشتبوو بەدیار دەنگە خامۆش و چرا کزەکەی میدیای حیزبی، بە لەدایکبوونی میدیای ئەهلی و سەربەخۆ دەرفەتێکی مەزن هاتە پێش بۆ بەرجەستە و ئاوێتەکردنی رۆحی رۆژنامەوانی راستەقینە بە جەستە شەکەتەکەی میدیای کوردی، لەوساوە وردە وردە ژمارەی ئەو میدیایە لە زیادبووندا بوو، بە ڕووخانی رژێمی بەعس لە عێراق لە ساڵی (٢٠٠٣) ئەو گۆڕانە سیاسیەی لەسەر ئاستی عێراق دروستبوو بە ئەرێنی رەتگی دایەوە بەسەر ئەزمونی میدیای ئازاد و سەرپێکەوتنی، لەگەڵ هاتنە مەیدانی بزوتنەوەی گۆڕان وەك رەوتێکی سیاسی بەرهەڵستکار، بەرلەویش کۆمانیای وشە و ئامڕازە ڕۆژنامەوانیەکانی، هەموو ئەمانە تەکانێکی گەورەیان بە گوتاری رەخنەگرانەدا، کە میدیا ئەهلیەکان و میدیاکانی ئۆپۆزسیۆن هەڵگری بوون.

وەك (غەسان سەلامە) دەڵێت: لەهەر هەنگاو و وەرچەرخانێکی دیموکراتی، دەوڵەت بریتییە لەلایەنی سەرەکی و ئەرکی گەورە دەکەوێتە سەرشانی، زیاتر لەهەر لایەنێکی دیکە، ڕۆڵی دەوڵەت پێش ئەو فاکتەرانە دەکەوێت.

لەهەر کۆمەڵگەیەك دەکرێ بڵێین ڕۆژنامەوانی ڕەنگدانەوەی سروشتی دەوڵەت و سیستەمە سیاسییەکەیەتی. هەر کاتێك ڕۆژنامەوانی ئازاد و سەربەخۆ نەبوو، ڕاستەوخۆ گوزارشت دەکات لە ئیرادەو بڕیاری سیاسی ئەو سیستەمە سیاسییە، چونکە ئەستەمە سیستەمی سیاسی لە کۆمەڵگەیەکدا ئاراستەیەکی دیموکراتییانەی هەبێت و

لەوپەڕی شەفافییەتی سیاسییەوە مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵگە بکات، کەچی لەولاوە خاوەنی ڕۆژنامەوانیەکی نائازاد و ترسنۆك بێت.

کوردستان لە قۆناغە بەراییەکانی وەرچەرخانی دیموکراتیدایە بەدەست گرفتێکی بوونیادیەوە گیرۆدەیە، ئەویش ئەوەیە ئەگەر دیموکراتییەت لە خۆرئاوا وەك زەرورەتێکی ژیاری بە چەندین قۆناغی مێژوویی گەشەی کردوە، لە ئاکامی زنجیرەیەك شۆڕشی فیکری و ئابووری و پیشەسازیەوە تایبەتمەندی و کۆڵەکە سەرەکییەکانی ئەو دیموکراتییەتە خولقاوە و کولتوری دیموکراتییەت و ئازادییە گشتییەکان ببە هەموو کایەکانی کۆمەڵگە شۆڕبۆتەوە، بۆتە هۆی زەمینە سازکردن بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەتی مۆدێرن، لای ئێمە دیموکراتییەتێکی شێوێنراو بە ڕێکەوت خۆی کرد بە نێومالّی سیاسیماندا، ئەو دیموکراتییەتە نەخۆش و ڕواڵەتیەی کوردستان هێندەی مومارەسەکردنیکی ڕووکەشانەی پێداویستییەکانی سەردەم و خۆ جوانکردن و گونجاندن بوو لەگەڵ دونیای لیبراڵ لە خۆرئاوا، هێندە گوزارشت نەبوو لە بیرکردنەوەو ئیرادەی سیاسی دەسەڵات.

کەوتنمان بەسەر دیموکراتییەت و پێداویستییەکانی کرانەوە، کۆمەڵگەی بە بەرزترین پێکهاتەکانییەوە خستە بەردەم شۆك وشلەژانێك، جگە لەوەی ئەم شۆك و شڵەژانە شەرێکی ناوخۆیی لێکەوتەوە، درز و کەلێنی خستە نێو یەکانگیری کۆمەڵگە، لەو نێوەندەشدا سیاسەتی دابەشکردنی دەستکەوتەکان هاتەئارا، دابەشکردنی کۆمەڵگە بوو لەسەر بنەمای ئینتیما بۆ دوو ئایدۆلۆژیا، دوو گروپی سیاسی، دوو ئامانج و بەرژەوەندی، لە سایەیدا چەمکەکانی نیشتمان، هاوڵاتیبوون، پرسەکانی کرانەوە، دیموکراتیزە کردنی کۆمەڵگە و سەرهەڵدانی ئازادییەکان نەك هەر پاشەکشەیان کرد، بەڵکو مومارەسەیەکی تاکڕەوانەی تاك حیزبی هاتە شوێنی. ئەو شۆك و شڵەژانە لە پرۆسەی سیاسی ڕاستەوخۆ لە ڕۆژنامەوانی کوردی ڕەنگی دایەوە کە بە شێوەیەکی گشتی دیاردەو کەرەستەیەکی حیزبی بوو، بە درێژایی ساڵانی ڕابردوو ڕۆژنامەوانی بە پلەی یەکەم کەناڵێك بوو بۆ گەیاندنی گوتارە سیاسییە سواوەکان و بڵاوکردنەوەی هەواڵە تەشریفاتیەکانی سەرکردە سیاسیەکان، لە چوارچێوەیەکی زۆر تەسك لەگەڵ ئازادیی نووسین و بڵاوکردنەوە مامەڵەیان دەکرد، کە ئەو حیزبە لە ڕوانگەی فەلسەفەی سیاسی خۆیەوە باوەڕی پێیەتی، شڵەژانی پرۆسەی سیاسی لەکوردستان پەیامێکی

سیاسی گەیاند بە میدیاکان کە رەخنەی سیاسی یاخود وروژاندنی پرسیارە جیدییەکان، ئاکامی خراپی لێدەکەوێتەوە بۆ چارەنووسی رۆژنامەوان و ڕۆژنامەکەو ئەو لایەنەش کە دەریدەکات.تارمایی رەش و سەدای ئەو پەیامەش هێشتا هەڕەشە لە ئازادی و گیانی رۆژنامەوانان دەکات، بە درێژایی سالانی رابردوو چەندین قەڵەم بەدەست بوونەتە خۆرەی ئەو پەیام و عەقلیەتە شوم و تاریکپەرستە.

بە درێژایی ئەو ماوەیەش میدیای کوردی بە چەند تایبەتمەندییەك دەناسرێتەوە لەوانە:

١ ـ نەبوونی پسپۆڕی: کارکردن لە ڕۆژنامەوانی کوردی جگە لەوەی زەرورەتێکی کاری حیزبی بوو، لە هەمان کاتیش بە پاڵنەری ئارەزووی تاکەکەسی بوو بۆ ئەزمونکردنی کاری ڕۆژنامەوانی، زۆرێك لە **نووسەر** و ئەدیب و تەنانەت سیاسەتمەدارە حیزبییەکان هاتنە نێو دونیای ڕۆژنامەوانیەوە، ئەم کارەش بە خراپی و لاوازیی لەسەر پیشەیی، هونەری و دروستکردنی پەیامی ڕۆژنامەوانیەوە ڕەنگیدایەوە، ئەم حاڵەتە درێژەی کێشا و تاوەکو چەند ئەکادیمیایەکی ڕۆژنامەوانی لە هەریەك لە سلێمانی و هەولێر لەسەر ئاستی زانکۆ و پەیمانگا دامەزرا، جێگای خۆشحاڵی ڕۆژنامەوانان بوو، بەڵام بە داخەوە دوای ئەوەی ئەو ئەکادیمیایە پۆلێك قوتابی ئەکادیمیان لە بواری ڕۆژنامەوانی دەرچواند. بەو شێوەی چاوەڕوان دەکرا لەلایەن میدیاکانی کوردستان پێشوازی لێنەکرا، تا ببنە خوێنێکی تازە لە جەستەی ڕۆژنامەوانی کوردی.

٢ ـ سەرباری ئەوەی لەسەر ئاستی هونەری و زانستی و یاسایی و ئیتیکیەوە کۆمەڵێك ڕێساو چوارچێوەی گشتی تایبەت بە کاری ڕۆژنامەوانی هەیە، وەڵی بە شێوەیەکی بەرفرەوان ئەم ڕێسایانە فەرامۆشکراون، وەکو پێویست پەیڕەوی لێناکرێت، ئەمە وایکرد وە ناوەڕۆکی میدیاکان لە ڕووی تەکنیکی و یاسایی و ئیتیکیەوە بکەوێتە هەڵەی بەرچاو، ئەو هەڵانەش ڕۆژانە دووبارەدەبنەوە، لە دارشتنی هەواڵ و بابەتە ڕۆژنامەوانیەکانی دیکە.

٣ ـ بوێرییەکی ئاوێتە بە هاوسەنگی لە دنیای ڕۆژنامەوانی ئێمە تا ئەمڕۆکەش وونە، کەوتۆتە نێوان بەرداشی ڕێگرتنی دەسەڵاتی سیاسی لە رەخنە و شەفافییەتی سیاسی و ڕەنگدانەوەی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەکان، لەولاشەوە وەکو بە شێوەیەکی

پیشەییانە مامەڵە لەگەڵ رەخنە ناکرێ، زۆرجار دەگۆڕێ بۆ جنێودان و ناوزڕاندن لەژێرباری هەڵچوون و نەبوونی متمانە بە دەسەڵاتی سیاسی و دەسەڵاتی دادوەری.

٤ ـ بابەتیبوون و بێلایەنی کە بنەمای سەرەکین لە پیشەی ڕۆژنامەوانی خاوەن میسداقیەت، دیسانەوە بەهۆی فاکتەری حیزبیبوونی پانتاییەکی بەرفرەوانی ڕۆژنامەوانی کوردی، لە گۆشەنیگایەکی یەکلایەنە هەوڵیدەدا خوێندنەوە بۆ شتەکان بکات و حوکمی لەسەر بدات، یانیش ڕۆژنامەی ئەهلی و سەربەخۆکان سەرەرای ئەوەی زۆرێك لەو بابەتانەی لە دووتوێی هەواڵ و ریپۆرتاژ و بابەتە جۆربەجۆرەکان باسی لێوەدەکەن ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە ژیانی و مەینەتی و خواستەکانی هاولاتیان هەیە، بەلام شێوەی باس کردن و بلاوکردنەوەی بەشێك لەو ناوەڕۆکە هێرشکردنە سەر کەس و زیادەرۆیکردنی تێدایە لەزانیاری و وەسفکردندا، یان بەدەست نەبوونی بەڵگە و دیکۆمینتی پێویست لەسەر بابەتەکە گیرۆدەیە، ئەمە وایکردوە زۆرجار لە دادگاکان سەرباری ئەوەی ئەو پرسانەی دەخرێنەڕوو ڕەوایەتی هەیە، بەلام ڕووبەڕووی لێپێچینەوەی یاسایی و سزادان و غەرامەکردن دەبنەوە.

ئەم تایبەتمەندییانە یاخود بلێین ئەم فاکتەرانە و چەند فاکتەرێکی تریش وایکردوە ئەو پەیوەندییەی لە نێوان میدیا کوردی دەسەلاتی سیاسی دروستدەبێت لەژێر ناو و شوناسێکی دیاریکراو گەلالە نەبێت، تائێستا خاوەنی ڕۆژنامەوانیەکی تێکەڵێن لەو پۆلینکاریەی کە (ساکسمان) کردویەتی سەبارەت پەیوەندیی میدیا و حکومەت، باس لەوە بکات ئەو پەیوەندییە لە دوو شێوە دا بە دەردەکەوێ، ئەوانیش شێوەی دوژمنکارانە یان شێوەی هاریکاریانە، ساکسمان دەڵێت: شێوەی دوژمنکارانە لە پەیوەندی نێوان حکومەت و میدیا تەنها لەو ولاتانە دەبینرێ لە دەسەلاتدا فەلسەفەی لیبرالی پەیڕەو دەکەن، لەسەر بنەمای ئازادیی ڕادەربرین و مافی خوێنەر لە زانینی کاروباری ولات و جیهان لە سەرجەم بوارەکانی ژیانیان نراوە.تاکو تاك بتوانێ بۆچوونێ تایبەت بە خۆی هەبێت لە هەمبەر کێشە و ڕووداوەکان، بە شێوەیەکی ئیجابی بتوانێ لە ژیانی سیاسی بەشداری بکات. ئەمانە بەدەست نایەت تەنها لە ڕێگەی ڕێگەپێدانی میدیا بە ئازادیی بگاتە سەرچاوەکانی زانیاریی و بلاویبکاتەوە، نەك هەر ئەوەش بەلکو فەلسەفەی لیبرالی لەسەر ئەوە بنیاتنراوە مافی هەڵسەنگاندن و ڕەخنەگرتنی هەبێت لە چالاکییەکانی حکومەت، ئەمە پەیوەندییەکی دوژمنکاریانەی لە نێوان ڕۆژنامەوانی و

حکومەت دروستکردوە و ناکۆکی لە نێوان هەردوولا دەخولقێنێ لە ڕووداو و کێشەگەلێکی زۆر.

لەولاشەوە میدیای هاریکار ئەوەیە لە خزمەت دەسەڵاتی سیاسیدا بێت و بەردەوام لە خەمی ئارایشتکردنی سیاسەت و بڕیارەکانیدا بێت، ئەمجۆرە میدیایە زیاتر لە وڵاتە تکرەو و دوا کەوتوەکان بەدی دەکرێ ـلەکوردستاندا هەر دوو جۆرەکەی میدیا دەبینرێ و ناکرێ ئەو پۆلێنەی ساکسمانی بەسەردا جێبەجێ بکەین.

# سەرچاوەکانی بەشی چوارەم

- احمد يوسف احمد وآخرون، كيف يصنع القرار في الانظمة العربية، ط١، مركز دراسات الوحدة العربية، بيروت، ٢٠١٠.
- باسل عبدالمحسن القاضي، تداول المعلومات عبر الانترنت واثره في تشكيل الوعي في عصر العولمة، الاكاديمية العربية المفتوحة في الدنمارك، بلا، ٢٠٠٧.
- *د. ثروت مكي*، *الإعلام* والسياسة... وسائل الإتصال *والمشاركة السياسية*، ط١، عالم الكتب- القاهرة، ٢٠٠٥.
- د.حسن عماد المكاوي، أخلاقيات العمل الإعلامي، ط٣، دار المصرية اللبنانية –القاهرة، ٢٠٠٣.
- د.عيسي عبد الباقي، الصحافة والإصلاح السياسي و دراسة في تحليل الخطاب، ط١، دار العلوم للنشر- القاهرة، ٢٠٠٩.
- د.فاروق أبو زيد، الإعلام و السلطة- إعلام السلطة وسلطة الإعلام، ط١، عالم الكتب- القاهرة، ٢٠٠٧.
- د.محمد حسن العامري، د.عبدالسلام محمد السعدي، الإعلام والديمقراقطية في الوطن العربي،، ط١، العربي للنشر و التوزيع – القاهرة، ٢٠١٠.
- محمد سعد ابو عامود، الإعلام والسياسة في عالم جديد، ط١، دار الفكر الجامعي- الاسكندرية، ٢٠٠٩.
- محمد سعد أبو عامود، الرأي العام والتحول الديمقراطي، ط١، دار الفكر الجامعي- مصر.
- عبدالخالق ابراهيم، ڕۆڵی ڕۆژنامەوانی لە دروست بوونی بڕیاری سیاسیدا، چاپی یەکەم، دەزگای توێژینەوە و بلاوکردنەوەی موکریانی، ٢٠٠٩، هەولێر.

# بەشی پێنجەم

## بەرەو ستراتیژیەتێکی نویٚ بۆ کاراکردنی میدیای کوردی

بۆ داڕشتن و گەڵاڵەکردنی ستراتیژیەتێکی نویٚ بۆ کاراکردنی ڕۆڵی میدیای کوردی لە پرۆسەی بوونیادنانی واقیعێکی گەشتر لە کۆمەڵگەی کوردیدا، پێویست بەوە دەکات تێڕامان و خوێندنەوەیەکی نوێمان هەبێت بۆ ئەو گۆڕانە مەزن و ریشەییانەی بەسەر کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا هاتووە. لەلایەکی دیکەوە، خوێندنەوەیەکی نویٚ بکەین بۆ ڕەوشی کۆمەڵگەی کوردی و ئەو گۆڕان و بپێشڤەچوونانەی لە کایە جیاوازەکاندا هاتۆتەئارا، لەهەردوو ئاستەکەدا میدیای کوردی کەموکوڕیی بەرچاوی پێوە دیارە، وەك پێویست نەیتوانیوە مامەڵەیەکی بابەتی و ڕۆژنامەوانیی بکات بۆ تاوتوێکردن و شیکردنەوەی قوڵ و هەمەلایەنەی ڕووداو و گۆڕانکارییەکان، بۆ ئەوەی میدیا وەك کایەیەکی مەعریفی و کۆمەڵایەتیی و سیاسی کارا لە ڕۆڵی سەرەکی خۆی دوانەکەوێت بریتییە لە دروستکردن و برەودان بە هۆشیاریی و ئاگایی تاك سەبارەت بەو پرس و ڕووداوە گرنگانەی لە دەوروبەریدا دەگوزەرێن و یارمەتیدانی بۆ مامەڵەکردنی دروست لە بەرامبەریاندا.

میدیای کوردی دەبیٚ فرەوانتر و قوڵتر بایەخ بە پرس و بابەتە جیهانییەکان بدات و پانتایی زیاتری بۆ تەرخان بکات، تەنها لە چەند هەواڵێکی خێرا و سەرپێیی قەتیسی نەکات، بە تایبەتی ئەو بابەتانەی کاریگەریی و ڕەنگدانەوەی دەبێت بەسەر جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵگەی کوردی بە پلەی یەکەم، عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە پلەی دووەم،

هەمیشە بە چاویلکەی سیاسی سەیری ئەو پرۆسە و کارەکتەرەکانی کراوە، ڕەنگە ئەو قسەیە ڕاست بێت، بەشێك لەوان لایەنە بابەتیەکەیان تیکەڵ بە هەڵچوون و ئایدیا و باکگروندە خودی و سیاسییەکانی خۆیان کردوە، هەر چۆنیك بێت ئەوەی لێرەدا پێویستە پێداگیری لەسەر **بکرێ**، ئەوەیە پرۆسەی ڕەخنەگرتن لەخود، نەك هەر ناکرێ پاشەکشەی لێ **بکرێت**، بەڵکو دەبێت **بکرێت** بە کلتور و فاکتەرێکی پێش خستنی کۆمەڵگە، ئامرازێکی کارای بژارکردن و رزگارکردنی لەو بارودۆخ و کەس و هەڵوێستە نەرینییانەی زیان بە بەرژەوەندی گشتی دەگەیەنن. ڕەخنەگرتن لەخود وەك بەرهەمێکی کلتوری خۆرئاوایی، ڕوونتر لە میدیاکانی خۆرئاوا ڕەنگیداوەتەوە و زەمینەی رەخساندوە بۆ میدیا وەك دەسەڵاتی چوارەم لە پرسە گرنگەکان ڕای گشتی هۆشیار بکاتەوە، دەسەڵاتە بەرپرسیارەکان بخاتە بەردەم بەرپرسیارییەتی یاسایی و دەستوری خۆیان، لەکاتی گونجاو ئەرکی ڕاستکردنەوەی رێڕەوی هەڵوێست و بڕیارە هەڵەکان ببینێ، مومارەسەکردنی میتۆدیانەی ڕەخنەگرتن لەخود لەئەزمونی دیموکراتییانەی خۆرئاوا و میدیای خۆرئاواییدا، هۆکارێکی ڕاستەوخۆی ئەو پیشڤەچوونەیە لەوێ هاتۆتەدی، کە دەڵێین پرۆسەی ڕەخنەگرتن لەخود، بەو مانایە پرۆسەیەکی میتۆدی و ریکخراوە، کایە و کارەکتەرە سەرەکییەکانی کۆمەڵگە بەگشتی بەشداری تێیدا دەکەن لە دەسەڵات، سەرکردەی پارتە سیاسییەکان، ناوەندە ئەکادیمیەکان و توێژینەوەی زانستی، سەنتەرەکانی پێوانەکردنی ڕای گشتی، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، کەس و لایەنە ڕۆشنبیریەکان و ڕۆژنامەوانان بەگشتی.

هەرچی لێکۆڵینەوەی ڕەوشی هەنووکەیی کۆمەڵگەی کوردییە، ئەوا پێویست بە چەندین لێکۆڵینەوەی زانستی و بابەتی دەکات، خۆشبەختانە بەردەوام ژمارەیەکی بەرچاوی لێکۆڵینەوە لە دووتوێی کتێب لەلایەن ناوەندەکانی چاپ و بڵاوکردنەوە دەردەچن، لەلایەن بەشێك میدیاکانەوە هەوڵدراوە بە چاوێکی شیکاری و رەخنەیی بارودۆخی کۆمەڵگە بخوێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەش هەستیاری قۆناغەکە، مۆلەقبوونی پێگەی سیاسی کورد، پێویستی بەردەوام و زیاتری دامەزراوە سیاسی و فەرمییەکان و تاکی کوردی بە زانیاری نوێ، دەخوازێت میدیا ئاستی بایەخپێدانەکانی فرەوانتر بکات.

لەسەر ئاستی ناوەخۆدا لەماوەی چەند ساڵی ڕابردوو گۆڕانکارییەکان لە بوارە جیاجیاکان زۆر خێرا و کاریگەرن، گومانی تێدانیە گۆڕانەکان هەمووی ئەرێنی نین و بە

سوودی کۆمەڵگە و بەرژەوەندی گشتی ناشکێتەوە، لێرەوە ڕۆڵی میدیای کوردی دێتە پێشەوە لە ڕەخنەگرتن لە خود.

بەداخەوە، ئەو بارودۆخە سیاسیەی لە کوردستاندا هاتۆتەئارا، ململانێیەکی سیاسی ناتەندروستی بەرهەمهێناوە، ڕێگر بووە لە بەردەم لەباربوونی پرۆسەی ڕەخنەگرتن لەخود و مامەڵەیەکی رەخنەگرانە لەگەڵ کۆی ئەو پرسانەی پەیوەستن بە کایە گرنگ و هەستیارەکانی کۆمەڵگە. ڕۆشنبیرانی کۆمەڵگە لەو نێوەندەدا میدیا وەك پردی پەیوەندی بەیەکگەیاندنی ئەو لایەنانە دەبینن، لەدروستکردنی فەزایەکی گونجاو بۆ گفتوگۆی نیاتنەر ڕۆڵی خۆی ببینێ. لەپاڵ ئەوەش تیشك بخاتە سەر ئەو بابەتانەی بە شێوەیەك لە شێوەکان فەرامۆشکراون، یان لایەنێك دەیەوێت پەردەپۆشی بکات تا نەکرێتە بابەتێکی گفتوگۆی گشتی بەئاشکرایی ڕەهەندەکانی شەن وکەو **بکرێ**٧.

بۆ نموونە، دوای جەنگی رزگارکردنی عێراق لەبەریتانیا مشتومڕێکی زۆر دروستبوو لەهەمبەر ئەو هەڵەیەی حکومەتی بەریتانیا تێیکەوت لە باوەڕ کردنی بەو راپۆرتە هەواڵگریانەی باسیان لە خاوەنداریەتی عێراق دەکرد بۆ چەکی کۆمەڵکوژ، بە هەمان شێوە لێدوانیکی (کۆندا لیزا رایسی) وەزیری دەرەوەی پێشووتری ئەمەریکا دەکرێ بە نموونەیەکی ڕەخنەگرتن لەخود بێنینەوە، کاتێك گوتی "لە ستراتیژدا هەڵەمان نەکرد (مەبەستی لەبڕیاری داگیرکردنی عێراقە)، بەڵام هەڵەمان لە تەکنیك کرد (مەبەستی لەدانانی سیناریۆیەکی ورد بوو بۆ دۆخی عێراق دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکە) ".

**یەکەم: گۆڕانکاری لە نەخشەی سیاسی جیهان**

ڕووخانی یەکیەتی سۆڤیەت و توانەوەی بلۆکی سۆسیالیستی، ئاوابوونی سیستەمی دوو جەمسەری و جێگرتنەوەی بە سیستەمێکی نوێی جیهانی یەك جەمسەری، سەرەتای گۆڕانێکی گەورە بوو لەنەخشەی سیاسی جیهان، هێرشە تیرۆریستیەکانی قاعیدە بۆ سەر ئەمەریکا، داگیرکردنی عێراق و ئەفغانستان، دوای ئەوەش هاتنی بەهاری گەلان بە دروست بوونی چەندین دەوڵەتی نوێ وەك تەیموری ڕۆژهەڵات، کۆسۆڤۆ، باشووری سوودان، شۆڕشی گەلانی عەرەبی و سەرکەوتنی لەهەندێك لەو وڵاتانە، لەمانەش گرنگتر ئەو گۆڕان و پێشڤەچوونە مەزنانەن هاتۆتەئارا لەسەر ئاستی ناوەخۆیی و نێودەوڵەتی سەبارەت بەپرسی کورد لە زۆربەی پارچەکانی کوردستان، دەرکەوتنی ئاسۆیەکی گەش بۆ دەستخستنی زۆرێك لەخەون و خواستە نەتەوەییەکانمان.

هەموو ئەمانە دەمانخاتە بەردەم زەرورەتی بوونی سیستەم و ستراتیژیەتێکی کوردی لە پێناو کاراکردنی ڕۆڵی میدیا لەسەرەڕێی بوونیادنانی واقیعێکی نوێ، لە ئاست خواست و چاوەڕوانییە نیشتمانی و نەتەوەییەکەدا بێت، لە داڕشتنی هەر ستراتیژیەتێکدا دەبێت بە پلەی یەکەم ئەو گۆڕانانە لە بوونیادی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی هاتۆتەدی لە بەرچاو بگیرێن، بە تایبەتی لە ڕەهەندە ژیاری و شارستانیەکەیەوە، گرنگترین رواڵەتی ئەو ڕەهەندەش خۆی لەو پرۆسەی وەرچەرخانە دەبینێتەوە لەمۆدیلی کۆمەڵگەی پیشەسازی بۆ مۆدیلی کۆمەڵگەی زانیای جیهانی، زەمینە خۆشکردن بۆ چوونە نێو مۆدیلی دوای ئەوە کە مۆدیلی کۆمەڵگەی مەعریفەیە، ئەگەرچی ئەم مۆدیلە بە سستی دەڕوات، بەڵام هەنگاوەکانی جێگیرن.

رواڵەتیکی دیکەی ئەم ڕەهەندە ژیاریە خۆی دەبینێتەوە لە دیاردەی جیهانگەرایی سیاسی و ئابووری، سەرباری ئەوەی ئەو دیاردەیە دەرگای واڵاکرد بۆ دروست بوونی ململانێیەکی  هەمەلایەنەی فەرهەنگی و کلتوری، بەشێك لەو ململانێیە لە ڕێگەی میدیا و تۆڕە نێودەوڵەتییەکانی میدیاوە بەرجەستە بووە.

زیادەڕۆیی نیە ئەگەر بڵێین مرۆڤایەتی لە ئێستادا لە چوارچێوەی پرۆسەیەکی ئاڵۆزی تێکچرژاودا لەسەروبەندی گەڵاڵە بوونی کۆمەڵگەیەکی نوێی جیهانیدایە، لەژێر کاریگەری ئەو شۆڕشە گەردوونیە بوو لە بواری پەیوەندیکردن و زانیاریدا هاتۆتەئارا، ئەو شۆڕشە گەردوونیە بەرهەمی کەڵەکەبوونی مێژوویی ئەو شۆڕشانەیە مرۆڤایەتی بەخۆی بینیوە، هەر لە شۆڕشی پیشەسازییەوە دەستپێدەکات، ئەو شۆڕشە بە شۆڕشی زانستی و تەکنەلۆژی ناونرا، زانست و داهێنانەکان بوونە هێزێکی سەرەکی و سەرچاوەیەکی بنەڕەتی بەرهەمهێنان، لەپاڵ سەرچاوەکانی وەك زەوی و سەرمایە و کارکردن، لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازی وردە وردە سیمای وڵاتە پیشەسازیە پێشکەوتووەکان گۆڕانی بەسەر داهات، نەك هەر لەژێرخانیدا، بەڵکو لە ستایلی ژیان، جۆری بیرکردنەوە، ماهیەتی بەها و نەریتەکان، فۆرمی مومارەسە و سیستەمی سیاسی...هتد. لەشەستەکانی سەدەی بیستدا بەشێك لە زانایانی کۆمەڵناسی خۆرئاوا زاراوەیەکی نوێیان بەکارهێنا بۆ وەسفکردنی ئەو کۆمەڵگە نوێیەی لە هەناوی شۆڕشی پیشەسازی دروستبوو، لە دیارترین ئەو زانایانە (دانیال بیل) بوو زاراوەی "کۆمەڵگەی دوای پیشەسازی" بەکارهێنا، لێ بە تێپەڕبوونی کات کەموکوڕی ئەو زاراوەیە

دەرکەوت، لەوەی ناتوانێ گوزارشت بکات لەو گۆڕانە چۆنایەتیانەی دروستبووە، لێرەوە زانایانی کۆمەڵناس زاراوەیەکی دیکەیان بەکارهێنا ئەویش "کۆمەڵگەی زانیاری" بوو، بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە لەو ڕوانگەیەوە بوو، کاتێك سەرنجیان لەوەدا گرنگترین سیما و تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگە نوێیەکە بریتییە لە بەرهەمهێنانی زانیاری و ئالوگۆڕکردن و بڵاوکردنەوەیەتی لە ڕێگەی پێشکەوتوو کە بریتی بوو لە کۆمپیوتەر، پێشڤەچوونی بەردەوامی نەوە یەك لەدوای یەکەکانی ئەو ئامێرە ئەلیکترۆنییە سەرسوڕهێنەرە بوونە هەوێنی شۆڕشێکی مەزنی فیکری لە بواری بەرهەمهێنان، دابەشکردن و بەکارهێنانی مەعریفە مرۆییەکان، لەپاڵ ئەمیشدا داهێنانە مەزنەکانی تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن بە تایبەتی لە بواری مانگە دەستکردەکان و بەکارهێنانە فرەوانەکانی لە پەخشی تەلەفزیۆنی، هێندەی دیکە کاریگەری و دەرهاویشتەکانی ئەو شۆڕشەی مەزنتر کرد، ئیدی شتێك نەما بەناوی سنور و جوگرافیا، وێنە و زانیارییەکان گەیشتنە دوورترین کون و قوژبنی ئەم هەسارەیە بە کۆمەڵگە و کلتور و بەها و نەریتە جیاوازەکانیانەوە.

بە لە بەرچاوگرتنی ئەو کاریگەریانەی پەیام و ناوەڕۆکی میدیاکان هەیەتی لەسەر بەها، دابونەریت، ئاڕاستە و کلتورە جیاوازەکان، درك بەوە دەکەین ئێمە لە سەروبەندی فۆرمەلە بوونی کۆمەڵگەیەکی جیهانی بێ پێشینەی نوێین، کۆمەڵگەیەك لە ئێستادا گوزارشتی "دێیە بچووکەکە"ی بۆ بەکاردێت، گوزارشتێك ئاست و قەبارەی ئەو کاریگەرییە دەردەخات لە شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆژیای پەیوەندیکردن دروستبووە.

لە سایەی ئەو پێشکەوتنە مەزنەی بواری مەعریفە و پەیوەندیکردنی تەنیوە، کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لە کۆمەڵگەی پیشەسازیەوە بۆ کۆمەڵگەی زانیاری دەبات، کۆمەڵگەی زانیاری بە هەنگاوی هێواش، بەڵام بەجیگیری دروستدەبێت، ئەمە دەمانخاتە بەردەم دیاردەیەك دەکرێ ناوی بنێین "هۆشیاری گەردوونی"، ئەم هۆشیاریە گەردوونییە هەموو ئاست و جۆرەکانی دیکەی هۆشیاری تێپەڕاندووە، لە نێویاندا هۆشیاری نیشتمانی بە هەموو دەرهاویشتە و ڕواڵەتە بەرجەستەکانیەوە لە هۆشیاری کۆمەڵایەتیی و چینایەتی و نەتەوەیی، لە دایکبوونی هۆشیاری گەردوونی و تێپەڕاندنی ئاستەکانی دیکەی هۆشیاری بۆ خۆی گوزارشتە لە سەرهەڵدانی بەها ئینسانییە گشتی و گەردوونییەکان، ئەوەی لە ئێستادا بۆتە سورگەی ململانیکان، چۆنیەتی داڕشتنی

بەها ئینسانی و گەردونیەکان و ئاڕاستەکردنیەتی، شارەزایانی ئەو بوارە وایدەبینن دەبێت لەئایندەیەکی نزیکدا کۆدەنگیەکی نێودەوڵەتی لەسەر ئەم بەهایانە دروست ببێت.

بەرمەبنای ئەم ڕاستییەی سەرەوە دەکرێ لە نهینی ئەو شەڕ و ململانێ دژوارە تێبگەین ئێستا لە ئارادایە لەبارەی "سیستەمی نوێی جیهانی"، دوای هەرەس هێنانی سیستەمی دوو جەمسەری، ویلایەتە یەکگرتووەکان دەیەوێ دەستی بە سەردا بگرێ، لە ڕێگەی ئەو هێزە ئابووری و سەربازی و تەکنەلۆژیە مەزنەی هەیەتی، ئەگەرچی بەهۆی ئەو قەیرانە ئابووری و داراییە کوشندەی لە چەند ساڵی ڕابردوو تووشی بووە، هێزی ئابووری ئەمەریکا لە پاشەکشێ دایە و ترسیی داڕووخانی لێدەکرێ، هەروەك کتێبەکەی "پۆل کیندی" بەناوی "هەڵکشان و داکشانی زلهێزەکان" تێبینی ئەوەی کردوە، ئەم باسەی لەم کتێبەدا خراوەتەڕوو لە ئێستادا جێگەی مشتومڕێکی زۆری ناوەخۆیی ئەو وڵاتەیە.

خەریکە "کۆمەڵگەیەکی زانیاری گەردوونی" دروست بێت، ئەگەرچی هەموولایەك لە بەرهەمهێنان، دەستخستن و بڵاوکردنەوە و سوودوەرگرتن لێی لەیەك ئاستدا نین، دەرفەتەکانی بەرهەمهێنان و سوود لێوەرگرتنی بە یەکسانی بۆ هەمووان فەراهەم نەکراوە.

کۆمەڵگەی زانیاری گەردوونی

دواین ئەو قۆناغانەیە مێژووی مرۆڤایەتی پێیدا تێپەڕیوە. هەریەك لەو قۆناغانە بە داهێنان و پێشکەوتنیکی تەکنەلۆژی لەوانی دی جیا دەکرێتەوە زادەی پێویستییەکانی سەردەمی خۆی بووە، بۆ نموونە لەڕابردوودا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی تەکنەلۆژیای ڕاو کردنی داهێناوە، دواتر تەکنەلۆژیای کشتوکاڵ، پاشان تەکنەلۆژیای پیشەسازی، تا گەیشتینە تەکنەلۆژیای زانیاری.

دەکرێ بگوترێ تایبەتمەندییەکانی کۆمەڵگەی زانیاری سەرچاوەی گرتووە لەو تایبەتمەندییانەی تەکنەلۆژیای زانیاری هەیەتی، دەکرێ لە سی خاڵی سەرەکیدا کۆی بکەینەوە:

**یەکەم:** زانیارییەکان قابیلی بەکاربردن یان گۆڕانکاری یان هەڵوەشاندنەوە نین، چونکە خەسڵەتی کەڵەکەبوونی هەیە و هاووڵاتیان مافی بەکارهێنانی گشتی و هاوبەشی زانیارییەکانیان هەیە.

**دووەم:** بەهای زانیاری لەوەدایە گومان و نارۆشنی ناهێڵێت، یارمەتی مرۆڤایەتی دەدات بە شێوەیەکی کارا بڕیارەکانی بدات.

**سێیەم:** نهێنی ئەو کاریگەرییە کۆمەڵایەتییە قوڵەی تەکنەلۆژیای زانیاری دروستی کردوە، لەوەدایە جەخت دەکاتەوە لە کاری هزری و ئەقڵی.تەکنەلۆژیای زانیاری کار لەسەر گەشەپێدانی کارە ئەقلییەکان لە ڕێگەی داهێنانی مەعریفە و چارەسەرکردنی کێشەکان، فرەوانکردنی ئەو دەرفەتانەی لە بەردەم مرۆڤدان، هەروەها لە ڕێگەی گەشەپێدانی پرس و کایە کۆمەڵایەتییەکان.

## سیماکانی کۆمەڵگەی زانیاری

بەشێك لە شارەزا و لێکۆڵەران چوارچێوەی کۆمەڵگەی زانیاری لەم چەند خاڵەدا دەخەنە ڕوو:

١- سوودی زانیاری لە ڕێگەی بنیاتنانی ژێرخانی زانیاری بە شێوەیەکی سەرەکی خۆی لەدابینکردنی کۆمپیوتەر دەبێنیتەوە بۆ بەکارهێنانی گشتی.بەجۆریك چەندین تۆڕی زانیاری فەراهەمکراوە، چەندین بانکی زانیاری لە بەردەستدان، ئەمانە دەبن بە سومبوڵی ئەو کۆمەڵگەی زانیارییە.

٢- پیشەسازی زانیاری بۆتە پێشەنگی پیشەسازیەکان، دەستیگرتووە بەسەر بوونیادی پیشەسازی کۆمەڵگەکان.

٣- تەکنەلۆژیای زانیاری سیستەمی سیاسی ناچار دەکات زیاتر بەڕووی دیموکراتییەت و بەشداری سیاسیدا **بکرێت**ەوە.

٤- بوونیادی کۆمەڵایەتیی پێکدێت لە کۆمەڵگە لۆکاڵیە فرە سەنتەرەکان بە شێوەیەکی خۆویستانە یەکتر تەواو دەکەن.

٥- بەرزترین ئاستی کۆمەڵگەکانی زانیاری قۆناغی داهێنانی مەعریفیە، لە میانەی بەشداریەکی کارای جەماوەر، ئامانجی کۆتایی بریتییە لە دروست بوونی تەواوەتی کۆمەڵگەی زانیاری گەردوونی.

ڕەنگە ئەو وێنەیەی ئێستا دەیکێشین لەبارەی کۆمەڵگەی گەردوونی زیاتر لەخەون بچێت، بەڵام وردبوونەوە و تێرامان لە واقیع دەمانگەیەنێتە ئەو دەرەنجامەی لەو ڕووەوە مرۆڤایەتی قۆناغی خەونی تێپەڕاندووە، کۆمەڵگەی گەردوونی زانیاری لە ئێستادا بووە بە چەمکێکی واقیعیانەی نیمچە بەرجەستە، دەبێتە دوا قۆناغیش لە قۆناغەکانی پێشکەوتنی کۆمەڵگەی زانیاری، لێرەدا سێ بەڵگە دەخەینە ڕوو ڕاستی ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن:

یەکەم: گەردوونیی بوون (GLOBALISM) دەبێتە ڕۆح و کرۆکی سەردەم لە کۆمەڵگەی زانیاری ئایندە، هۆکارەکەش پەیوەستە بە کۆی ئەو قەیرانە گەردوونیەی جیهانی سەرقاڵکردوە، لەوانە دابەزین و پاشەکشەی داهات و بەروبومە سروشتیەکان، پیسبوونی ژینگەی سروشتی و تێکچوونی کەشوهەوای زەوی، زیادبوونی خێرای ژمارەی دانیشتوانی زەوی، ئەو جیاوازیە ئابووری و کۆمەڵایەتییە زۆرەی لە نێوان باکوور و باشووری زەویدا هەیە.

دووەم: گەشەکردنی تۆڕەکانی زانیاری گەردوونی لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەو کۆمپیوتەرانەی لەسەر ئاستی جیهانی بەیەکەوە بەستراون، مانگە دەستکردەکان یارمەتیدەرێکی کاریگەرن لە باشتر کردنی پرۆسەی ئاڵوگۆرکردنی زانیاری و قوڵکردنەوەی تێگەیشتن لەو گۆڕانکارییانەی ڕوو دەدەن، بە ڕادەیەك بەرژەوەندیە نیشتیمانیەکانی وڵاتێك و ئەو ناکۆکی و جیاوازیانەی لە نێوان وڵاتاندا هەیە تێپەڕێنێت.

سێیەم: ئاستی بەرهەمهێنانی کاڵاکانی زانیاری لەپێش بەرهەمهێنانی کاڵا ماددیەکانەوەیە، ئەگەر تێکرای بەها ئابوورییەکەی لە بەرچاو بگرین، بەمە گۆڕانێکی گەورە بەسەر سیستەمی ئابووریدا دێ نێت، لەسیستەمێکی کێبڕکێکردن لەسەر بنەمای قازانج دروستبووە دەگۆرێ بۆ سیستەمی هاوبەش، سیمایەکی دەستەجەمعی هەیە و هەموولا هاوبەشی تێیدا دەکەن.

لەگەڵ هەموو ئەمانە گەلالە بوونی کۆمەڵگەی زانیاری گەردوونی پرۆسەیەکی هەروا ئاسان نیە، کۆمەڵێك بەربەست و مەیدانخوازی مەزن لە بەردەمدایە، لە سەرووی هەموویان ئەو جەنگەی لە ئارادایە سەبارەت بە دیموکراتییەت ی زانیاری، ئەمە مەرجی

سەرەکی و بنەڕەتیە لە پرۆسەیەکی لەم چەشنەدا لە پێناو خۆ بەدوورگرتن لەهەر جۆرێك لە خۆسەپاندن و تاکڕەوی.

**دیموکراتییەت ی زانیاری چوار بنەمای سەرەکی هەیە ئەوانیش:**

یەکەم: پاراستنی مافی تایبەتمەندی تاکەکان، بە مانای مافی ئینسانیانەی تاك لە پاراستنی ژیانی تایبەتی خۆی و دوور لە چاوی کەسانی دیکە.

دووەم: مافی بە دەستهێنانی مەعریفە، بە واتای تاك مافی هەبێت ئاگای لە هەموو زانیارییە حکومیەکان بێت، کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر چارەنوس و ئایندەی ژیانی.

سێیەم: مافی بەکارهێنانی زانیاری، بەو مانایەی هەر تاکێك مافی بەکارهێنانی تۆڕەکانی زانیاری هەبێت لەبەردەستدان، مافی سوودوەرگرتنی هەبێت لە بانکەکانی زانیاری بە نرخێکی هەرزان لە هەموو کات و شوێنێکدا.

چوارەم: بەشداریکردنی ڕاستەوخۆی تاك لە بەڕێوەبردنی ژێرخانی میدیای گەردوونی، لە نێویاندا بەشداریکردن لە پرۆسەی دروستبوونی بڕیار لەسەر هەموو ئاستەکانی لۆکاڵی و حکومی و گەردوونیدا، ئەمە لوتکەی دیموکراتییەتی میدیایی و زانیارییەیە لە کۆمەڵگەی زانیاریدا پێی دەگەین.

جگە لەمە بەربەستێکی دیکە، ڕووبەڕووی کۆمەڵگەی زانیاری گەردوونی دەبێتەوە، گەشەپێدانی ژیری گەردوونیە، ژیری گەردوونی مانای توانای خۆگونجاندنی تاکەکانە لە ڕووبەڕووبوونەوە و مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو بارودۆخە گەردوونیەی زۆر بە خێرا گۆڕانی بەسەردا دێت. ژیری دەکرێ بەوە پێناسە **بکرێ** توانای هەڵبژاردنی بڕیاری عەقڵانیە لە رەفتاری مرۆڤەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.

ژیری لە ئاستی **تاکەکەسی**یەوە دەستپێدەکات، دواتر گەشە دەکات شۆڕدەبێتەوە بۆ ئاستی دەستەجەمعی، لەسەر ئاستی دەستەجەمعی ژیری تاکەکان بە هەماهەنگی و تەواوکاری بەردەوام ڕۆڵ دەبینن لە بەدیهێنانی ئامانجە گشتییەکان و بەرپاکردنی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتیی، ئەمە پێیدەگوترێ ژیری کۆمەڵایەتیی، پەرەسەندنی ئەو ژیریە کۆمەڵایەتییە بۆ خۆی زەمینە لەبار دەکات بۆ دروستبوونی ژیری گەردوونی، لە ڕێگەی گەلاڵەبوون و ئاڵوگۆڕکردنی تێگەیشتنێکی گەردوونی بۆ چارەسەرکردنی کێشە

گەردوونیەکان، هەروەك لەم هەولانەی دواییدا بە دەردەکەوێ بۆ دروستکردنی تێروانینێکی گەردوونی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی قەیرانی پیسبوونی ژینگەی زەوی و گۆڕانی کەشوهەوا.

ئەو نیگەرانیانەی لەسەر ئاستی کۆمەڵگەکانی دونیا دروستبووە، سەبارەت بە تێکچوونی ژینگەی زەوی نموونەیەکی زەقی ئەو هۆشیاریە گەردوونیەیە، دوای ئاکامە نەرێنییەکانی کۆمەڵگەی پیشەسازی، ئەو پیسبوونەی لە کەشوهەوای زەویدا بە دەرکەوتوە، زۆرێك لە کۆمەڵگە و حکومەتەکان داوا دەکەن لەسەر ئاستی لۆکاڵی و نێودەوڵەتییدا یاسای پێویست دەر**بکرێ** بۆ ڕێگرتن لەو دەرهاویشتە خراپانەی بەرهەمهێنان و پیشەسازی، یاساکان کەرەستە و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بگۆڕن تاوەکو لە خزمەتی مرۆڤ و ژینگەکەیدا بێت.

کە باس لە دروستبوونی هۆشیاریەکی گەردوونی دەکەین، سەرباری ئەوەی ڕەهەندە تیۆرییەکەی بە سەردا زاڵە، بەڵام لە هەمان کاتدا ئاماژە بەراییەکانی لەسەر ئەرزی واقیع دەرکەوتوە، ڕەنگە پرسی ژینگە و گۆڕانی کەشوهەوا تەنها پرسێك نەبێت هۆشیاریەکی گەردوونی لە ئاستیدا دروستبووە، بەڵکو هەمان شت لەپرسی چەکی کۆمەڵکوژ، ئەتۆمی و ناووکی دەبینرێ.

## بەرەو ستراتیژیەتێکی میدیایی نیشتیمانی و نەتەوەیی

لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی باسکرا دەکرێ پێشنیازی چەند ستراتیژیەتێك بکەین، سەرباری جیاوازی چاوگە و ئاڕاستەی ناوەندە میدیایی و ڕۆژنامەوانییەکان لەهەرێمی کوردستان ئەوانیش:

یەکەم : دیاریکردنی نەخشەی سیاسی و ئایدۆلۆژی لەهەرێم، گۆڕانە جیۆ سیاسیانەی ناوچەکە کە پەیوەندیدارن بە کورد.

بوونی ستراتیژیەتی کارای میدیا، پێویستی بە نەخشەیەکی مەعریفی وردە لە دەستنیشانکردنی قەبارە، ئامادەیی ڕەوت و ئاڕاستە سیاسی و ئایدۆلۆژیەکان، ئەوانەی کاریگەرن لەسەر پرۆسەی سیاسی لەهەرێمی کوردستان لەلایەك، لەو نەخشەیە پێگە و قورسایی سیاسی هەریەکە بە شێوەیەکی ڕێژەیی دیاری **بکرێت**، دیارە بایەخی بوونی

نەخشەیەکی ئاوا یارمەتیدەر دەبێت بۆ ئاشنابوون بەو لایەنانەی کۆمەڵگەی کوردی پێویستیان بە گۆڕانە یان لەقۆناغی گۆڕاندان.

بایەخێکی دیکەی ئەم نەخشە سیاسیە لەوەدایە لەهەر ڕووماڵ و کارێکی ڕۆژنامەوانیدا یارمەتیدەر دەبێت بۆ خۆ دوورگرتن لە گشتاندن، زانیاری، ژمارە، ئامار، شیکردنەوە و پێشبینیکردنی ناواقیعیانە، زۆر جار بە پاڵنەری سیاسی و پروپاگاندەیی بانگەشەی بۆ دەکرێ.

بۆ نموونە لەو نەخشەیەدا پێگەو قەبارەی ڕەوتە لیبراڵ، نەتەوەیی،ئیسلامی و چەپەکان بخرێتە ژێر لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی بەردەوام، بۆ ئەوەی لەو گۆڕانکارییانە ئاگادار بین ڕەنگە ڕوویاندا بێت لەسەر میزاجی شەقامی سیاسی کوردی یان لە ئاییندە ڕووبدەن،بۆ نموونە میدیای ئێمە کەم قسە لەسەر ئەوە دەکات ڕەوتێکی سیاسی بۆ لە پاشەکشەدان یان ئەو دەنگە بەرزەی ڕەوتەکەی تر هەیانە تاچەند گوزارشت دەکات لە گەشەو فرەوانبوون، ناوچەی چالاکی و قورسایی جەماوەریان لە کوێدایە؟

هەر هەوڵ و هەنگاوێکی میدیایی لەمجۆرە کاتێك سەرکەوتوو دەبێت بە شێوەیەکی هاوسەنگ و بابەتیانە ڕووماڵی ڕاستیەکان بکەین و ڕاستگۆیانە زانیارییەکان بگوازینەوە، بەمشێوەیە دەتوانین وێنەیەکی بابەتیانە سەبارەت بە کارلێکە سیاسییەکان لەهەرێم پیشان بدەین، جگە لەوە ئەرکی ڕۆژنامەوانییە بەچاوێکی بابەتی و ڕەخنەییانە قسە لەسەر بنەمای فیکری و ئایدۆلۆژی ڕەوتە سیاسیە کاریگەرەکانی کوردستان بکات، بە تایبەت ئەو بنەما و پرەنسیبە ئایدۆلۆژی و فیکریانەی گوزارشت لەم سەردەمە ناکەن، دواکەوتوویی و چەق بەستویی سیاسی بەرهەم دەهێنن، ڕێگرن لە بەردەم پێشڤەچوون و کرانەوەی زیاتری کۆمەڵگەی کوردی.

دووەم: خوێندنەوەیەکی تەندروست و زانستیانە بۆ (ڕابردوو، ئێستاو ئایندە)، بۆ ئەوەی مامەڵەیەکی تەندروست و خوێندنەوەیەکی زانستیانە بکەن بۆ هەرسێ زەمەنەکە، پێویستە خۆ بەدوور بگرێن لەچوونە ژێرباری ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو، لە ڕێگەیەوە خوێندنەوە بۆ ڕابردوو بکەین یان بە باکگراوندێکی سیاسی ڕووتەوە حوکم لەسەر قۆناغ و وێستگەکانی مێژوومان بدەین.

میدیا دەتوانێ ڕۆڵێکی گرنگ ببینێت لە زەمینە سازیی و بانگەشەکردن بۆ لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەی ڕابردوو بکەین، نابێ بە هیچ شێوەیەك سنور لە بەردەم هەوڵی خوێندنەوەی ڕابردوو دابنرێت لەژێر هەر پاسا و بیانوپەك بێت، هەڵسەنگاندن بۆ شکست و سەرکەوتنەکان **بکرێ**، بێ ئەوەی ئەو هەڵسەنگاندنە لە پێگە و ڕۆڵی کەس و لایەنێکی دیاریکراو کەم بکاتەوە. پێویستە میدیا پێشەنگی بکات بۆ گەلاڵەکردنی میتۆدێکی زانستیی و رەخنەیی بۆ ئێستا، خوێندنەوەیەك سیمایەکی تەواوکاری هەبێت، تێروانینێکی گشتگیریانە بکات بۆ ئێستای ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتیی و کلتوری کۆمەڵگە، میتۆدێك لایەنە نەرێنییەکان دەستنیشان بکات و بە دیدێکی رەخنەگرانەوە شی بکاتەوە.

سێیەم: دەبێت لە نێو ئاپۆرای گۆڕانە خێراکانی ناوچەکە و وڵاتانی دەوروبەر، بەردەوام لە هەوڵی پێشبینیی کردنی سیناریۆکانی ئایندە بین، ئەوەی پەیوەندیی بە کوردستان هەیە لەهەر چوار پارچە دابەش کراوەکەیدا، لە کوێی گۆڕانکاریەکان داین؟ ئەو گۆڕانانە بەرەو کوێمان دەبەن؟ چیمان لێ دەخوازن؟ خوێندنەوەی قوڵمان هەبێت بۆ ڕەهەندی ئابووری لە جیهان و کوردستان، بەو سامانە سروشتیە دەوڵەمەندەی هەیەتی چۆن دەتوانێت لەو ڕووەوە ڕۆڵ ببینێت، چۆن بتوانین سیاسەتێکی ئابووری ئەوتۆمان هەبێت پێگەی خواست و ئاڕاستە سیاسییەکانمان بە هێزتر بکات.

چوارەم: فرەوانکردنی ئاستی ڕوومالکردنی میدیای کوردی بۆ پرس و بابەتەکانی دەرەوەی هەرێم و پارچەکانی دیکەی کوردستان، ڕوومالکردنی پرس و گۆڕانکاریەکانی ناوخۆیی وڵاتانی دراوسێی هەرێم و جۆری سیستەمی سیاسی، کەس و رەوتە حکومڕانەکان، تیشك خستنە سەر گرێبەست و رێکەوتنە سەربازیی و ئابووریی و سیاسییەکانیان، بۆ هوشیاری تاکی کورد و بڕیاربەدەستان لەهەرێمدا پڕ بایەخن.

پێنجەم: دابڕانی پارچەکانی کوردستان لە یەکتر و داگیرکردنی لەلایەن وڵاتانی دراسێ، چەندین بەربەستی جوگرافی، سیاسی، دەروونی، زمانەوانیی و دیالێکتیکی دروستکردوە. ئەرکی تێکشکاندنی ئەو بەربەستانە لە بەشێکی سەرەکیدا دەکەوێتە ئەستۆی میدیا، لە ڕێگەی ناساندن و دروستکردن و بەهێزکردنی پەیوەندییە ویژدانی و کلتوری و کۆمەڵایەتییەکان لە نێوان شار و پارچەکانی کوردستاندا.

شەشەم: لە کوردستان پرسە سیاسییەکان زاڵە بە سەر پەیام و ریزبەندی ئەولەویەتەکانی میدیا، لێ بابەتگەلێکی هەستیار هەن بەهیچ پاساوێك ناکرێ فەرامۆش **بکرێن**، لەوانە هەڵکشانی خێرای کێشە کۆمەڵایەتییەکان، زیادبوونی ڕێژەی خۆکوشتن و توندووتیژی خێزانی، کێشەکانی کەرتی تەندروستی و پەروەردە و خوێندنی باڵا، چاوەدێریکردنی کەرتی تایبەت و هەڵسەنگاندن بۆ کار و ڕۆڵیان لە ژیان وئابووری کوردستان دا.

# سەرچاوەکانی بەشی پێنجەم

- مجتمع المعرفة : التحديات الاجتماعية والثقافية واللغوية في العالم العربي...حاضرا ومستقبلا
،د.عبدلرحمن صوفي عثمان،المجلد الثاني،منشورات جامعة سلطان قابوس،مسقط – سلطنة عمان، ٢٠٠٧.
- من مجتمع المعلومات الى مجتمع المعرفة، التقرير العالمي لليونسكو، من مطبوعات اليونسكو،فرنسا، ٢٠٠٥.
- مجتمع المعرفة وتأثيره في العمل المعرفي، مجلة تنمية الرافدين العدد ٩٥ مجلد ٣١ سنة ٢٠٠٩، كلية الادارة والاقتصاد، جامعة الموصل.
- الصحافة وصناعة القرار السياسي، عبدالخالق ابراهيم، الطبعة الاولى، من مطبوعات اكاديمية كوردستان، اربيل، ٢٠١٣.